راجێر وێبستێر

# تۆژینەوەی تیۆریی ئەدەبی

## (پێناسەیەکی پوخت)

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە

**عەبدولخالق یەعقووبی**


**This is a Kurdish translation of:**

**Studing Literary Theory; An Introdution**

**Roger Webster, first published in Great Britain, Reprinted, 1993**

**Translated by**

**Abdolkhalegh Yaghoobi**

**ناوی کتێب: تۆژینەوەی تیۆریی ئەدەبی (پێناسەیەکی پوخت)**

نووسەر: راجێر وێبستێر

- وەرگێڕانی: عەبدولخالق یەعقووبی
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جمال رواندزی
- بەرگ: ئاسۆ مامزاد
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- ژمارەی سپاردن: ٨٨٢
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپی یەکەم ٢٠٠٦
- نرخ: ٢٠٠٠ دینار
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب (١٩٦)

**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

**www.mukiryani.com**

**asokareem@ maktoob.com**

**Tel: 2260311**


PDF 4 KURD

# ناوەرۆك



PDF 4 KURD

لەم ساڵانەی دواییدا، پێگەو جێگەی تیۆریی ئەدەبی لە کۆرسێکدا کە هێشتاش زۆر جار «ئینگلیزی» پێدەگوترێ، زۆرتر لە جاران گرینگی وەدەسهێناوە. پێشتر، لە ڕاستیدا سەرەتای حەفتاکان (١٩٧٠) کە خوێندکاری کۆرسی «زمان و ئەدەبیاتی ئینگلیزی» بووم، ڕەخنەی ئەدەبی لە هیچ زانکۆیەکدا وەکوو سەرەباس لە بەرنامەی فێرکاریدا نەدەگونجا و شوێنێکی ئەوتۆی بۆ دیاری نەدەکرا. مێژووی ڕەخنەی ئەدەبی، کە هەر وەك لەم کتێبەدا دواتر هەستی پێدەکەین کە بابەتێکی تەواو جیاوازە، وانەیەکی خۆویست و ئیختیاری بوو، و هەروەتر مێژووی زمانی ئینگلیزی، لە چاخی ئەنگلۆساکسۆن و ئینگلیزی نێوەڕاستەوە تا سەدەی بیستەم، زۆر سەرنجیان پێدەدرا، بەڵام ئەو باس و بابەتانەی کە بنەمای خوێندنەوە و تۆژینەوەی خوێندکارانی لە مەڕ ئەدەبیات پێکدەهێنا، یا شوێنیان لە سەر دادەنا، خاوەنی گرینگایەتییەکی ئەوتۆ نەبوون. ئەوەی ڕاستی بێت، ئەم پرسە کە ناوەڕۆکی «ئینگلیزی» یان «ئەدەبیات» چییە و بۆچی خاوەنی ئەو ناوەڕۆکەیە، هێند لەبەر چاو نەدەگیرا. بە زمانێکی ساکارتر، خوێندکاران «بەرهەمی» کۆمەڵێك «نووسەری» «سەردەمانێکی» جۆراو جۆریان دەخوێندەوە کە پتر بە «کەسایەتییەکانەوە» سەرقاڵ دەبوون و چەمکگەلێکی لە چەشنی «بەرهەم» و «نووسەر» و «قۆناغ» و «کەسایەتی» کۆمەڵێك بابەت بوون کە ڕای هەمووان لە سەریان کۆك بوو، گەرچی پێش کۆتایی پێهێنانی باسوخواسان سەبارەت بە مانای تایبەت و قەتعیی هەر بەرهەمێك، مشتومڕی سەرنجڕاکێشیش لە مەڕ کێشەی ڕاڤەش دەهاتە ئاراوە.



لەم دواییانەدا مامۆستایان و خوێندکارانی ئەدەبیات، بە هەندێ هۆی جۆراوجۆر بە چاوێکی تەواو جیاوازەوە لەم چالاکی و بابەت و بنەمایانە ڕوانیویانە کە هێناویانەتە گۆڕێ. هەنووکە زۆر یەك لەو وانانەی پێوەندییان بە کۆڵینەوە و تۆژینەوەی دەقی ئەدەبییەوە هەیە، بە پرسیار و بابەتە پێوەندیدارەکان بە تیۆریی ئەدەبییەوە سەرقاڵن، ئەو پرسیار و بابەتانەی کە پێشتر لەوانەیە لەبەر چاو نەدەگیران، یان ڕوون و باسهەڵنەگر، و هەر بۆیە وەك بیرۆکە و چەمکگەلێکی مشتومالْ هەڵنەگر و مسۆگەر دەهاتنە ئەژمار. تیۆریی ئەدەبی، پتر لە جاران لە نێو بەرنامە و پەیڕەوی وانەیی زۆربەی زانکۆکاندا گونجاوە، جا چ وەك یەکەیەکی وانەیی دیاریکراو، چ وەك وانەیەکی سەرەکی یان خۆ ویست لە قۆناغە فێرکارییەکاندا. مەسەلەی گرینگتر ئەوەیە تیۆریی ئەدەبی بە شێوەی ناڕاستەوخۆ، لە زۆر یەك لەو وانانەی کە بە شێوازی ئاسایی و نەریتیتر سەرقاڵی ڕێکخستنی کۆمەڵێك دەقی ئەدەبی بۆ تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەن، دەبینرێ، واتە لە کۆمەڵێك پۆلێن کردنی وەك: جۆرەکانی ئەدەبی (ڕۆمان، شێعر یان دەقی شانۆیی) و قۆناغەکانی ئەدەبی (سەدە، دەیە، یان پۆلێن کردنی زەمانیی دیکە) و ڕێبازەکانی ئەدەبی (وەك ڕۆمانتیسم، مۆدێرنیسم) و نووسەران (هەڵبژاردەی شوێنەواری نووسەرانی«بەناوبانگ» و جاری وایە ئەوانەی وا خاوەنی ناوبانگێکی کەمترن).

سەبارەت بەو پۆلێن کردنەی دوایی، پێودانگی ڕێکخستن و هەڵبژاردنی دەقی ئەدەبی ـ و لە ڕاستیدا ئەوەیکە مەبەست لە بابەتی «ئینگلیزی» یان «ئەدەبیات» چییە ـ چیتر وەك شتێکی ڕوون و مشتومڕ هەڵنەگر چاوی لێ ناکرێ. دەکرێ بێژین وەك چۆن بە تێپەڕاندنی قۆناغی منالْی و پێ نانە نێو قۆناغی گەورەبییەوە شێوازی خوێندنەوەی ئێمە دەگۆڕێ، چونکی بەو ڕاستییە دەزانین کە گێڕانەوەکان "narratives" بە شێوەی جۆراوجۆر بیچم دەگرن یان دادەهێنرێن و لە هەر کام

PDF 4 KURD

لەم شێوانەدا فرتوفێڵ یان تەکنیکێکی تایبەت لە کار دەکرێ (ئیتر خوێنەرێکی «بەستەزمان» نین)، هەر بەم جۆرە تۆژینەوەگەلی ئەدەبی لەو پێگەیەوە کە ئەدەبیاتی پتر وەك دیاردەیەکی سروشتی چاو لێ دەکرد، رووی کردە تێڕوانینێکی پرسیارکەرانەتر کە هەنووکە زۆر لایەن کە جاران روون و ئاسایی و سروشتیان دەنواند، دەخاتە ژێر زەرڕەبینی تاوتوێکردن و لێکۆڵینەوەوە.

سەرهەڵدانی تیۆریی ئەدەبی پەرچە کرداری جۆراوجۆری لێ کەوتۆتەوە. تیۆریی ئەدەبی، یان لە ڕاستیدا تیۆریی دارێژانی ئەورووپایی دەیەی ١٩٧٠، جار لەگەڵ جار زیاتر گرینگایەتییان وە دەسهێنا: ڕەنگە ئەم خاڵە هەڵگری واتایەك بێ کە نووسەرانی تیۆریی ئەدەبی لە چاو بۆچوونەکانیان گرینگی زیاتریان پێ دەبەخشرێ، هێشتاش لە هەندێ کۆڕ و کۆمەڵ هەر بەم چەشنەیە. لە گۆوار و ڕۆژنامە و بنکە زانکۆییەکاندا باسوخواسی گەرموگوڕ لە ئارادا بوو، بە جۆرێك کە وێدەچوو لە نێوان ڕوانگەکانی دژە بنەمای نوێ ـ کە زۆرتریان لە سەرچاوەیەکی غەیری ئینگلیزییەوە هەڵقوڵاون و لە ژێر ناوی گشتیی «تیۆری» یان «پێکهاتە خوازی»[1] پۆلێن کرابوون ـ و ڕوانگەی نەریتیتر بە ناوی هیومانیزم[2] و داب[3] یان نەریت[4]، جۆرە دژوازییەك[5] لە گۆڕێدا بوو. دیارە تاقمێك بوون ـ و هێشتاش هەن ـ کە بە توندی دژایەتی هەر چەشنە گۆڕانکارییەکی تۆژینەوەی ئەدەبییان، بەو چەشنەی کە پێش سەرهەڵدانی تیۆریی ئەدەبی بیچمی گرتبوو، دەکرد. دەستەواژەی «قەیران لە تۆێژینەوەکانی ئەدەبیی ئینگلیزی» لە سەرتای دەیەی١٩٨٠ زۆر برەوی هەبوو،

1- Structuralism.
2- Humanism (مرۆڤخوازی)
3- common sense.
4- tradition
5- polarization



شایەنی سەرنج پێدانە کە هەندێ لە کۆرسە تازەکانی خوێندنی زانکۆیی لە بنکەگەلی فێرکاریی باڵادا بەدی هاتن، کۆرسگەلێکی وەك تۆژینەوەی کولتووری و تۆژینەوەی پێوەندییەکان لە ناوەڕۆك و شەقڵ و شێوازی وانە باوەکانی ئەدەبیاتی ئینگلیزییان بە شێوەگەلی جۆراوجۆر خستە ژێر زەرڕەبینی گومانەوە و کۆتاییان بە پاوانی فەرهەنگی ئەدەبی لە ژێر دەسەڵاتی بنکە و کۆڕ و کۆمەڵە زانکۆییەکان هێنا. لەم دەیەی دواییدا(واتە ١٩٨٠)، کاریگەرێتی تیۆریی ئەدەبی هێندە زۆرە کە ئێمڕۆکە ڕەخنەی ئەدەبی شك نابەی بتوانێ بێ بەکار هێنانی هەندێ لایەنی تیۆری بە شێوەی جۆراوجۆر ڕەخنەی بۆ بنووسرێ و هەروەها، بە هەمان ڕێژەش بۆ خوێندکاری ئەدەبیات ئەستەمە لە حاند ئەو ڕوانگانەی کە شوێندەستیان بە سەر شێوازییەکانی خوێندنەوەی دەقی ئەدەبییەوە دیارە و خزاونەتە نێو گوتاری ڕەخنەی ئەدەبییەوە، چاو بنووقێنێ.

ئەم کتێبە بەرکۆڵێکە بۆ ناسینی هەندێ لایەنی تیۆری ئەدەبی، و من ئەوەندەی توانیبێتم، هەوڵم داوە بۆ ئەو کەسانەی پێیان خۆشە خوێندنەوەیان ئاراستەیەکی تایبەت وەربگرێ کۆمەڵێك ژێدەر بۆ خوێندنەوەی زیاتریان پێ بناسێنم. هەر وەتر، هەوڵم داوە تا ڕادەی گونجاو، پێوەندییەك پێکبێنم لە نێوان ڕوانگەکانی پێوەندیدار بە ڕەخنەی ئەدەبیی نەریتی و ئەو ڕوانگە وەرگیراوانە لە تیۆری ئەدەبی کە گومان لە ڕاست و دروستی وان دەکەن یان سازگار دەکەنەوە. بەڵام وەك دواتر دەیبینن، نابێ پێمان وابێ تیۆریی ئەدەبی کۆمەڵێك یاساو ڕێسای هەڵە هەڵنەگر و دڵنیاییکەر بۆ ڕاڤەی دەق دەخاتە بەر دەست، یان ئەوەیکە تیۆریی ئەدەبی تەنیا شێوەیەکی ترە بۆ خوێندنەوەی ئەدەبیات. تیۆری ئەدەبی بە پێچەوانەی هەندێ شێوازگەلی ڕەخنەگرانەی پێشوو، مەیدانێکی پڕ پێچو پەنا و بگۆڕە، و پتر لە سەر دەستی مشتومڕ و جیاوازی دەسنیشان دەکرێ تا هاودەنگی و یەك شێوازی.

## ئەدەبیات و تیۆریی ئەدەبی

بۆ دەسنیشانکردنی چوارچێوەی تیۆریی ئەدەبی دەکرێ وای لەبەر چاو بگرین کە ئەدەبیات خۆی دیاردەیەکە و بۆی هەیە بە سانایی پێناسە بکرێ. بێ شك زاراوەی «ئەدەبیات» زۆر جار بە جۆرێك بەکار دێنن وەك بڵێی چەمکێکی بە پێچو پەنا نییە. بۆ نموونە، لە کتێبخانەکاندا دەقی ئەدەبی بە پێی سیستمی پۆلێنکردنێکی دیاریکراو لە دەقەیلی‌تر جیا دەبنەوە. رۆژنامە و کۆوارەکان لە هەندێ بەشی تەواو دەسنیشانکراو بە ناساندن و رەخنەی رۆمان و شێعرەوە خەریك دەبن. هێشتاش لە زانکۆ و بنکەکانی فێرکاریی باڵا کۆمەڵێك وانەی ئەدەبیات پێشکەش دەکرێ و هەندێ لە خوێندکاران ئەو وانانە دەخوێنن، و هتد. بەڵام لە رێی تاوتوێکردنی چۆنێتی رێکخستنی ئەو کۆمەڵە شوێنەوارەی کە «ئەدەبیات» یا ««ئەدەبیاتی ئینگلیزی» پێدەڵێن، پەی بە جیاوازیی نێوان زانکۆ و بنکەگەلی فێرکاریی گشتی دەبەین. ئەم جیاوازییانە بە پێی ئەو زەمینەیانەی کە ئەدەبیاتی تێدا جێگر دەبێ جۆراوجۆرن. بەم جۆرە، بێگومان چاوەڕوانیی ئەوە دەکەین ئەو کۆمەڵە کتێبەی کە لە بەشی ئەدەبیاتی کتێبفرۆشی و دووکانی رۆژنامە فرۆشیی وێستگەیەکی شەمەندەفەر دەیبینین لەگەڵ ئەو شتەی کە لە بەرنامەی فێرکاریی وانەی ئەدەبیاتی سەدەی بیستەم، لە زانکۆ پێشکێش دەکرێ جیاواز بن. ئەم جیاوازییانە هەم لایەنی کولتوورییان هەیە، هەمیش لایەنی مێژوویی: ئەدەبیات لەم چەند سەد ساڵەی دواییدا، کەمو زۆر بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بە چەشنەیلی جۆراوجۆر شیکراوەتەوە. تەنانەت لە بەرنامەیلی فێرکاریدا (لە وانەکانی قوتابخانەوە بیگرە تا کۆرسی زانکۆ) کە لە سەرەتاوە چوارچێوەیەکی گشتی بۆ پێناسە کردنی ئەدەبیات

لەبەر چاو دەگرن، بۆ چوونگەلێکی زۆر جیاواز و دوور لەیەك سەبارەت بە ئەدەبیات لە ئارادایە، و هەروەتر لە سەر ئەوەی دەقەیلی جۆراوجۆر بە پێی کام پێوەر دەکرێ لە بەرنامەی وانەییدا بیگونجێنی، بیروڕای دژواز هەیە. بنکەگەلی جۆراوجۆر ویستوویانە چەشنێکی تایبەتی ئەدەبیات بۆ خۆیان هەڵبژێرن و بەهاو راستەقینەی بە رواڵەت جیهانگیرانەی (universal) پێ ببەخشن. خوێندنی ئەدەبیات بە ناوی «ئینگلیزی» لە دوا ساڵانی سەدەی بیستەم هۆکارێکی دیارە بۆ نیشاندانی ئەو راستییە کە کلتووری زانکۆیی ئینگلیزی (نەك بریتانیایی) لە سەر دەستی چ شێوەگەلێك بە نیازی یەکپارچە کردن و نەزم و تەکووزی بەخشین بە بابەتی فێرکاریی ئەدەبیات بووە.

ئەنجومەنی ئینگلیزی، کە ساڵی ١٩٠٧ دامەزرا، لە رێی شەنوکەو کردنی چەمك و مانای کولتوور و پێشکەوتی ئەخلاقیی بەرهەم هاتوو لەو شتەی کە «ماتیو ئارنۆڵد»[1] لە سەدەی نۆزدەدا بەرگری لێ کردبوو، گرینگترین رێکخراوەیەك بوو کە هەوڵی گەشە پێدان بە کۆڵینەوە و تۆژینەوەی کولتووری ئەدەبیی «ئینگلیزی» لە بنکەیلی فێرکاریدا بوو. تێڕوانینی ئارنۆڵد لەمەڕ کلتوور بەم چەشنە کە دەیگوت، کولتوور «پڕ بایەخترین و بەهادارترین تێگەیشتن و بۆچوونی مرۆڤ لەم جیهانە» دایە، تا رادەیەکی زۆر لە رێی ئەدەبیاتەوە هاتە نێو مەیدانی کردەوەوە: واتە خوێندنەوە و تۆژینەوەی شوێنەواری کلاسیك و دواتر شێعری ئاخر و ئۆخرەکانی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەم کە لە زمان و چەشنەیلی شێوە کلاسیك و ئۆستوورەکانی پێوەندیدار بە ئینگلیستانی گوندنشین و هەرمان بە فراوانی کەڵکی وەرگرتووە. (The old Vecarage Grancheste)r" 1912"

١- Matthew Arnold (١٨٢٢-١٨٨٨)، شاعیر و رەخنەگری بریتانیاییی سەردەمی ویکتۆریا.



بەرهەمی «ڕوپێرت برووك»[2] نموونەیەکی هەرە دیاری ئەو شێعرانەیە کە هێمای ئەم چەشنە لە «ئینگلیزی بوون»ـن. «تێری ئیگلتۆن» و هەندێکی‌تر لە تۆژەران وایان لێکداوەتەوە کە خوێندنەوە و تۆژینەوەی ئەدەبیات و کولتووری ئینگلیزی جێی «دین»ی گرتەوە کە لەو سەروبەندەدا بە خێرایی خەریکی پاشەکشێ بوو. ئەدەبیات دەیتوانی ئەزموونێکی هاوشێوە {ی ئەزموونی دین} پێشکێش بکات، و لە پەنا پەرەپێدان بە مافی خەڵکان و فێرکاریی بێ پارە و خۆڕایی، حکوومەت دەبوایە بەهای شیاو و پڕ ناوەڕۆك لە بەرنامەکانیدا بگونجێنێ. دوابەدوای دامەزراندنی «ئەنجومەنی (ئەدەبیاتی) ئینگلیزی»، راپۆرتی دەوڵەتی ئینگلیستان دەربارەی فێرکاریی (ئەدەبیاتی) ئینگلیزی لە ئینگلیستان کە لەسەر دەستی لێژنەیەك بە سەرۆکایەتی «هێنری نیوبۆڵت» شاعیری ئەسڵە ئینگلیزیی شێعری «پێدابگرە، پێدابگرە، دوایی دەس بکە بە کایە» ئامادە کرابوو، شوێن و پێگەی سەرەکیی {ئەدەبیاتی} ئینگلیزی لە بەرنامەی فێرکاریدا مسۆگەر کرد.

لەبری ئەوەی ئەدەبیات بە کۆمەڵە شوێنەوارێکی هاوچەشن و هاوبیچم کە خاوەنی تایبەتمەندیگەلی وێکچوون لە قەڵەم بدەین کە خوێنەرانێکی یەکسان بە شێوەی وەك یەك دەیان خوێننەوە، بۆمان هەیە بە پانتاییەکی بەردەوام بزۆك و هەمووکات بگۆڕی بزانین. دوو زاراوەی «ئەدەبیات» و «ئەدەبی»، کۆمەڵێك مانای پڕ پێچو پەنا و چەند لایانەیان هەیە، نەك ماناگەلێکی نەگۆڕ و تاك. جگە لەمانە، «ئەدەبیات» وەك کۆمەڵێك بەرهەم و تایبەتمەندیگەلی ئەخلاقی و جوانیناسانەی بە گشتی پێوەندیدار بە ئەدەبیات، بابەتێکی مشتومڕ ورووژێنە، بە چەشنێك کە چەمکەیل و ماناکان لەبری ئەوەی بەهاو هەقیقەتی

٢- Rupert brooke (١٨٨٧-١٩١٥)، شاعیری جوانەمەرگی بریتانیایی.

هەتا هەتایی و گشتییان هەبێ، وەك چۆن زۆر جار وایان وێنا دەکەین، زۆر جار باسوخواس و کێشە و مشتومڕیان لە سەرە.

تیۆریی ئەدەبی، یان تیۆریگەلی ئەدەبی، دەتوانن بۆ شیکردنەوەی ئەدەبیات یان لانیکەم تاوتوێکردنی ئەو بابەتانەی کە لە هەولّی شیکردنەوەی ئەدەبیاتدا دێتە گۆڕێ، شێوەیلی جۆراوجۆر بە دەستەوە دەدات. ئەم تیۆرییانە ناچارەکی لەگەڵ یەك تەبا و ڕەبا نین و ڕاڤەکارانی ئەم دواییانەی بابەتێك کە پێی دەگوترێ تیۆریی ئەدەبی، سەرنجی ئێمە یان بۆ لای ئەو تێڕوانینە زۆرتر دژوازانای نێوان ڕوانگەگەلی تیۆریکی جۆراوجۆر ڕاکێشاوە. تیۆریی ئەدەبی ڕێگا چارەی ساکار یان ورد بۆ پێناسەی ئەدەبیات یان چییەتی تۆژینەوەی ئەدەبیات بە دەستەوە نادات، بەڵام ناشێ ناچارەکی ئەم خاڵە بە خاڵێکی سەلبی لە قەڵەم بدەین.

تیۆریی ئەدەبی دوو خاڵی سەرەکی سەبارەت بە تۆژینەوەی ئەدەبیات دێنێتە گۆڕێ کە هەمیشە لە تێڕوانینگەلی غەیری تیۆریکدا دیار و بەرچاو نەبووە. یەکەم ئەوەیکە، وەك پێشتریش باسم کرد، لە تیۆریی ئەدەبیدا، ئەدەبیات دەگۆڕێت و دەبێتە پانتاییەکی پڕ پێچو و پەنا و ناهاو چەشن:

بۆ تۆژینەوەی چۆنێتیی هەڵسوکەوتی کولتووری یان مێژوویی ئەدەبیاتی ئینگلیزی وەك شێوەیەکی نڤیسان و ناسین، دەکرێ لە بری «ئەدەبیاتی ئینگلیزی» باسی «چەشنەیلی جۆراوجۆری ئەدەبیاتی ئینگلیزی» بکەین. دووهەمیش ئەوەیکە، چالاکی و کاروباری پێوەندیدار بە تۆژینەوەی ئەدەبیات، لە خوێندنەوەوە بیگرە تا دەگاتە ڕەخنە، دەشێ بەردەوام پێیدا بچینەوە و هەڵیسەنگێنینەوە.



دەکرێ گوتاری تیۆریی ئەدەبی بە شێرێکی دوو سەر بزانین کە لە لایەکەوە دەتوانێ بە شیکردنەوە و تەمومژ سڕینەوە لە گریمانە یان بەها ناڕاستەوخۆیەکانی ئەدەبیات و ڕەخنەی ئەدەبییەوە سەرقاڵ بێت، بەڵام لە لایەکیتر نابێ، «هەقیقەت»ـە هەڵێنجراوەکان لە دەقەیلی تیۆریك بێ باسوخواس و مشتومڕ پەسند بکەین. ئەم تێڕوانینە کەمو زۆر پارێزکارانەیە و ئەم هەڵسەنگاندن و پێداچوونەوەیە کۆتایی هەڵنەگرەی زاراوەگەلی {تیۆریی ئەدەبی} و ئەو بەها یان داوەری کردنانەی کە لە {زەینی} خوێنەردا دەیگونجێنن، لەوانەیە خۆی یەکێك لە خەسڵەتە گشتیترەکانی تیۆریگەلی ئەدەبی بێت: ئەم تیۆرییانە ڕووە و جۆرێك لە خودئاگایی یان تەنانەت خود ـ ڕەنگدانەوەیی (self-reflexivity) هەنگاو دەنێن کە ڕەخنەی نەرێتی[3] لە هەمبەریدا تاقەتی نەهێناوە و پەسەندی نەکردووە، و ئەم خود ـ ئاگاییە زۆرتر ڕووی لە زمانە، زمانی ئەو دەقەی کە لێی دەکۆڵدرێتەوە و زمانێك کە لە تۆژینەوەی دەقدا لە سەری دادەبەزێندرێت.

## ڕەخنەی ئەدەبی و تیۆریی ئەدەبی

ڕەخنەی ئەدەبی سەرەکیترین چالاکییەکە کە لە فێرکاریی بەشی ئەدەبیاتی زانکۆکاندا خۆی سەقامگیر کردووە، هەر بۆیە پێویستە ئەو زاراوە و بابەتانەی کە تێیدا بەکار دەبرێن لێیان بکۆڵدرێتەوە و شەنوکەو بکرێن. ڕەوتی ئاسایی کارەکە بەم شێوەیە بووە کە دەستە واژەگەلێکی وەك «نووسەر» و «کەسایەتی» یان «ڕۆمان» بە چەشنێك کەڵکیان لێ وەربگرین وەك بڵێی ئەمانە کۆمەڵێك لایەنی سەلمێندراوە و سەر لەبەر سروشتی و دیاریکراوی

3- traditional criticism.

ئەدەبیاتن. هەر بەم پێیە، ناشێ ئەو بابەتانەی کە لە تێڕوانینی تیۆریکدا دێنە ئاراوە، بە بێ باسوخواس و مشتومڕ پەسەند بکەین.

لەم ڕوویەوە پێویستە لە نێوان چالاکی یان کارکرد و ئەرکی ڕەخنەی ئەدەبی و تیۆریی ئەدەبیدا جیاوازی قایل بین، چونکی بە شێوەیەکی هێزەکی لەوانەیە بە هەڵە لەم دوو چوارچێوەیە بگەین. بە زمانێکی گشتی بێژانە دەکرێ بڵێین ڕەخنەی ئەدەبی بریتییە لە خوێندنەوە و شرۆڤەکردن و شیکردنەوەی دەق یا کۆمەڵێك دەقی تایبەت کە پێیان دەگوترێ ئەدەبیات. ئەمە سەرەکیترین کارێکە کە لە فێرکاریی ئەدەبیاتدا دەکرێ: ڕەخنەگرانی پسپۆر ئەم کارە دەکەن و لە کتێب و کۆوارەکاندا بڵاوی دەکەنەوە و خوێندکارانی لقی ئەدەبیاتیش لە تۆژینەوەی زانکۆیی و لە وەڵامدانەوەی تاقیکاری و لە تێزی بڕوانامەکانیاندا هەر ئەم کارە دەکەن. لە سەروبەندی سەرهەڵدانی «ئەدەبیاتی ئینگلیزی» لەم سەدەیەی پێشوودا (مەبەستی نووسەر سەدەی نۆزدەی زایینییە- وەرگێڕ)، سەرەکیترین چالاکیی ئەم مەیدانە، ڕەخنەی ئەدەبی بووە. لە دوایین ساڵانی سەدەی نۆزدەوە، زاراوەی «ڕەخنە» شان بە شانی دەستەواژەی «ئەدەبیاتی ئینگلیزی» و تۆژینەوەی ئەدەبی هاتۆتە پێشێ و گرینگایەتییەکی بەرچاوی وەدەس هێناوە و لە سەدەی بیستەمیشدا ڕێژەی بەکارهێنانی، بە شێوەگەلی جۆراوجۆر هەروا پەرەی ئەستاندووە. ماتیو ئارنۆڵد، شاعیر و ڕەخنەگری فەرهەنگیی سەدەی نۆزدە، زاراوەی «ڕەخنە»ی بە پێداگرییەکی تایبەتەوە بەکار دەهێنا، بۆ نموونە لە وتارێکیدا بەناوی «کارکرد و ئەرکی ڕەخنە لە ساتەوەختی ئێستادا» (١٨٦٧). زاراوەی «ڕەخنەی پراکتیك» (کە لە سەر دەستی ئای. ئێی. ریچاردز I.A.Richards، ڕەخنەگری سەدەی بیستەم، هاتە ئاراوە) و دوابەدوای ئەو فێرکاریی ڕەسمی و



هەڵسەنگاندنی، نموونەیەکن لەمەی کە چۆن چۆنی (ڕەخنەی ئەدەبی) بوو بە یەکێك لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی تۆژینەوەی ئەدەبی. «ڕەخنەگرانێکی» هەڵکەوتەی وەك ئێف. ئار. لیویس (F.R.Leavis) دیارترین و سەرەکیترین پسپۆڕانی بواری ڕەخنە لە قەڵەم دران. شایانی ئاماژە پێکردنە کە چەندان نووسەری شوێنەواری ئەدەبی وەك هێنری جیمز (Henry James) یان تی. ئێس. ئیلیۆت (T.S.Eliot) لە بواری ڕەخنەی ئەدەبییشدا قەڵەمیان بە سەر قاقەزدا هێناوە.

سەرەڕای ئەوەی ڕەخنە زاراوەیەکی زۆر بەربڵاوە کە کۆمەڵێك ڕوانگە و تێڕوانینی جۆراوجۆر سەبارەت بە ئەدەبیات دەگرێتە خۆ، دوو بۆچوونی باو یان دوو گریمانە لە گۆڕێدایە کە کاربردیان هەم لە کردەی ڕەخنەدا، هەمیش لە گوتاری ڕەخنەگرانەدا، زاتی و پێویستە. یەکەم ئەوەی ڕەخنە لە چاو ئەدەبیات، لە پلەی دووهەمی گرینگایەتیدایە و بەو پشت ئەستوورە، بە وتەیەکیتر، ڕەخنە پاشخانی دەقی ئەدەبییە. دووهەم ئەوەیکە ڕاڤە یان تێڕوانینگەلی ڕەخنەگرانە وێدەچێ لەسەر بناغەی ئەم گریمانەیە دامەزراون کە ئەو دەقە ئەدەبییەی لێی دەکۆڵدرێتەوە بێئەوەی گومانی لەسەر بێ بە ئەدەبیات لەقەڵەم دەدرێ، واتە ئەدەبیات بابەتێکی سروشتی و باسهەڵنەگر و ئاشکرایە و هەر بۆیە ڕوانگەگەلی ڕەخنەگرانەی بەرهەمهاتوو لەویش بە هەمان شێوە تایبەتمەندییەکی سروشتی و ڕوون و بێ گرێوگۆڵیان هەیە. لە بەشی چوارەمدا، و لە کاتی باسکردن لەسەر ئایدیالۆژی، لەم بابەتە دەکۆڵینەوە.

سەرباری ئەمە، هەندێ لەو تێڕوانینانە لە مەڕ ئەدەبیات و ڕەخنەی ئەدەبی کە لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەوە هاتوونەتە ئاراوە، تاوتوێکردن و هەڵسەنگاندنی ئەم پرس و کێشانە بە شێوەگەلێکی تاڕادەیەك جۆراوجۆر مومکین دەکەن. بەڵام بەر

لە هەرشتێك دەشێ رەوتی کار و ئەو رەوشت[4] و بەهایانەی[5] کە ناڕاستەوخۆ لە گریمانەکانی سەرەوەدا ئاماژەمان پێکرد دیاری بکرێن: کاتێك دەڵێین بەرهەمێك «ئەدەبییە» و لایەنەکانی بە تێروتەسەلی تاوتۆی دەکەین و پاشان بە باش یان خراپ یان جۆرێکی‌تری لە قەڵەم دەدەین، دەبێ بزانین کە بنەما و چۆنێتی ئەم چالاکییانە چییە و ئەم هەڵسەنگاندن و داوەری کردنە چۆن چۆنی بەرهەم دێت. نابێ رەخنەی ئەدەبی بە پاشخانی ئەدەبیات بزانین، بەڵکوو دەکرێ وەك ئامرازێك بۆ چێ کردنی ئەو نووسراوە و زانیارییانە چاوی لێ بکەین کە وێدەچێ ئەو بابەتە بێت کە رەخنە لێی دەکۆڵێتەوە و سەنگوسووکی دەکات. بە وتەیەکی‌تر، دەکری ئەدەبیات وەك بەرهەم و دەسکەوتی رەخنە و پشت ئەستوور بەو بزانین، نەك بە پێچەوانە. بێگۆمان ئەم قسەیە راستە کە لە لایەنی زەمانەوە، ئەوە دوای نووسینی دەقە کە رەخنە بۆی هەیە باسی دەق بکات، بەڵام سەلماندنی ئەم قسەیە بە مانای ئەوە نییە کە لە سۆنگەی ئەوەی رەخنە کاری تەنیا خوێندنەوەی دەقی ئەدەبی و لێکدانەوەی ناوەرۆکی ئەو دەقەیە، ئیتر بە بابەتێکی پابەند و پشت ئەستوور بە ئەدەبیاتی بزانین. دەکرێ وای لێك بدەینەوە کە هەم ئەو کۆمەڵە نووسراوەیەی کە لە ئاخر و ئۆخری سەدەی نۆزدەهەمەوە بەرەو ژوور لەسەر دەستی رەخنەگرانێکی جۆراوجۆر لە ماتیو ئارنۆڵدەوە بیگرە تا دەگاتە ئێف.ئار. لیویس بە «ئەدەبیات» لەقەڵەم دراون، هەمیش شیکردنەوەی تایبەتمەندی و خەسڵەتگەلێکی ئەدەبیی وەك «لەحن»[6] و «کەسایەتی»[7] و «تێڕوانینی ئەخلاقی»[8] و هتد، زۆرتر لە باسوخواسەیلی رەخنەی ئەدەبیدا

4- method.
5- value.
6- tone.
7- character.
8- moral vision.



هاتوونەتە گۆڕێ، و لە نێو خودی دەقی ئەدەبیدا رەگیان دانەکوتاوە. بە وتەیەکی تر، بە بێ رەخنەی ئەدەبی، ئەدەبیاتێك بوونی نەدەبوو.

ئەم بیرۆکەیە کە بوون یان مانای زاتیی ئەدەبیات خۆبژێوە و جیایە لە رەخنە، بیرۆکەیەکە ماتیوئارنۆڵد لە رێگەی هێنانە ئارای چەمکی «بێلایەن بوون»[9]ی رەخنەگرەوە برەوی پێدا. ئەو پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە رەخنە دەشێ «بابەتەکە بە هەمان شێوە کە هەیە ببینێ و لێی بکۆڵێتەوە.»

ئەم شێوە تێڕوانینە بۆ رەخنەگر وەك کەسێکی بێلایەن کە لە رێگەی تێبینی بابەتیانەوە لە بەرهەمی ئەدەبی دەکۆڵێتەوە، یەکێك لە تایبەتمەندییە گرینگەکانی رەخنەی ئەدەبییە کە دەلکێندرا بە رەخنەی ئەدەبییەوە وەکو چالاکییەکی فۆرمال، و خوێندکارانی ئەدەبیات دەبوایە فێری بن. ئەو روانگەیە تا رادەیەك لەگەڵ ئەم بۆچوونە کە ئەدەبیات وەك «ئەزموون»[10] دەبینێ دژوازی هەیە. ئەزموون پانتاییەکی زەینی و تاکەکەسییە کە تێیدا «هەست و سۆز» گرینگایەتییەکی زۆری هەیە. وەك چۆن دی. ئێچ. لارێنس (D.H.Lawrence) دەیگوت: «ڕەخنەگر دەشێ سەرتاپای هەست و سۆز بێ.»رەخنەی ئەدەبی وێدەچوو لە پەسندکردن و سەلماندنی ئەم بۆچوونە دژوازانەدا گرفتێکی ئەوتۆی نەبێت. هەڵبەت وەك پێشتر ئاماژەم پێکرد، تاقمێك لە تیۆری دارێژان سەبارەت بە «ئەدەبیات» و «بابەتی ئەدەبی» و پێوەندیی نێوان رەخنەی ئەدەبی لەگەڵ ئەم لایەنانە روانگەیەکی جیاوازیان هەیە. وەك چۆن دوایی بە وردی لێیان دەکۆڵینەوە، ئەم تیۆری دارێژانە وای بە پێویست دەزانن کە ئەدەبیات پێناسە بکرێ و ئەو تایبەتمەندییە مێژوویی و کولتووری و فۆرمال و زمانناسانییانەی کە

9- disinterestedncess.
10- experience.

PDF 4 KURD

ئەگەری ئەوەمان دەخەنە بەردەست لە چوارچێوەیەکی تایبەتدا سەبارەت بە «بابەتی ئەدەبی» قسان بکەین، بناسینەوە. جگە لەمە، تیۆریی ئەدەبی دەزانێ و ئاگای لەوەیە کە پێویستە گریمانەی هەندێ لە تێڕوانینگەلی رەخنەگرانە لەمەڕ نووسەر و خوێنەر و ئەوشتەی بە «هەقیقەت»ی دەزانین گومانیان لەسەر بێ و سەر لەنوێ رێکوپێك بکرێنەوە، و ئەم کارە لەوانەیە میتۆد و رەوشتی خوێندنەوە و راڤەی دەقی ئەدەبی بگۆڕێت. کەواتە رەنگە بۆمان هەبێت لە نێوان رەخنەی ئەدەبی و تیۆریی ئەدەبیدا جیاوازییەك دابنێین. ئەگەر رەخنەی ئەدەبی بریتی بێت لە خوێندنەوە و شیکردنەوە و راڤەی ئەو دەقانەی کە پێیان دەگوترێ ئەدەبی، لەم حاڵەتەدا تیۆریی ئەدەبی دەشێ دوو کار بکاتن. یەکەم ئەوەی دەشێ پێوانەگەلێکی جۆراوجۆر بۆ تاوتوێکردنی ئەدەبیات بخاتە بەردەست. زانیاری و ئاگاداری ئێمە لەمەڕ ئەم پێوانانە لە باسوخواسەیلی تیۆرییەکانی زمانەدا لە بەشی سێ و پاژی ئایدیالۆژیی بەشی چوار لێیان دەکۆڵدرێتەوە. دووهەم ئەوەیکە دەبێ ئەو شێواز و رێبازانەی کە لە رەخنەی ئەدەبیدا رەچاویان دەکەین و بەکاریان دێنین بۆ ئێمە دەسنیشان بکات، بۆ ئەوەی بتوانین هەم لە دەق، هەمیش لە رەوشتەکانی خوێندنەوە و راڤەی دەق بکۆڵینەوە و شەنوکەویان بکەین. بە وتەیەکی وردتر، دەبێ لە نێوان «تیۆریی ئەدەبی» و «تیۆریی رەخنەگرانە»[11] لەم لایەنەشەوە جیاوازی دابنێین کە تیۆریی ئەدەبی هەر لە بنەڕەتەوە بە «ئەدەبیات» و «بابەتی ئەدەبی»یەوە سەرقاڵ دەبێت، لە حاڵێکدا تیۆریی رەخنەگرانە خۆی بە چییەتی و سریشتی رەخنە و کردەی رەخنەی ئەدەبییەوە خەریك دەکات. ئەم دوو لایەنە زۆرتر وەك پاژێك لە بابەتی گشتیی «تیۆریی ئەدەبی» لەقەڵەم دەدرێن و لە راستیدا هەندێك لە تیۆریدارێژان زۆرجار لەبری تیۆری ئەدەبی لە تیۆری

11- critical theory.



رەخنەگرانە دەکۆڵنەوە کە ئەم بابەتە پیشاندەری نەرمونیانی یان لەوانەیە نادروستیی زاراوەگەلێکە کە بە داخەوە لەکۆڵ کاروباری تۆژینەوەی ئەدەبی نابنەوە. بێگومان دوو پانتایی ئەم تیۆرییە وەك تیۆریی ئەدەبی و رەخنەی ئەدەبی بە تەواوی لێك جیا نین، بەڵکوو ئەوەی راستی بێت بە شێوەیەکی بەرامبەر کار دەکەنە سەر یەك و پێوەندییەکی دوولایەنەی پشت ئەستوور بە یەکیان هەیە. خشتەی خوارەوە پێوەندیی نێوان ئەدەبیات و رەخنەی ئەدەبی و تیۆریی ئەدەبی وێنا دەکات.




ئەم خشتەیە مۆدێلێکی پڕ بە پێستی پرۆسەگەلی ئەدەبی و رەخنەگرانە ناخاتە بەردەست: هەندێ کەمایەسیی دیاری هەیە، بە تایبەت نەبوونی نووسەر و خوێنەر تێیدا کە زۆرجار لە تۆژینەوەی ئەدەبیاتدا وەك دوو هۆکاری گرینگ و بنەڕەتی دێنە ئەژمار. لەوانەیە لێرەدا سەرنجمان بەو خاڵەدابێ کە هەندێ لە تێڕوانینە تیۆریکەکان ـ بە پێچەوانەی روانگەی نەرێتییەکان ـ هێندە بە نووسەرەوە ماندوو نابن و باسی ناکەن و لە تۆژینەوەی ئەدەبیاتدا بە مانای کۆمەڵێك دەق یان تاقە دەقێك، نووسەر بە خاڵی حاشا هەڵنەگەری دەسپێك نازانن.

## ئەدەبیات و ئەزموون

یەکێك لە ئەستەمترین کێشەکان لەمەڕ نیسبەتدانی خوێندنەوە و راڤە بە باسوخواسەیلی تیۆریك ئەمەیە کە تێگەیشتنی ئێمە سەبارەت بە شیعرێك، رۆمانێك یان دەقێکی شانۆیی ناچارەکی پشت بە ئەزموونی ئێمە لەسەر ئەو دەقە دەبەستێ و ئەم ئەزموونەش لەسەر دەستی ئەزموونەکانی ئەدەبی و غەیرە ئەدەبیی پێشوومان دیاری دەکرێت. بەڵام ئەزموون بۆی هەیە هەڵگری چەندین واتای جۆراوجۆر بێت و زاراوەیەکە کە دەکرێ یۆچوونگەلێکی تەواو دژوازت لەسەری هەبێ: بۆ وێنە، جیاوازی نێوان ئەزموونی جیهانی واقیع و جیهانی زمان، کە لە بەشی دواتردا لێی دەکۆڵینەوە.

تۆژینەوەی ئەدەبیات پێوەندییەکی تۆکمەی لەگەڵ قەڵەمڕەوی ئەزموون و زاراوەگەلی پێوەندیدار بەوەوە هەیە، زاراوەی وەك «هەست و سۆز» و «لایەنی عاتیفی». هەر بۆیە بە تایبەت لە زانکۆکاندا تۆژینەوەی ئەدەبی وەك شتێکی دژواز لە هەمبەر زانست و زانستی کۆمەڵایەتی دەزانن. بۆ فێربوونی وانەگەلێکی وەك فیزیك و کیمیا، و بە شێوەیەکی بەرچاوتر کۆمەڵناسی یان فەلسەفە، تیۆری بە گرینگ دەزانن. بەڵام لەو لقانەی کە زۆرتر وابەستەی هونەر یان زانستی ئێنسانین، تیۆری زێتر وەك بابەتێکی پەراوێزی یان تەنانەت نەشیاو چاو لێ دەکەن. تۆژینەوەی مێژوو هەمووکات بە راشکاوی پێویستی بە لێکدانەوە و تاوتوێکردنی تیۆریی مێژوویی نییە و وەك چۆن بەرلەمە ئاماژەم پێکرد، فێرکاریی ئەدەبیات لە بریتانیادا زۆر دژ بە باسوخواسەیل و روانگەگەلی تیۆری بووە. ئێف. ئار. لیویس رەخنەی ئەدەبیی بە شتێکی جیاواز لە یاسا و رەوشتەیلی کۆمەڵناسی یان فەلسەفە دەزانی. لیویس پێی وابوو کە بنچینە و بناغەی فێرکاریی ئەدەبیات «تەنها خوێندنەوەی بەردەوام و فێرکراوی دەقەیلی ئەدەبی» یە و لەم رێگەیەوە دەکرێ بە تەواوی لە «ئەزموونی بەرهەستی مرۆڤ»[12] بگەین. بە تایبەتی، چەمکگەلێکی وەك هەست و سۆز و لایەنی عاتیفی زیاتریش بەناوی «ڕەخنەی پراکتیك» بنچینەی تەوەری تەجرەبی یان ئەزموونگەرای فێرکاریی ئەدەبیاتیان پێکهێناوە. لە «ڕەخنەی پراکتیك» دا وا گریمان دەکرێ کە خوێنەر بۆی هەیە لە رێگەی ئەزموونی نێو دەقی ئەدەبییەوە یان لە رێگەی ئەزموونی نووسەرەوە کە لە سەردەستی دەق خۆیا دەبێ، خۆی پێناسە بکات و پتر لە خۆی بگات. بەڵام لەوەدا کە لەم شێوازەی رەخنەی ئەدەبییەدا بەوردی هەست و عاتیفەی چ کەسێك مەبەستی بابەتەکەیە، ئەوەیان پرسێکە و زۆری لێ ناکۆڵدرێتەوە. وێدەچێ ئەدەبیات ئەزموونێکی باڵادەست[13] و جیهانشمول دەخاتە بەردەستی خوێنەر کە رەخنەی ئەدەبی بۆی هەیە تاوتۆیی بکات و بیناسێنێ.

باسی ئەم شێوەیە لە ئەزموون، واتە ئەزموونێك کە لە بێژنگی دەسنیشانکردنی هەست و سۆز درابێت، رۆژ لەدوای رۆژ زیاتر باسێکی پرس ورووژێنی لێ دەردێ، چونکی لێکۆڵینەوەی تیۆریك کۆمەڵێك تێڕوانینی هێناوەتە ئاراوە کە گومان لە سروشت و باڵادەستیی ئەزموون، وەك چەشنێك لە تێگەیشتن و ناسین، دەکات. بابەتی سەرەکی کە لە هەندێك باسوخواسەیلی تیۆریکدا هاتۆتە گۆڕێ، ئەمەیە کە لە مجۆرە رەخنەیەدا، باسی ئەزموونی کێ دەکەین؟ ئەزموون بابەتێکی زەینی و رێژەییە کە لەلایەنی تاکەکەسی و

12- concrete human experience.

١٣- transcendent بەختیار عەلی لە کتێبی «ئیمان و جەنگاوەرانی» باڵاگا ـ ی لە بری ئەم وشەیە بەکار هێناوە

مێژووییەوە شتێکی بگۆڕە و لە ئەدەبیاتدا زمان پێکی دێنێ. ئەمەش خۆی پرسێکی ترە، گەرچی لەوانەیە زۆربەی رەخنەگرانی قوتابخانەی ئەزموونگەرا سەرنجێکی ئەوتۆ نەدەنە زمان، یان زمان تەنیا بە لایەنی لاوەکیی ئەزموون یان ئامرازێك بۆ گوازتنەوەی ئەزموون بزانن. لایەنە پڕپێچوپەنا و چەند توێژەکانی ئەزموون لە زۆربەی هەرە زۆری رەخنە ئەدەبییەکاندا لەبەر چاونەگیران. لەبری ئاشکرا کردن و نیشاندانی سریشتی فرە لایەن و بگۆڕی راڤە و پێداگرتن لەسەر گرینگیی خوێنەر بەپێی مێژوو و جنس و چینی کۆمەڵایەتی و پێوەندیی بەرهەمهاتووی وی لە تەك دەقدا، ئەم شێوە رەخنەیە زۆرتر بە تەما بوو هەقیقەتێکی گشتی یان جیهانشمول دەسنیشان بکات، هەقیقەتێك کە هەموو کەس باوەڕی پێی هەبێت و ئەزموونەیلی هاوبەشی تاکەکەسی بە رواڵەت پشتی بگرن. ئەم ئەزموونە تاکەکەسییەی باسمان کرد زۆرجار لەسەر جیاوازییەکانی نێوان خوێنەران پێداگرییەکی ئەوتۆی نەدەکرد. لە راستیدا شێوازی دەربڕینی بابەتەکان لە زۆرینەی نڤیسانەیلی رەخنەگرانەدا پیشاندەری ئەم گریمانەیەیە کە هەر لە بنەڕەتەوە جەماوەری خوێنەر پیاون و زۆرتر رووی لە کۆمەڵێك بەهای کۆمەڵایەتی و کولتووری هاوبەشە.

کەواتە پێویستە ئەزموون وەك سەنگی محەکێك لە رەخنەی ئەدەبیدا بە وردی تاوتۆی بکرێ. ئەزموون دەتوانێ ئەو پرۆسانەی کە لە رێگای ئەوانەوە مانا جۆراوجۆرەکان بەرهەم دێن بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە و ببێتە هۆی سەلماندن و پەسندکردنی ئەو بەها یان «هەقیقەتانە»ی کە جگە لەوەی پاژێکن لەو بەرهەمە، پاژێکیشن لە تانۆپۆیەکی کولتووریی بەرفراوانتر. لە لایەکی ترەوە، پێویست ناکات ئەزموون و تیۆری لە هەمبەر یەك دابنێین. لەبری پشت بەردانی ئەزموونی خوێندنەوە، تیۆریی ئەدەبی لەدەستی دێت پشتی بگرێت و نەفەسی



تازەی بە بەردا بکات و رزگاری بکات. وەك لە بەشەکانی دواتریشدا ئاماژەی پێ دەکەین، تیۆریی ئەدەبی لە رێی گومان کردن لە هەندێ داب و دەستوور و بۆچوونی زاڵ بەسەر شێوازەکانی رەخنەی نەرێتی (ترادسیۆنال یان سوننەتی)، دەتوانێ وردبینانەتر لە دەقەیلی ئەدەبی و ئەزموونگەلی حاسڵ لەوان تێبگات و فامیان بکات.

## نەریتی ئەدەبی[١٤]

یەکێکیتر لە چەمکەیلی پێوەندیدار بە ئەزموون، «نەریت»ـە. ئەم چەمکە لە پرۆسەی پێکهێنانی چوارچێوەیەکی بابەتی یان لقی ئەدەبیات و کردەی رخنەدا خاوەنی گرینگایەتییەکی فراوان بووە. ئەگەر لە دوایین سالانی سەدەی نۆزدەوە، «ڕەخنە» شانبەشانی چەمکەیلێکی وەك کولتوور و ئەخلاق و شارستانییەت، یەکێك لە وشە سەرەکییەکانی تێڕوانینی رەخنەگرانە بۆ ئەدەبیات بووە، ئەوە لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە، «نەریت» لەو واژە بنەڕەتییانەیە کە کۆمەڵێك بەها، و ئاراستەیەکی تایبەتی بە ئەدەبیات و رەخنەی ئەدەبی بەخشی. تی. ئێس. ئیلیۆت لە وتارێکی چڕوپڕ، بەلام کاریگەریدا بەناوی «نەریت و مرخی تاکەکەسی» (١٩١٩) ئەم لێکدانەوەیە دەخاتە بەردەست کە ئەدەبیات تایبەتمەندی و بەهاگەلێکی هەرمان و زەمان بەزێنی هەیە کە دەکرێ وەك چەشنێك میراتی کولتووری لە قەڵەم بدرێن:

***... مانای مێژوویی نەك هەر بریتییە لە رابردوو بوونی رابردوو، بەڵکوو بریتیشە لە هەنووکەیی بوونیشی، مانای مێژوویی مرۆڤ دنە دەدات کە هەم بە هۆی هەست بە نیزیکایەتیکردن لەگەڵ ئەو نەوەیەی کەسەر بەوە، شت***

١٤- لەبری «نەریت» بۆ tradition سوننەت و خودی ترادسیۆن ـ یش بەکار دەبرێ.

PDF 4 KURD

***بنووسێ، هەمیش بەم هەست و فامەوە کە سەر لەبەری ئەدەبیاتی ئەورووپا لە سەردەمی هۆمێرو هەناوی ئەو سەردەمەوە سەرومڕی ئەدەبیاتی سەرتانسەری وڵاتەکەی بوونێکی هاوشێوەی هەیە و نەزم و تەکووزییەکی هاوشێوە پێکدێنێت. ئەم مانا مێژووییە کە هەم هەستێکی هەرمانە، هەمیش تێپەڕ و کاتی، نووسەر دەکاتە (نووسەرێکی) نەرێتی.***

مانای «نەریت» ێکی یەکە و تاقانە لە چۆنێتی تێڕوانین بۆ ئەدەبیاتدا گرینگی وەدەس هێنا. هەر لەو سەروبەندەدا کە ئیلیۆت سەرقاڵی نووسینی «وێرانە خاك» (١٩٢٢) بوو- کە وێدەچێ یەکێك بێت لە لێكهەڵوەشاوەترین و تاقیکارانەترین دەقەیلی ئەدەبی ـ هەروەتر دەیگوت کە ئەدەبیات و تۆژینەوەی ئەدەبیات هەر لە بنەڕەتەوە لەسەر بناغەی چەشنێك هەستی یەکێتیخوازی بەهاگەرایی دامەزراوە کە سنووری هەر قۆناغ و چاخێکی مێژوویی تایبەت دەبەزێنێ. ئەم لێکدانەوەیە، ئەوەی راستی بێت، ئەدەبیات لەهەر چەشنە لایەنێکی مادی و لە رابردوو و ئێستا «مێژوو تەکێن»[15] دەکات و لەبری ئەو، برەو بە وێنای جۆرە مێژوویەکی مەعنەوی دەدات کە وابەستە و پابەندە بە فامی شهوودیی ئەزموونی مرۆڤ. ئەم تێڕوانینە، لە روانگەی ئێف. ئار. لیویس، سەبارەت بە رۆڵی رەخنەی ئەدەبی، دەچێت. ئەم تێڕوانینە دواتر لە لایەن دوو تێزی ترەوە پشتی گیرا: یەکەم ئەوەیکە ئەدەبیات بابەتێکی غەیری شەخسییە کە ئەزموونی شەخسیی نووسەر یان خوێنەر لەودا پەیڕەو دەکرێ و لەژێر کاریگەرێتیی مانایەکی بەربڵاوتری ئەزموونە وەکوو نەرێت، و ئیتر لانیکەم لە نێوەڕاستی سەدەی حەڤدەهەم بەولاوە، لە نێوان ئەزموون و زماندا، جیاوازی هەیە. دەکرێ ئەم جیاوازییە بە زمانێکی سادە بەم شێوەیە شی

15- de _ historicize.



بکەینەوە کە ئەزموونی زمان ئەوەیە کە جیهان یان «واقیع» شتێکە و زمان شتێکیتر، و ئێمە زمان بۆ لێکدانەوەی ئەوشتەی پتر لەو هەستی پێدەکەین بەکار دەبەین. بەڵام تیۆرییەکانی زمان نیشاندەری ئەوەن کە ئەم پێوەندییە تەواوەن جیاواز و پڕپێچوپەناترە و لە ئاستێکی گشتی، گومان لە بۆچوونی ئێمە لەمەڕ ئەزموونی زمان، دەکات.

ئیلیۆت لێکدانەوەکانی خۆی لەسەر هێڵی تیۆریکی بەڵگەدار ناباتە پێشێ، بەڵکوو دەکری وەك نوێنەری تێڕوانینی میتافیزیکی (بان سروشتی) بۆ ئەدەبیات لەقەڵەم بدرێ. مەبەستی من لە «میتافیزیکی» ئەوەیە کە ئەو بێهیچ گومان و دڕدۆنگییەك باوەڕی وایە کە ئەدەبیات ـ یان جۆرێکی تایبەتی ئەدەبیات ـ کانگای بەها و ژێدەری ئەو هەقیقەتە رووتەیە کە مشتومڕ هەڵناگرێ و پێویستی بە لێکدانەوە و روونکردنەوە نییە. {لای ئیلیۆت} «ئەزموون» و «نەریت» هیچکات بە وردی شیناکرێتەوە، گەرچی «وردبینی» بە رواڵەت تایبەتمەندی «ڕەخنەی پراکتیکی» ـ واتە ئەو چەشنە لە خوێندنەوەی وردبینانە و دەروونیی شوێنەواری ئەدەبی کە لە سالانی دەیەی ١٩٢٠ـ وە سەرنجی پێدرا- دەهاتە هەژمار.

ڕەخنەی پراکتیکی سەرەتا جۆرێك لە میتۆدی خوێندنەوەی دەق بوو کە باسەکەی لەسەر دەستی یەکێك لەپەیڕەوانی ئیلیۆت، بەناوی ئای. ئێی. ریچاردز، هاتە ئاراوە. ریچاردز لە رێگەی پێشنیار کردنی رەوشتێك بۆ خوێندنەوەی دەقەیلی ئەدەبییەوە هەوڵی ئەوەی دا رەخنەی ئەدەبی لەسەر بنەمایەکی عەقلانی یان زانستی دامەزرێنێ. سەرباری ئەمە، گرینگترین بابەتگەلێکی رەخنەگرانە کە ریچاردز لەو کتێبەیدا بەناوی رەخنەی پراکتیکی:

«تۆژینەوەیەك دەربارەی داوەریکردنی ئەدەبی»[16] (١٩٢٩) پەرەی پێدەدا، واتە «مانا» و «لەحن» و «هەست» و «مەبەست» بە تایبەتی لە ژێر تیشکی تیۆریی نوێی رەخنەگرانە و ئەدەبی زۆر نازانستیانە دێنە بەرچاو. ئێف. ئار. لیویس بە هەمان شێوە رەوشت و میتۆدێکی بۆ خوێندنەوەی دەقی ئەدەبی خستە بەردەست کە پێیان دەگوت «خوێندنەوەی ورد»[17] و بەرای ئەو یەکێك بوو لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی رەخنەی ئەدەبی. سەرەرای ئەمانە، گەر بێت و داوەری و ئاکامگیری ئیلیۆت و لیویس تاوتوێ بکەین، ئەو داوەری و ئاکامگیرییانە بە هیچ کلۆجێك وێناچی بەرهەمی لێکۆڵینەوەیەکی دەقیی ورد بن. لەوانەیە پێمان وابێ رەخنەگری پەیرەوی ئەم رەوشت و میتۆدانە، زۆر سەرنج دەداتە زمان و پێکهاتەکانی دەق، بەڵام داوەری و هەڵسەنگاندنەکانی ئیلیۆت و لیویس زۆرجار لەژێر کاریگەریی و کارتێکردنی ئەو بۆچوون و بەهایانەدا بوون کە لە دەرەوەی دەق دەژیان و کۆمەڵێك لایەنی زەمینەگەلی گشتی و دەروونیی ئەزموون و نەریت بوون. لیویس لە بەرهەمێکیدا بەناوی «ئاراستەی نوێ لە شیعری ئینگلیزیدا»[18] (١٩٣٢) لەکاتی هەڵسەنگاندنی «وێرانە خاك»دا پێی لەسەر ئەوە دادەگرت کە ئەم شیعرە پیشاندەری «زەینێکی تەواوەن وشیاری ئەم سەردەمەیە»، بەڵام خوێندنەوەی ئەو بە شێوەیەك دێتە بەرچاو کە لەسەر لەکیس چوون و لێكهەڵوەشانەوەی میراتێکی کولتووری و ئەدەبیی دێرین لە شیعردا، پێ دادەگرێت. لیویس لایەنە هاوچەرخانەکانی شیعر بە سووك چاو لێ دەکات و تا رادەیەکی زۆر وەپشت گوێیان دەخات. کاتێك لیویس باسی وشیاری تەواو سەبارەت بە زمان یان

16- . Practical Criticism: A study of Literary Judgment.
17- Close reading.
18- . New Bearings in English Poetry.



«بەرهەستێتیی ئەزموونی مرۆڤ»[19] دەکات، دەڵێی خوازەکانی ئەو هەوڵ دەدەن بۆ پتەوکردنی ئەو تێروانینە رەخنەگرانەیەی کە هەر لە بنەرەتەوە غەیرە ماددییەو ولەگەڵ دەق وەك زمان یان مێژوو هەڵسوکەوت ناکات.

ئیلیۆت و لیویس و ئەوانیتر کۆمەڵێك بەرهەمی ئەدەبییان کۆکردەوە کە وەك بەرهەمی «رەسەن» (canon) ناسراون و بریتییە لەو شوێنەوارە ئەدەبییەی کە لە سۆنگەی پێگەی بەرز و رەسەنیانەوە دەستەبژێر کراون و بنچینەی کولتووری ئەدەبی یان نەریت پێکدێنن. ئەم راستییە کە بە پێی کام پێودانگی دیاریکراو ئەم بەرهەمانە بە رەسەن لە قەڵەم دران، هیچکات روون نەبۆوە، بەڵام گومان لەوەدا نییە ئەم کۆمەڵە بەرهەمە لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە برپرەی پشتی تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەی ئەدەبیی ئینگلیزی بووە. سەبارەت بەوەی ئایا دەکرێ نووسەرانێکی دەسنیشانکراو لەم پێگەیەدا دابنێین، باسوخواسەیلێکی پرپێچوپەنا هاتوونەتە ئاراوە. لیویس سەرەتا لە کتێبی «نەریتی گەورە»[20] (١٩٤٨) دا دیکێنز بە نووسەرێك دەزانێ کە خاوەنی ئەو کامڵبوونە پێویستە بۆ مەزنایەتی و شکۆمەندی نییە، مەکین لە رۆمانی «رۆژگاری ئەستەم»[21] (١٨٥٤)دا کە دیکێنز لەویدا «زانایەکی تایبەت و داهێنەرانەمان پیشان دەدات کە ... مانایەکی یەکێتی بەخش و رێکوپێککەر، لەنێو سەرلەبەری بەرهەمەکەدا، دەپارێزێ.» بەڵام دواترەکەی پاشگەز بۆوە و دیکێنز ـ ی لە رێزەی داهێنەرانێکی هەڵکەوتەی بواری ئەدەبی، وەك جین ئاستین و جۆرج ئیلیۆت، دانا. روون و ئاشکرایە کە ئەم تاقمە لە نووسەران یان بەرهەمە هەڵبژاردەکان، لەسەر بنەمای کۆمەڵێك تایبەتمەندیی تا رادەیەك

19- The concrete of human experience.
20- The Great Tradition.
21- Hard Times.

نادیار دەستەچن دەکران کە پێوەندی بە سەردەمی تی. ئێس. ئیلیۆت و ماتیو ئارنۆلدـ وە هەبوو. هەروەتر کاتێك باسی گرینگایەتیی میلتۆن (Milton) یان شێلی (Shelley) بەردەوام بوو، بەشێکی زۆری شوێنەواری ئەدەبی لەبەرچاو نەدەگیرا. ئەدەبیاتی باوی خەڵکان پەسند بە هیچ کلۆجێك وەك ئەدەبیات لەقەڵەم نەدەدرا، و ئەوەی راستی بێت لە هەمبەر ئەدەبیاتی بەرز و بەشکۆ و بەها ئەخلاقییەکانی پێوەندیدار بەو ئەدەبیاتەوە بە هەرەشەیان دەزانی. لیویس ئەدەبیاتی باو و خەڵکان پەسندی بە جۆرە پیساییەکی کولتووری دەزانی و لە کتێبێکی گچکەیدا بەناوی «شارستانییەتی جڤاتی و کولتووری کەمینە»[22] کە ساڵی ١٩٣٠ بلاوی کردەوە، پشتی بەهای کولتووری بەرز و بەشکۆی گرت. تێڕوانینگەلێکی لەم دەستە، بەردی بناغەی کۆواری «ورد بوونەوە»[23] یان پێکهێنا کە لیویس ساڵی ١٩٣٢ دایمەزراند و تا کاتی داخرانی لە ساڵی ١٩٥٣ سەرنووسەری بوو. ئاکامی ئەم قسانەمان ئەوەیە کە ئەو بابەتە رەخنەگرانەیەی لیویس و بەرلەویش ماتیۆ ئارنۆلد هێنایانە گۆڕێ، بنامەیەکی تیۆریکی نییە. لە راستیدا، وەك چۆن لیویس لە وتارێکی بەناوی «ڕەخنەی ئەدەبی و فەلسەفە» لە کتێبی «بەدوادا چوونی گشتی»دا (١٩٥٢) بە راشکاوی رایگەیاند، رەخنە بە هیچ کلۆجێك ناتوانێ تیۆریك بێ. لیویس لەم وەتارەدا وای لێکدەداتەوە کە رەخنەی ئەدەبی هیچ خاڵێکی هاوبەشی لەگەڵ فەلسەفەدا نییە و دژی هەر چەشنە «سیستمێکی تیۆریك»ـە. پێناسەی ئەو لەسەر رەخنەگر و رەخنەی ئەدەبی هەڵگری ئەو وشانەیە کە پیشاندەری تێڕوانینی «ژیان/ ئەزموون»ـە سەبارەت بە ئەدەبیات:

22- Mass Civilization and Minority culture.
23- Scrutiny.



*مەبەستی من لە رەخنەگری شێعر، خوێنەری راستەقینەیە: رەخنەگری ئایدیال هەمان خوێنەری ئایدیالە. شێوەی خوێندنەوەی شێعر لەچاو شێوەی خوێندنەوەی فەلسەفە زۆر جیاوازە... وشەی شێعر، نەك بۆ «تێڕامان» و دادوەری کردن، بەڵکوو بۆ «هەست پێکردن» یان «بوون بەشتێك» (**become**) بانگهێشتنمان دەکەن... ئامانجی رەخنەگر ئەوەیە سەرەتا، بە وردەکاری تەواوەوە و سەر لەبەر، لەوشتانە بگات کە خوازیاری سەرنج پێدانی ئەون... جا ئەو کاتەی کە وا رەخنەگر لە ئەزموون کردنی بابەتی نوێدا شارەزا دەبێت، بە راشکاوی و بەنهێنی پرسیار دەکات: «سەرچاوەی ئەم بابەتە لە کوێوە هەڵدەقوڵێ؟ چۆن پێوەندییەکی لەگەڵ... دا هەیە؟ بەپێی رێژە وێدەچێ چەندە گرینگ بێ؟» ئەو رێکخراوەیەی[24] کە ئەم بابەتە، وەك پێکهێنەرێك تێیدا سەقامگیر بووە، رێکخراوەیەکە پێکهاتوو لەو بابەتانەی کە بەهەمان شێوە تێیدا «جێگر» بوون و پێگەی هەرکامیان لە پێوەندی لەگەڵ ئەوانی‌تردا بیچمی گرتووە، و سیستمێکی تیۆریك یان سیستمێك نییە کە تێڕوانینی سەڵت (وئەبستراکت) دابینی کردبێتن.*

لێرەدا دەکری بێژین کە لیویس بەنیازی داڕشتنی گەلاڵەی چەشنێك شێوازی رەخنەیە وەك ئەو شتەی کە ئێمە هەنووکە بە تێڕوانینی تیۆریك ناودێری دەکەین، گەرچی وێدەچێ خۆی دژی هەڵوێستێکی لەم دەستە بێت. لە لایەکی‌ترەوە شێوازی دەربڕین و لێکدانەوەی، بەو رادەیەی کە لێکدانەوەکەی دەخاتە بەردەست، گەلێ تەمومژاوی و ئەبستراکتە. خاڵی سەرنجڕاکێش ئەوەیە کە لێکدانەوەی تەمومژاوی و ئەبستراکتی تیۆری و فەلسەفە رێك هەر ئەو شتەیە کە لیویس رەخنەی لێدەگرێ. تیۆری داڕێژانێکی ئەدەبیی‌تری وەك تێڕی

24- organization.

ئیگلتۆن (Terry Eagleton) گومان لە تیۆروانینەکانی لیویس دەکەن و وای لێکدەدەنەوە کە ئەو پرۆسەی تاوتۆی کردنی دەقەیلی ئەدەبی دەسنیشان ناکات، و هەروەتر، ئەو جۆرە رەخنەیەی کە ئەو رەچاوی دەکات، لەوانەیەی سەر لە مرۆڤ بشێوێنیۆ، واتە لەبری راڤەکردن و تێگەیاندنی شێوازی دادوەری کردن و هەڵسەنگاندن و «جێگیر» کردنی دەقەیلی ئەدەبی لە نەزم و تەکووزییەکی دیاریکراودا، ئەم رەوشت و میتۆدانە سەرلەبەر تەمومژاوی و دەسنیشاننەکراون. هەربۆیە دواجار لە سۆنگەی شاردنەوە و رواڵەتسازیی دەلالەتە کولتووری و مێژووییەکان، ئەم چەشنە رەخنەیە «سروشتی» دەنوێندرێ. ئەو جۆرە «ئەزموون»ـەی کە لیویس لێرەدا باسی دەکات، وێدەچێ پێناسەنەکراو بێت و نامۆ لەگەڵ ئەزموونەیلی زۆربەی خوێنەران، باهەر نەڵێین پاژێك لە ئەزموونی ئەوان، و لەوانەیە بەرهەمی خوێندنەوەی کۆمەڵێك شوێنەواری ئەدەبیی دەستەبژێرکراو بێت، خوێندنەوەیەکی تێکەڵ بە حەساسییەتێکی تایبەت کە رێگامان پێدەدات لە روانگەی شهوودییەوە ئەم شوێنەوارە بناسینەوە و سەنگ و سووکیان بکەین. لیویس و رەخنەگرانی بەر لەو لە لایەکەوە لەسەر دەستی ئەم لێکدانەوەیەی کە «هەست» و «ژیان» و «ئەزموون» لە رەخنەی ئەدەبیدا خاوەنی گرینگایەتییەکی بنەڕەتین، وێدەچێ لەچاو هەندێ تیۆروانینی تیۆریك، ئەدەبیات لە خوێنەر نیزیکتر دەکەنەوە. لەم زمانە ئەزموونگەرایەدا شتێکی تەواو شایانی تێگەیشتن و بەپێی هەست و عەقڵی باو لە گۆڕێ دایە. سەرەڕای ئەمە، ئەم زمانە هەر ئەو پانتاییانەی کە دەیەوێ پێناسەیان بکاتن، تەمومژاوی دەکات: «هەست» و «ژیان» و «ئەزموون» بە شێوەیەکی زۆر گشتی و ئەبستراکت وەها بەکار براون کە پرسی تایبەتمەندی بوونی داهێنان و لەکار کردنی ئەدەبی وەپشت گوێ دەخەن و



سەلمێنەری ئەم بۆچوونەن کە میتۆد و رەوشتێکی خوێندنەوەی هەمیشەیی وتاقانە و جیهانشمول لە ئارادا هەیە کە هەموان دواجار پێی دەگەین یان لانیکەم ئاوڕێکی خێرای لێدەدەینەوە، میتۆدێك کە لەجێی خۆیدا نموونەی پانتاییەکی بەرفراوانی ئەدەبیاتی رەسەنە وەك نەریت (ترادسیۆن). ئەم چەشنە رەخنەیە دەبێتە هۆی ئەوەی خوێنەر تەنیا کۆمەڵێك بۆچوون و بەهای تایبەت بناسێتەوە و سەرنج بەوانیتر نەدات یان بە گرینگیان نەزانێ.

پرسی «ناسینەوە»ی ئەوشتانەی بە چاك و خراپ یان راست و هەڵەیان دەزانین، بابەتێکی گەلێ گرینگە کە لە بەشی چوار و بەناوی ئایدیالۆژی باسی دەکەین. بۆچوونی لیویس لەمەڕ «دەسنیشانکردنی پێگە»ی دەقیش لە بەشی پێنج و بەناوی پێوەندییە دەقییەکان، کە سەبارەت بە چۆنێتیی بیچم گرتن و کارکردی راڤە و مانایە، شەنوکەو دەکەین. لە پاشماوەی ئەم بەشەدا دەخوازم باسی هەندێ گریمانە و داب و دەستووری گرینگی ئەدەبیات و رەخنەی ئەدەبی بکەم و لە چۆنێتیی ئاراستە کردنی تیۆروانینەکانی تیۆری ئەدەبی دەربارەی ئەوان بکۆڵمەوە. لە هەندێ شوێن، بۆ وێنە لە چەمکی «داهێنەر»دا لەوانەیە ئەم تیۆروانینانە (ڕادیکاڵ و) بنەڕەتخواز و وروژێنەر بێنە بەرچاو، بەڵام گەر بێت و لە روانگە ئاساییەکانمان گومان بکەن، ئەمە ناچارەکی خاڵێکی نێگەتیڤ (و سەلبی) نییە، چونکی لە روونکردنەوەی هەڵوێستی ئێمە و ئەوکەسانەی وا لەتەکیان لەمەڕ ئەدەبیات باسوخواس و مشتومڕ دەکەین، بە کەڵکن. ساڵی ١٩٥٧، نۆرتراپ فرای[25] لە کتێبێکدا بەناوی ئاناتۆمیی رەخنە[26]، کە هەوڵێك بوو بۆ پێناسەکردنی سریشت و ئەرك و کارکردی رەخنەی

25- Northrop Frye.
26- Anatomy Of Criticism.

PDF 4 KURD

ئەدەبی، لە نەبوونی تیۆرییەکی سیستماتیکی ئەدەبیات گلەیی کرد. ئەو لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە بە بێ ئەم تیۆرییە، هیچ جۆرە دەقێك لە ئارادا نابێ کە خاوەن پرەنسیپگەلێکی بنەڕەتی بێت. فرای دەیگوت، رەخنە ئایینێکی پیرۆزی بێ پرەنسیپە. گەرچی نامەوێ بڵێم تیۆریی ئەدەبی هەر ئەو ئەسڵ و پرەنسیپانەن کە بە باوەڕی فرای رەخنە خاوەنیان نییە ـ و ئەو تیۆری داڕێژانەی قسەیەکی واشیان کردبێت ژمارەیان کەمە ـ بەڵام لە ساتەوەختی هەنووکەدا کۆڵێك راو بۆچوون لە گەڕ دان کە یارمەتیدەری شیکردنەوە و شرۆڤەکردنی ئەدەبیات و رەخنەی ئەدەبین. رەنگە یەکێك لەو خاڵانەی رەخنەی ئەدەبی بە گوێماندا دەداتەوە ئەمەیە کە ئەو ئەسڵ و پرەنسیپانە خۆیان دەقەیلێکی راڤە هەڵگرن: ناسین و هەقیقەت لە روانگەی مێژووییەوە رێژەیین. ئەدەبیات و رەخنەی ئەدەبی جاروبار روویان لە پەسندکردنی ئەم بابەتە وەرگێڕاوە، رەنگە بە هۆی ئەوەی پەسندکردنی ئەم بابەتە لەگەڵ بەرژەوەندی ئەوان یەك نەگرێتەوە.

## داهێنان و بەکارهێنانی ئەدەبی

دەخوازم لە پاشماوەی ئەم بەشەدا باسی دوو چەمکی «داهێنان»[٢٧] و «بەکارهێنان»[٢٨] بکەم. ئەم دوو زاراوەیە سەرەتا ئەم راستییە دەسەلمێنن کە ئەدەبیات لە دەرەوەی زەماندا بوونی نییە یان لە نێو جۆرە بۆشاییەکی دژە مێژوویيدا ناژی، بەڵکە لە ژێر کاریگەرێتیی دوو زەمینە دایە: زەمینەی یەکەم ئەو زەمینەیەیە کە تێیدا ئەدەبیات دەنووسرێ و دادەهێندرێ یان دەخولقێندرێ، ئەوی دیکە ئەو زەمینەیەیە کە تێیدا ئەدەبیات دەوەشێندرێ و

27- production.
28- consumption.



دەخوێندرێتەوە و بەکار دەهێندرێ. لەوانەیە وا وێبچێ جیاوازی نێوان ئەم دوو زەمینەیە ئاشکرابێت، بەڵام خاڵە جیاکەرەوەکانی نێوان ئەم دوو بەستێنە زۆرجار تێکەڵ و پێکەڵ دەبن و خەوش هەڵدەگرن. بە چەشنێك کە کاتێك شێعرێك یان رۆمانێك دەخوێندرێتەوە یان راڤە دەکرێ، لەوانەیە ئەم کێشەیە بێتە گۆڕێ کە ئایا ئێمە ئەو مانایانە لەو شێعر یان رۆمانەدا دەدۆزینەوە کە تایبەت بەو کۆمەڵە لە پێوەندیی خوێندنەون کە زەمینەی خوێندنەوەی ئەو بەرهەمە پێکدێنن، یان ئەوەیکە ئەو مانایانە دەدۆزینەوە کە هەر لەسەرەتاوە هەبوون و بە نەگۆڕی دەمێننەوە. کاتێك بەو راستییە بزانین کە ماناکانی دەقێکی ئەدەبی شان بە شانی تێپەڕینی زەمان دەگۆڕدرێن، ئەم جیاوازییە پڕپێچوپەناتر دەبێ، هەربۆیە دەکرێ وای لێکبدەینەوە کە بۆچوونی خوێنەری دەیەی ١٩٨٠ لە سەر "هەملێت" تەواو جیاوازە لە بۆچوونی خوێنەری سەرەتای سەدەی حەڤدە. پێویستە ئەوە بزانین کە تێڕوانینی ئێمە سەبارەت بە ماناگەلی شیمانەییی هەر دەقێکی ئەدەبی لە رابردوودا، خۆی جۆرێك بۆچوون یان سەرلەنوێ سازکردنەوەیەکی ماناییە، و باوەڕهێنان بە بیرۆکەی دەسنیشانکردنی جۆرە مانایەکی «سەرەتایی» (original) گەلێ گرفت هێن و پرسیار ورووژێنە.

باسکردن لە جیاوازیی نێوان داهێنان و بەکارهێنانی ئەدەبی بۆ تێڕامان لە بۆچوونگەلی بگۆڕی سەبارەت بە خوێندنەوە و خەریکبوون بە ئەدەبیاتەوە، لە رەخنە و تیۆریی ئەدەبیدا بەکەڵکە. ئەم جیاوازییە بۆی هەیە بە شێوەیەکی سادەکراو و لەسەر دەستی ئەم خشتەیە نیشان بدرێ:



ئەم خشتەیە پیشاندەری ئەم تێڕوانینە باوە سەبارەت بە ئەدەبیاتە کە داهێنەر[29] کۆمەڵێك بەرهەم دەخولقێنن کە دواتر خوێنەر دەیخوێننەوە. بە پێی ئەم تێڕوانینە، وا گریمان دەکرێ کە ئاراستەی پرۆسەی داهێنان و گوازتنەوەی ئەدەبیات لە داهێنەرەوەیە بەرەو خوێنەر، کەواتە هرز یان واتاگەلی بە دەستەوە دراو سەرەتا لە مێشکی داهێنەردا دەگوورێ و چەکەرە دەکا و پاشان لە ڕێگای شێعر و رۆمان و شانۆنامەوە بۆ نێو مێشکی خوێنەر دەگوازرێتەوە. خوێنەر دواتر دەتوانێ هەر لە سەر ئەم ئاراستەیە بگەڕێتەوە دواوە تا پەی بە مەبەستی داهێنەر ببات و ئەزموونی داهێنەر سەرلەنوێ تەجرەبە بکاتەوە. خاڵی دەسپێك و سەرەکیی باوی ئەم مۆدێلەی خوێندنەوە، داهێنەرە کە کانگا و سەرچاوەی ئەو واتایانەیە کە لە قەوارەی مەبەست و ئەزموونیدا دەخرێنە پاڵ بەرهەمێکی ئەدەبییەوە.

ئەم خشتەیە هەروەتر بە شێوەیەکی ساکار بۆی هەیە ئەو گۆڕانکارییە گرینگانەمان نیشان بدات کە لەم پەنجا ساڵەی دواییدا لە گۆڕەپانی تێڕوانینگەلی رەخنەگرانەدا بەدی هاتووە و لەم بەینەشدا شوێنی لە گۆڕانکارییەکانی تیۆریی ئەدەبی و رەخنەگرانە وەرگرتووە. زۆرتر رەخنەی پێش دەیەی ١٩٥٠ و هەڵبەت گەلێ دوای ئەویش بۆی هەیە بە قۆناغی «داهێنەر تەوەر»[30] ناودێر بکرێ: بە واتای ئەوەی بە درێژایی ئەو هێڵانەی کە لە خشتەی سەرەوەدا کێشراون، داهێنەر دەبێتە ناوەندی سەرنج پێدان. پاشان تاقمێك لە رەخنەگرانی دەیەی ١٩٤٠ و ١٩٥٠ گومانیان لە راست و دروستیی ئەم گریمانەیە کرد و وایان لێکداوە کە هەر لە بنەڕەتەوە دەشێ سەرنج بدرێتە بەرهەم یان دەقی ئەدەبی نەك داهێنەر. بە باوەڕی وان، رەخنەگر پتر سەرنج

29- author.
30- author _ centred.



دەداتە زمان و فۆرمی دەقی خوێنراو، نەك داهێنەرەکەی کە ئەو دەقە بەرهەم دێنێ. لە راستیدا گەشە و نەشەی حاسڵ لەم تێڕوانینە دەربڕێ ئەم راستییەیە کە ئەوە داهێنەر نییە مانا بەدی دێنێ، بەڵکوو مانا بەرهەمی زمانی دەقە. لەم دواییانە کۆمەڵێك تیۆری داڕێژ پانتاییەکی تایبەتیان لە تیۆریی ئەدەبیدا هێناوەتە ئاراوە کە زۆرجار بە «تیۆریی خوێنەر ـ تەوەر» یان «تیۆریی وەرگرتن» ناودێر دەکرێ. ئەم تیۆریداڕێژانە پێداگرییان لەسەر داهێنەر یان دەق نییە، بەڵکوو ئەو شتەی وەك بابەتی سەرەکیی خوێندنەوە و پرۆسەی رەخنەگرانە سەرنجی پێدەدەن، خوێنەرە.

## داهێنەر و دەسەڵاتەکەی

لە ئاخر و ئۆخری سەدەی نۆزدەهەمەوە، واتە لەو کاتەوەی کە رەخنەی ئەدەبی و لقی ئەدەبیاتی ئینگلیزی وەك دوو بواری زانست هاتنە ئەژمار، چەمکی داهێنەر لەم دوو بوارەدا گرینگایەتییەکی فرە بنەڕەتی پێدراوە. جاروبار رەخنە و ژیاننامە بە کردەوە لێك جیا نەدەکرانەوە، بە شێوەیەك کە ئەوەندەی زیاترتان سەبارەت بە ژیانی داهێنەرێك بزانیبایە، ئەوەندەش چاکتر لە بەرهەمەکانی دەگەیشتن. ئەدەبیاتیان لەو کەسەی بەرهەمی دێنا جیا نەدەکردەوە. تێڕوانینگەلی بەردەستی سەبارەت بە شێکسپیر پیشاندەری ئەم راستییەن. ئێی. سی. برادلی[31]، ساڵی ١٩٠٤ لە گوتاربێژییەکیدا بەناوی «کەسایەتی شێکسپیر» هەوڵی دا لە ڕێگای شیکردنەوەی شانۆنامەکانییەوە توانایی و سریشتی شێکسپیر وێنا بکات. گەرچی برادلی دانی بەم راستییەدا دەنا کە «زانیاریی ئێمە سەبارەت بە ژیانی شێکسپیر زۆر کەمە» بەڵام ئەم شتە

31- A.C.Bradley.

نەبووە بەردی سەر ڕێگەی گریمان سازیی ئەو لەمەڕ لایەن و توێژە دەروونییەکانی هەست و نەستی شێکسپیر و هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لە «کەسایەتی و تێڕوانینی ئەو کەسە بۆ ژیان کە بە بڕوای ئێمە باشتر لە هەموو کەس لە سریشتی هاوبەشی مرۆڤ تێگەیشتووە.» سی و پێنج ساڵ دواتر لە کتێبی «ژیان و هونەری شێکسپیر»[32] (١٩٣٩) نووسراوەی پیتر ئەلیکساندردا تێڕوانینێکی هاوشێوە دەبینین: ئەلیکساندر شانۆنامەکانی شێکسپیر لە چوارچێوەیەکی ژیاننامەییدا دەگونجێنێ کە بنەمای باسی ڕەخنەگرانەی ئەو پێکدێنێ و بە شیکردنەوەیەك لەسەر چۆنێتیی بارهاتن و خوێندنی شێکسپیر دەسپێدەکات.

دواتر ئێف. ئار. لیویس لە بۆچوونێکیدا سەبارەت بە سویفت (Swift)، جیاوازیی نێوان ژیاننامە و ڕەخنەی ئەدەبی قبووڵ دەکات، بەڵام لە هەمان کاتدا لە درێژەی باسەکەیدا ئەم دوو بابەتە وەك دوو بابەتی پێوەندیدار بە یەکتری لە قەڵەم دەدات:

*دەخوازم سەبارەت بە شوێنەواری سویفت باسوخواس بکەم، واتە دەمەوێ ماهییەت و سریشتی شوێنەواری وی تاوتوێ بکەم. ئەم شوێنەوارە (بەو شێوەیەی کە ڕاڤەی بەردەستمان نیشاندەرێتی) جۆرێك هەڵکەوتوون کە تاوتوێ کردنیان بێلادانی بابەتەکە بەرەو کەسایەتیی سویفت بە تایبەتی ئەستەمە ... لە هەوڵدانمدا بۆ دەربڕینی ئەو شتەی ئەم شوێنەوارەی تا ئەم ڕادەیە شایانی سەرنج پێدان کردووە، ئاماژە کردن بۆ ئەو کەسەی کە ئەم شوێنەوارەی نووسیوە بە دڵنیاییەوە پێویستە...*

لە ئاخر و ئۆخری دەیەی ١٩٤٠ و سەرەتای ١٩٥٠ کۆمەڵێك باسوخواس لەمەڕ پێوەندیی نێوان داهێنەر و بەرهەم، بە تایبەت لەمەڕ پرسی

32- Shakespear's Life and Art.



"مەبەستمەندیی"[33] داهێنەر، لە ئارادا بوو، بەڵام لە دەیەی ١٩٦٠ بەدوا کۆمەڵێك گۆڕانکاریی بنەڕەتیتر ڕوویان داوە کە بۆچوونە نەریتییەکانیان سەبارەت بە داهێنەر وەك بەدیهێنەر یان خوڵقێنەری بەرهەمی ئەدەبی خستۆتە ژێر چەقۆی گومانەوە. ئەم گۆڕانکارییە تیۆریکانە گومان لە دەسەڵاتی نووسەر لەمەڕ دەق دەکەن. وتارەکەی ڕۆلان بارت بەناوی «مەرگی داهێنەر» کە ساڵی ١٩٦٨ بڵاو بۆوە، باشترین نموونەیە بۆ ئەم باسە. لەم وتارەدا لە «سەفسەتە و هەڵەکاری سەبارەت بە ژیانی نووسەر» ڕەخنە گیراوە:

*ئیماژی ئەدەبیات لە کولتووری ئاسایی و باودا، بە شێوەیەکی پاوانخوازانە لەسەر نووسەر و کەسایەتی و ژیان و هەوگری و خواستەکانی چەقی بەستووە و هێشتاش بەشی زۆرینەی ڕەخنە، گوتنی ئەم قسەیەیە کە شوێنەواری بودلێر پیشاندەری نوشوستیی شەخسی بودلێرە، تابلۆکانی وان گۆگ، نیشانەی شێتیی ئەون، و مۆسیقای چایکۆفسکی دەربڕی گەندەڵیی ئەخلاقیی ئەو کابرایەن. بۆ شیکردنەوەی بەرهەم هەمیشە لە ژیانی ئەو پیاو یان ژنەدا دەگەڕێن کە ئەو بەرهەمەی خوڵقاندووە، وەك بڵێی هەموو کات لە تەمیسلی کەم وزۆر ڕوون و ئاشکرای چیرۆکدا، دواجار دەنگی کەسێك، واتە نووسەر نهێنییەکەیان پێ دەڵێ.»*

بارت وای لێکدەداتەوە کە «ئەوە زمانە دەدوێت نەك نووسەر» و بۆ تێگەیشتن لە واتا جۆراوجۆرەکانی دەقی ئەدەبی، دەشێ تێڕوانینی نووسەر تەوەر وەلابنێین. ئەوکاتەی دەق بڵاو دەبێتەوە هێڵی پێوەندی و وابەستە بوونی نێوان نووسەر و دەق دەپچڕێ و دەق دەبێتە بوونێکی خۆبژیو و سەربەخۆ. هەروەتر بارت باسی کۆمەڵێك کێشە سەبارەت بە تاکەکەسێتیی نووسەر لە پرۆسەی نقیساندا دەکات کە لە بەشەکانی دواتر لێیان دەکۆڵینەوە. ئەو لەسەر

33- intentionality.

دەستی ئەم لێکدانەوەیە کە مانا «فرەکـانی» پێکهـێنی دەق، لەسـەر خوێنـەر لەنگەر دەگرن، نەك نووسەر، بەم ئاکام و ئەنجامە دەگات کە: «یەکێتیی دەق لە ئامانج و ئەنجامی دەقدا رەگ دادەکوتـێ نـەك لـە سەرچـاوە و سـەرەتایدا.» و پێویستە ئوستوورەی نووسەر توورِ هەڵدەیین: «لە دایکبوونی خوێنەر دەبـێ بـە قیمەتی مەرگی نووسەر تەواو بێ.» ناشێ ئـەوە لـەبیر بکـەین کـە وتارەکـەی بارت، خۆی دەقێکە کە لە قۆناغێکی مێژوویی تایبەتدا نووسراوە و هەڵبـەت ساڵی ١٩٦٨ ئەو سەروبەندە بوو کە لەمەڕ دەسەڵاتی مسۆگەربووی نێـو بنکـە کولتووری و فێرکارییەکانی گەلێ دەنگ هەڵبڕابوو. لـە بەسـتێنێکی مێـژوویی وادا، وەلانان و توورهەڵدانی نووسەر گرینگایەتی و دەلالەتێکی تایبەتی هەیە، وەك چۆن ئەو تێڕوانینانـەی پێـشووش کـە نووسـەریان بـە ژێـدەری سـەرەکیی داهێنانی ئەدەبی دەزانی گرینگایەتی و جێدەستی خۆیان هـەبوو. ئـەو خاڵـەی بارت سەبارەت بە دەسەڵاتی نووسەر مەبەستێتی دەکرێ لە رێگای نموونەیـەکی باسی پێشووەوە شی بکەینەوە: زۆر یەك لەو رەخنەگر و تیۆری دارێژانـەی کـە ئاگامەندانە خۆ لە باسی هەڵوێست یان تێڕوانینی نووسەر لەمەڕ دەقی ئـەدەبی دەبوێرن، لە ژێر رۆناهی ئەم بیرۆکانەدا رێگا بە خۆیان دەدەن کە بیر و بۆچوونی رەخنەگرانێکی ئەدەبی یان تیۆری دارێژانێکی وەك ئێف. ئار. لیویس یان رۆلان بـارت وەك بـیر و بۆچـوونی نووسـەرێك تـاوتوێ بکـەن و هـەڵی سـەنگێنن. (سەبارەت بە «دەق» بۆ هەرچەشنێکی نڤیسان ـ ئەدەبی یان غـەیرە ئـەدەبی ـ چاو لە بەشی ٥ بکەن، پێوەندیی دەقی) خۆ بواردن لە دابە باوەکانی گوتارێکی تایبەت کارێکی گەلێك ئەستەمە و هەڵبـەت خـەڵك هێـشتاش کاتێـك باسـی ئەدەبیات دەکەن، ئاماژە بە نووسەر دەکەن و سەرنجی پێ دەدەن. خاڵی گرینگ ئەمەیـە کـە تەنانـەت گـەر نـەتوانین ـ یـان نـەخوازین ـ زاراوەی «نووسـەر»



وەلابنێین، دەشێ ئەو کاتەی باسی نووسەر دەکەین لـە دەلالـەتی ئـەم زاراوەیـە ئاگادار بین.

میـشل فۆکـۆ (Michel Foucault) لـە وتارێکیـدا بـەناوی «نووسـەر چییە؟» (١٩٧٩) تێڕوانینێکی مێـژوویيتری رەچـاو کـردووە. لـە باسوخواسـی ئەودا، کەسایەتیی نووسەر دەبەسترێتەوە بە سەرهەڵدانی ئەو شتە لە کولتووری رۆژاوادا کە فۆکۆ پێی دەڵێ «تاکەکەسێتی سازی»[34]، کە بریتییـە لـە پێگـەی گرینگ و سەنترالی کۆمەڵێك کەس و تاکی نـاودار لـە چـۆنێتیی پێکهێنـان و ریزبەنـدی کردنـی شـێوە و «فۆرمـەکانی مەعریفـە[35]». نووسـەر لـە رێگـای بڵاوکردنەوەی بەرهەمی جۆراوجۆرەوە لـە کۆمـەڵگادا شـوناس و شـکۆیان پـێ دەبەخشێ، نووسەر پێوەری ناسین، یان فۆکۆ گوتەنی «یەکەیـەکی یەکپارچـە و بنەمایی» دەخاتە بەردەست. فۆکۆ شێوەکانی بـەکارهێنانی نـاوی نووسـەر بـۆ زاڵبوون بەسـەر بڵاورکردنـەوەی شـوێنەواری ئەدەبیـدا نـاو دەنـێ «نووسـەر ـ کارکرد» و پێی وایە ئەم کارە لە راستیدا رێگایەکـە بـۆ بەرتەسـك کردنـەوەی شێوازەکانی خوێندنەوە و ماناکانی هەناوی دەق. فۆکـۆ وای لێکدەداتـەوە کـە پێش سەدەی حەڤدە و هەژدە، نووسەر لە نێو شـوێنەواری ئەدەبیـدا بـە هێنـد نەدەگیرا، ئەو سەروبەندەی کە بۆ سەلماندنی، دروستی یان دەسەڵاتی بەرهـەمی ئەدەبی، پێویستی بە مۆری رەزایەتی کەسـی نووسـەر نـەدەکرد و شـوێنەواری ئـەدەبی بـێئـەوەی نـاوی داهێنەرەکـەی لەسـەر بـێ پەسـند دەکـرا. لەگـەڵ سەرهەڵدانی کۆمەڵگای بورژوایی و پێداگرتنی دنیای نوێ لەسـەر خـاوەنێتی و یاساکانی مالیکییەت، و هاوکات لەگەڵ پەرە ئەستاندنی مەعریفـەی زانـستی

34- Individualization.
35- Forms of Knowledge.

وەك ڕێگایەك بۆ شرۆڤەی جیهان، دەقەیلی ئەدەبی وەك دەسکەوت و پێناسەکەری تاکەکەس‌خوازی گرینگایەتیی پتریان وەدەست هێنا و پانتاییەکی تەواو جیاوازیان داگیرکرد.

به پێی تێڕوانینی فۆکۆ، «نووسەر ـ کارکرد» مەبەستێکی ئایدیالۆژیکی لەپشتە، واتە نووسەران پتر وەك سەرچاوەی چێشکەی داهێنەرانە و بلیمەتی و وزەی خەیاڵکردنەوە لە قەڵەم دراون، کەچی بە پێچەوانەوە دەجوولێنەوە. پۆلێن کردنی شوێنەواری ئەدەبی لەسەر بنەمای نووسەران دواجار دەبێتە لەمپەرێك لەسەر ڕێگای وەشاندن و وەگەڕخستنی سەربەخۆیانەی مەعریفە، چونکی ئەو شوێنەوارە پێشەکی لە نێو چوارچێوەی سیستمێکی ناسین و بەهای تایبەتدا «جێ دەگرن» کە دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی ئەو هزر و داب و دەستووره باوانەی کە دەربارەی نووسەر بوون و ژیاننامەن. ئەو شتەی لای لیویس پرسی دادوەری و ئەزموون و شهوودە لە ناسین یان «دیاریکردنی پێگە»ی بەرهەمێکی ئەدەبی، به رای فۆکۆ دەبێتە پرۆسەیەکی لەوەپێش دەسنیشانکراو و ئایدیالۆژیك کە کارکردەکەی بەردەوامیی ناسین و دوا بە دوای ئەو بەردەوامیی دەسەڵاتە لە هەندێ پاژی تایبەتی کۆمەڵگادا. کەواتە «نووسەرـ کارکرد» ستراتیژییەکی سنووردراوە کە ئەدەبیات و خوێنەر دەخاتە نێو بەستێنی پێوەندییەوە. ئەدەبیات بۆچوونی سەربەخۆی خوێنەر لەمەڕ دەق بە ڕەوا نازانێ، لە حاڵێکدا کاتێك باسی «خەیاڵی نووسەر» دێتە گۆڕێ، ئەگەری بۆچوونێکی لەم دەستە گریمان دەکرێ. دوایین خاڵێك کە فۆکۆ ئاماژەی پێدەکا ئەمەیە کە داب و قەراردادی نووسەر پێش دەقی ئەدەبی ناکەوێ، بەڵکە پەیڕەوی لێ دەکات. ئەم باوەڕەی فۆکۆ ڕێك بە پێچەوانەی ئەو بۆچوونە باوەی ئێمەیە سەبارەت بە یەکێك لەلایەنەکانی پرۆسەی داهێنانی ئەدەبی. مەبەستی فۆکۆ ئەوەیە کە



تێڕوانینی ئێمە بۆ «شێکسپیر» یان «وردزورس» (Words worth) دوابەدوای وەشاندنی شوێنەواری ئەم نووسەرانە سەرهەڵدەدات و بەشێك لە پرۆسەی ڕێکوپێك کردن و سەلماندنی شوێنەواری ئەدەبی لە کولتووری ئێمەدا لە ڕێگای وێنا کردنی سیمای نووسەر لە پێوەندی دەگەڵ بەرهەمەکانیدا بەڕێوە دەچێت. لە سەدەی نۆزدەدا ئامادەکردنی ژیاننامەی تێرو تەسەلی نووسەرانێکی وەك دەڵێن هەڵکەوتە، بۆ وێنە بەرهەمی ئەدیبانی ئینگلیسی[36] و قامووسی ژیاننامەیی نەتەوەیی[37]، هەرتکیان لەسەر دەستی "لێسلی ستێفن"، نموونەگەلێکی باشن کە شان بە شانی لقی «ئەدەبیاتی ئینگلیسی» و گوتاری ڕەخنەی ئەدەبی سەریان هەڵدا و هاتنە ئاراوە.

لەوانەیە مشتومڕ و باسوخواسەکانی بارت و فۆکۆ زێدەڕەوانە بێنە بەرچاو و بۆ پەسندکردن نەشێن، دیارە منیش بەنیاز نیم ئەمانە بە شیکردنەوەیەکی سەلمێندراو و گومان هەڵنەگر سەبارەت بە ئەرکی نووسەر لە قەڵەم بدەم. وەك چۆن بارت و فۆکۆ خۆیان ڕوونی دەکەنەوە، نووسەر بەستێنێك بۆ باسوخواسان پێکدێنێ و لە گۆشەنیگای مێژووییەوە کۆمەڵێك دەلالەتی جۆراوجۆر خراوەتە پاڵ ئەم چەمکە. ئەم بابەتە دەشێ سەبارەت بە لێکدانەوە و شیکردنەوەکانی خۆشیشیان ڕاست بێت. هەر چۆنێك بێت، بیر و بۆچوونی بارت و فۆکۆ هزروروژێنن و وامان لێ دەکەن لە هەمبەر ئەوشتانەی کە سەبارەت بە ئەدەبیات وەك «هەقیقەتی» ئاشکرا هاتوونەتە ئەژمار گومانمان هەبێت. ئەوان لە وتارەکانیدا دەیانەوێ لە ڕێگای تیۆری دارشتن و گومان کردن لە چەمکی

36- The English Men of letters.
37- Dictionary of National Biography.

«نووسەر» چیتر ئەم چەمکە وەك بابەتێکی سەلمێندراو «سروشتی» چاوی لیٚنەکریٚ.

لە بەشی پێنجەمدا بەناوی «پێوەندییە دەقییەکان» ئاوڕێك لە باسی ڕێگاکانی تێگەیشتن لە چەمکی نووسەر دەدەینەوە.

## مەبەست و مانا[38]

وێڕای ئەم تێڕوانینە نەریتییە کە دەڵیٚ نووسەر لە خوڵقاندنی بەرهەمی ئەدەبیدا باڵادەستە، مەبەستی نووسەر لە ڕاڤە و تەفسیری خوێنەر لە هەمبەر دەق، گەلیٚ جار زۆر گرینگ لە قەڵەم دەدریٚ. پرسی مەبەست دەکریٚ بە یەکێك لەو بابەتانە بێتە ئەژمار کە لە تیۆریی ئەدەبی یان ڕەخنەگرانەدا (لانیکەم لە کۆڕە ئەدەبییەکانی ئەمریکا و بریتانیا) ئەم گریمان و ئەگەرانەیان تووشی کێشە کردووە.

ئەو کاتەی کە ئای. ئێی. ریچاردز لە پێناوی ڕێکخستنی {پرۆسەی خوێندنەوەی شێعر، لە کتێبی "ڕەخنەی پراکتیکی"دا بابەتە ڕەخنەکارییەکانی خۆی ڕێکوپێك دەکرد، گەرچی وێدەچوو سەرنجی خوێنەر پتر دەشیٚ لەسەر دەق لەنگەر بگریٚ، بەڵام دواجار تێڕوانینی ریچاردز لەسەر مەبەستی نووسەر پێی دادەگرت. ناسین یان دەسنیشان کردنی مەبەستی نووسەر، و ئەم ڕاستییە کە لە ڕێگەی دۆزینەوەی ئەم مەبەستە دەکریٚ بەرهەمی ئەدەبی ڕاڤە بکریٚ و لێك بدرێتەوە، پرسێکی گەلیٚ گرفتسازی لیٚهاتووە. ئەوەی ڕاستی بێت زۆربەی نووسەران باسی مەبەستی خۆیان ناکەن، هەندیٚ نووسەری هاوچەرخی وەك سامۆئێل بێکێت یان هارۆلد پینتر لە گفتگۆکانیاندا بە ئەنقەست خۆ لە قەرەی باسوخواسی سەبارەت بە

38- Intention and meaning.



بەرهەمەکانیان نادەن و وێدەچیٚ لەم ڕێگایەوە، لەدوای بڵاوبوونەوەی بەرهەمەکانیان، هەر چەشنە بەرپرسایەتییەکی بەرهەمەکانی خۆیان لەکۆڵ خۆیان دەکەنەوە. تەنانەت ئەو کاتەی نووسەرێك بە ڕواڵەت مەبەستی خۆی لەمەڕ بەرهەمەکەی بە ڕاشکاوی دەردەبڕیٚ، هێشتاش خوێندنەوە یان دەسنیشان کردنی قەتعیی پێگەی بەرهەمێك لە حاند نووسەرەکەی، ئەرکێکی ئەستەمە. مەبەستی نووسەر لە چ قۆناغێکدا دەشیٚ باسی لیٚ بکریٚ: پێش نووسینی بەرهەم، لەکاتی نووسیندا، دوای تەواو بوونی پرۆسەی نووسین؟ دیارە مەبەستی دابلیو. ئێچ. ئادن (W.H.Auden) دوای هۆنینەوەی شێعرێکی بەناوی ئیسپانیا (دەور و بەری ساڵی ١٩٣٧) گۆڕا، چونکی دواجار ئەم شێعرەی لە کۆمەڵە بەرهەمەکانی دەرهاویشت. لەسەردەمی پاش ـ فرۆیدیدا کە گرینگایەتی و تەنانەت دەوری کاریگەر و دەسنیشانکەری لایەنی ناخودئاگای زەینمان سەلمێندراوە ـ بەتایبەت سەبارەت بە لایەنی خەیاڵگەرا یان خەیاڵکردی هزرـ چۆن چۆنی دەکریٚ دڵنیا بین کە مەبەستی دەربڕاوی نووسەر، هەر هەمان مەبەستی ڕاستەقینەی ئەوە؟ تەنانەت گەر بکریٚ مەبەستی نووسەر یان پێوانەکانی دەسنیشان کردنی ئەو مەبەستە دیاری بکەین، ئەو مەبەستە یان ئەو پێوانانە تا چ ڕادە و ڕێژەیەك جێی متمانە و پشت پیٚبەستن؟ دەکریٚ «مەبەستی نووسەر» بە بابەتێك لە قەڵەم بدەین کە پرۆسەی ڕەخنەگرانە لە دیاریکردنی دوایین پلە و پێگە یان سەرەتا و سەرچاوەی بەرهەمێکدا سادە و ساکار دەکاتەوە. ئەم تێڕوانینە جەوهەرگەرایانەیە پێیوایە دواجار مانایەکی ڕێك و ڕاست و شاراوە لە ئارادایە کە لە ئاکامدا هەموان بۆیان هەیە پەی پیٚببەن و تێی بگەن. ئەم شێوە گونجاوە ڕێکو پێك کردنی مەعریفە ئاسان

دەکاتەوە و هەر وەتر ڕێگایەکە بۆ دەستەبەر کردنی ئەو ڕاستییە کە هەندێ بۆچوون ـ و لەویش گرینگتر ـ شێوازی تێگەیشتنیان بەردەوام بن.

لە ئاخر و ئۆخری دەیەی ١٩٤٠ و سەرەتاکانی ١٩٥٠، لە ئەمریکا، قوتابخانەیەکی ڕەخنەی ئەدەبی هاتە ئاراوە کە بە «ڕەخنەی نوێ» ناوی دەرکرد و لە کەسانێك پێکهاتبوو کە خۆیان بە «ڕەخنەگرانی نوێ» دەزانی. ئەم ڕەخنەگرانە تێڕوانینێکی فۆرمالیستی (یان شێوەخوازانە) ـ یان بۆ ئەدەبیات هەبوو کە هەندێ جار پێکهاتەخوازانەشیان[39] پێ دەگوتن، بەڵام نابێ ئەم قوتابخانەیە لەگەڵ ئەو بزاڤە بە یەك بزانین کە دواتر لە دەیەی ١٩٦٠ پتر لە فەرەنسە سەری هەڵدا و بە پێکهاتەخوازی ناوی زڕا، گەرچی تێڕوانینیان بوار و بەستێنی هاوبەشیان هەیە. هەر وەك لە دەستەواژەی «فۆرمالیسم» دەردەکەوێ، ئەم تێڕوانینە چەشنە ڕوانگەیەکی ڕەخنەگرانەیە کە باسی بەرهەمی ئەدەبی و شکڵ و شێوەی دەکات نە شەخسی هونەرمەند، واتە پتر مانا و مەبەستی بەرهەم لە هەناوی دەقدا دەبینێ، نەك لە زەینی نووسەر. «ئەزموون» ئەو شتە نییە کە نووسەر سەرەتا هەیبووە و پاشان لەڕێی زمانەوە بۆ نێو زەینی خوێنەری گوازتبێتەوە، بەڵکوو ئەو ئەزموونە لە نێو خودی بەرهەمی هونەری دایە. لە پێناوی گۆڕینی سەرنجمان لە نووسەرەوە بۆ دەق، پرەنسیپ و ئەسڵی سەرەکیی ئەم ڕوانگە ڕەخنەگرانەیە، چەمکێك بوو بەناوی «هەڵەکاریی مەبەست»[40]. بە پێی ئەم ئەسڵە، مەبەستی نووسەر (بە حسێبی ئەم گریمانەیە کە مەبەست شتێکی قابیلی سەلماندن بێت) وا نییە حەتمەن ڕێنوێنی مانای بەرهەم بێت.» هەڵەکاریی مەبەست» سەردێڕی وتاری دوو

39- structuralist.

40- intentional fallacy (سەفسەتە سەبارەت بە مەبەستی نووسەر).



ڕەخنەگری نوێیە کە لەسەر ئەم بابەتە باسوخواس و مشتومڕیان کردووە. یەکێك لە یارمەتیدەرترین پێناسەکانی ئەم چەمکە لە کتێبی "تیۆریی ئەدەبیات" (١٩٤٩) دا هەیە کە «ڕێنێ وێلێك[41]» و «ئاستن وارێن[42]» نووسیویانە:

***سەرلەبەری ئەم بیرۆکەیە کە «مەبەستی» نووسەر بابەتی گونجاوی مێژووی ئەدەبییە، بە تەواوی نادروستە. سەر و مڕی مانای بەرهەمێکی هونەری لەسەر دەستی مەبەست ڕوون نابێتەوە، یان تەنانەت هاوسەنگی ئەو نییە. مانا سیستمێکی پێکهاتوو لە بەهاکانە (values) کە ژیانێکی خۆ بژیو ڕەچاو دەکات.***

ئەم تێڕوانینە بە وەلانانی نووسەر و مەبەستی وی، شتێکیتر لە ناوەندی سەرنجی خوێنەردا سەقامگیر دەکات، ئەویش بەرهەم یان دەقە، نەك نووسەر یان داهێنەر. ئەم گۆڕانکارییە گەلێ گرینگ بوو، لەم ڕووەوە کە بۆچوونی «مانا لە هەناوی بەرهەم دایە، نەك لە نێو زەینی نووسەر» ڕێگەی بۆ ڕۆلان بارت خۆش کرد تا گەڵاڵەی بیرۆکەی «مەرگی نووسەر» دابڕێژێ. ئەم تێڕوانینە تێکڕووخێنەری باوەڕ و بیرۆکەی «هەڵەی هیومانیستی» بوو کە تێری ئیگلتۆن بەم شێوەیە شیدەکاتەوە:

***بە پێی ئەم ڕوانگەیە، تایبەتمەندیی دیاری ئەدەبیات ـ واتە ئەم ڕاستییە کە دەقی ئەدەبی دێتە نڤیسان ـ هەموو کات وەك شتێکی نەخوازراو چاوی لێ دەکرێ: چاپ، بەو بوونە سارد و سڕە غەیرە مرۆڤانەیەی، هەیکەلی ناقۆڵای خۆی دەخاتە نێوان ئێمە و نووسەرەوە. بریا بمانتوانیبا ڕاستەوخۆ لەگەڵ سێروانتس بدوابایبن! تێڕوانینێکی لەمجۆرە ئەدەبیات لە حاڵەتی «مادە بوون»***

41- Rene Wellek.
42- Austin Warren.

PDF 4 KURD

***دەشواتەوە و هەوڵ دەدات کە لە خەستوخۆڵیی مادی بوونی ئەدەبیات وەك زمان کەم بکاتەوە و بۆ روبەڕوو بوونەوەیەکی دۆستانە و رۆحیی مرۆڤەکان کورتی کاتەوە. سەرلەبەری ئەوشتانەی ئەگەری گۆڕانی راستەوخۆیان بۆ ئاستی پێوەندیی نێوان مرۆڤەکان نەبێ، هەر لە فیمینیسمەوە بیگرە تا دەگاتە بەرهەمی کارخانە، هاوئاراستەی شك و گومانی هیومانیستی لیبراڵە. ئەم تێڕوانینە دواجار دەقی ئەدەبی هەر لە بنەڕەتەوە وەك دەق لە بەر چاو ناگرێ.***

ئەم گۆڕانە دەکرێ وەك جۆرە شۆڕشێکی رەخنەگرانەی کۆپرنیکی لە قەڵەم بدرێ، کە تێیدا مانا بە دەوری بازنەی دەقدا دەگەڕێ، نەك نووسەر. سەرەڕای ئەمە، ئەم مۆدێلە رەخنەگرانەیەش هەر وەتر هەندێ گرفتی هەیە و وەك دواتر دەبینین، دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی کۆمەڵێك گۆڕانکاریی‌تر لە مەیدانی تیۆریی ئەدەبیدا.

لێرەدا گرفتێك لە گۆڕێدا بوو، ئەویش ئەمە بوو کە پێداگرییەکی پتر لە پێویست لە سەر خودی بەرهەم یان دەق دەکرا: یەکێتی ئۆرگانێکی ئەزموون، لە خەیاڵی نووسەرەوە گۆڕا بۆ جوانی ناسیی فۆرمی ئەدەبی و هێشتاش ئەم بیرۆکەیە لە ئارا دا بوو کە واتا و مانایەکی جەوهەری هەیە کە دەشێ لە دەق هەڵێنجرێ. دەق بیچمی گرت و بوو بە بابەتێکی بەرهەست، بوو بە ئەنجام و ئامانج لە بری ئەوەی تەنیا پەنجێرەیەکی رووناك بێ بەرەو {جیهانی} نووسەر. ناو و سەردێڕی ئەو کتێبە رەخنەییانەی رەچاو کەری ئەو تێڕوانینە رەخنەگرانەیەن، پیشاندەری ئەم راستییەن: "نیشانەی کەلامی"[43] (١٩٥٤)، "گۆزەی جوان سازکراو"[44] (١٩٤٧)، یان "لە ئەزموونەوە بۆ نێو وشەکان"[45]

43- The Verbal Icon.
44- The well-wrought.
45- Experience into words.



(١٩٦٣)، ئەم کتێبانە دەربڕی ئەم بیرو بوچوونەن کە وشە هێشتا لە چاو ئەزموون یان مانای حەشار دراو لە شێعردا، لە پلەی دوو دان، بە وتەیەکی تر، زمان و مانا هێشتاش دوو قەڵەمڕەوی جیا لە یەك لە قەڵەم دەدرێن. ئەم ناو و نیشانانە هەر وەتر ئەوەمان پێ دەڵێن کە نووسەر، هێشتاش بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لە پشت ئەم هەرێم و قەڵەمڕەوانە دایە، ووەك دەڵێن بە لاڕێدا دێتەوە. ئەم مۆدێلە رەخنەگرانە فۆرمالیستییە پێشاندەری ئەمەیە کە مانا، گەر رێك و راستەوخۆ نەڵێین مەبەستی نووسەر، لە هەناوی بەرهەمدایە و هەر بەرهەمێکیش بۆی هەیە بە شێوەیەکی نەشیاو و نادروست بخوێندرێتەوە. چەمك و مانای «نادروست خوێندنەوە» خۆی گەلێ گرفتهێن و پرسیاروروژێنە: بە پێی کام پێوانە دەکرێ بڵێین خوێندنەوەیەك «دروست» یان قەتعی و قسە هەڵنەگرە؟ «رەخنەگرانی نوێ» بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، باسی «هەڵە کاری» و (سەفسەتە)یەکی‌تریان هێنایە ئاراوە کە هەڵوێستی ئەوانی لە سەرەکەی تری تەوەرەی نووسەر ـ دەق ـ خوێنەر دا جێگر دەکرد، و دەبووە بەردی سەر رێگای راڤەی ئازاد و کراوە و سنوور نەناس. ئەم باسە بە «هەڵەکاری سەبارەت بە کاریگەرێتیی دەق[46]» ناوی زڕا و لە سەر دەستی ئەم زاراوەیە ئەم باسە هاتە گۆڕێ کە دژ کردەوەی زەینی و بۆچوون خوازانە لە هەمبەر شێعرێك بەس و پڕ بە پێست نین و گەلێ جار ئەم دژ کردەوانە لە راستیدا دەبنە هۆی لە رێگا لادانی مانای رێکخراوی چێندراو لە پێکهاتەی دەقی ئەدەبیدا. کە واتە زەمینەی مانا خودی دەقەکەیە. ئەم مۆدێلە رەخنەگرانەیە بە دوو هۆ هێرشی کراوەتە سەر: یەکەم وێدەچێ ئەم مۆدێلە

46- affective fallacy.

ئەوەمان پێ بڵێ کە مانا سنووری ئەزموون دەبەزێنێ و ترانسیدێنتال[٤٧] و جیهانشموله، ئەمەش تێڕوانینێکی دژە مێژووییە سەبارەت بە ئەدەبیات کە هەلومەرجی تایبەتی داهێنان و بە کار هێنانی دەقی ئەدەبی لەبەر چاو ناگێرێ. لەم تێڕوانینە دا، لە سۆنگەی سەرنجدان بە لایەنە فۆرمییەکان، لە راستیدا دەق لە روانگەیەکی جوانی ناسانەوە جەختی لەسەر دەکرێ و بە دەگمەن هەڵدەکەوێ تێڕوانینگەلی زمانناسانە لە گۆشە نیگای مێژووییەوە بە تەواوەتی دیاری و دەسنیشان بکرێ، چونکی زۆربەی ماناو چەمکەکانی ئەوان پێوەندی بە هەرمان بوونی هەقیقەت و جوانییەوە هەیە. دووهەم ئەوەیکە چەمکی رێکخستن، بۆ وزەیەکی رێکخەر دەلالەت دەکات. چ کەسێك یان چ شتێك دەوری رێکخەر دەگێڕێ؟ دەقی ئەدەبی دیارە لە بۆشاییەکی غەیرە شەخسییەوە سەر هەڵنادا. ئەم بابەتە بۆ «ڕەخنەگرانی نوێ» گرفتێکی تیۆریکی هێنایە سەر رییان. گەر بێت و حاشا لە {نییەت و} مەبەستی نووسەر بکەین و تەنیا پێ لە سەر دەق دابگرین، ئەو کات ئەم پرسیارە دێتە گۆڕێ کەوایە دژ کردەوە و هەڵوێستی خوێنەر لە هەمبەر دەق بە پێی کام هۆکارە؟ ئەم گرفتە لە سەر دەستی کۆمەڵێك بیرۆکەی وەك «پێوەندیگەلی کۆمەڵایەتی»ی دەق چارەسەر کرا. لە سەر بنەمای ئەم بیرۆکانە خوێنەر بۆی هەیە لەو شتەی کە مەبەستی نووسەرە بگات، تەنانەت گەر بێت و مەبەستی نووسەر ئاشکرا یان پڕبەپێست و گونجاو نەبێت، کەواتە ئەو شتەی گرینگە شێوەی تێگەیشتنی بەرهەمی ئەدەبییە لە سەروبەندی بە ئاکام گەیاندنی بەرهەمەکە لەسەر دەستی ئەو خوێنەرەی کە بە دوای سەرە داوی خوێندنەوە دایە. ئەم دیدە بۆ ئەدەبیات دیدێکی ئایدیال و ئارمانجخوازانەیە، و پیشاندەری

47- Transcendent (ئەوشتانەی ئەزموون هەڵنەگر و باڵاتر لە توانایی جیهانی فیزیکن).



ئەمەیە کە دەکرێ دەستمان بە دەقێکی ئایدیال ـو شان بە شانی ئەو بە مانایەکی ئایدیالـ را بگات. تێڕوانینێکی لەم دەستە ئەم راستییە لە بیر دەکات کە مانای شوێنەواری هونەری، بە تایبەتی لە زەمینەی مێژوویی جیاواز دا، بە شێوەی جۆراوجۆر دەگۆڕدرێ. وێدەچێ «ڕەخنەگرانی نوێ» عەودالی مۆدێلێکی رەخنەیی بوون کە بە تیرێك دوو نیشان بپێکێ، هەم بتوانن نووسەر ـیان لانیکەم مەبەستی نووسەرـ وەك ژێدەری دسنیشان کردنی مانا لە تێڕوانینی رەخنەگرانەیان بسڕنەوە، هەمیش بەم شێوەیە مانای سەرەکیی حەشاردراو لە هەناوی دەق، وەك کاکڵی هەقیقەت، بە بابەتی تۆژینەوەی رەخنەگرانەی ئەو شوێنەوارە لە قەڵەم بدەن.

## بەرهەم و دەق

تاکوو ئێستا بە دەرکەوتە دیارەکانی ئەدەبیاتمان گوتووە «بەرهەم» یان «دەق»، وەك ئەوەی بڵێی ئەم دوو وشەیە هاومانا و هاو واتان. گەرچی وێدەچێ ئەم دوو واژەیە ئاماژە بە بابەتێکی یەکسان دەکەن، بەڵام کۆمەڵێك دەلالەتی تا رادەیەك جیاوازیان وەدەست هێناوە و دەربڕ و پێشاندەری جیاوازییەکانی نێوان تێڕوانینە پتر نەریتییە باوەکان و ئەو تێڕوانینە بۆ ئەدەبیاتن کە کەریگەرێتیی تیۆریی ئەدەبییان لە سەرە. زاراوەی «دەق» (text) دیارە بەر لە سەرهەڵدانی تیۆریی ئەدەبی بۆ باسکردن لە شێعر و شانۆنامە و رۆمان بە کار براوە، زۆرتر بۆ راکێشانی سەرنجی خوێنەر بۆ لایەنی زمان ناسانەی ئەدەبیات، کە بۆی هەیە لە کاتی تۆژینەوە لە مەڕ پرسی پێوەندیدار بە ئەزموون یان مەبەست وە پشت گوێ بخرێت. لە لایەکی دیکەوە «بەرهەم» پتر بە لای پێوەندیی نێوان دەسکرد یان حاسڵی هونەری و هونەرمەند یان نووسەر دا

دەشکێتەوە و هەروەتر ئاماژە بۆ ئەو شتە دەکات کە شارەزایانە ساز کراون و تەواو بوون. هەر ئائەم جیاوازییانە بوونە هۆی ئەوەی کە ڕۆلان بارت و تیۆری داڕێژانی دیکە لە ڕێگای پێداگرتن لەسەر بەکارهێنانی زاراوەی دەق هەڵۆیستێکی بە ڕاشکاوی پێناسەکراو لە هەمبەر دەسکردە ئەدەبییەکان بگرن و مانایەکی دیار و تایبەتی پێ ببەخشن. بارت لە دوو وتاریدا «مەرگی داهێنەر»، کە پێشتر لە سەری دووایین، و «لە بەرهەمەوە بۆ دەق (١٩٧١) ئەم هەڵۆیستەی خۆی ڕوون دەکاتەوە. بە ڕای بارت «بەرهەم» دەسکردێکی هونەرییە کە نووسەر دەسەڵاتێکی تەواوی چاوەدێری کردنی بە سەردا هەیە و سەلمێنەری مۆدێلی نەریتیی مەبەستمەندیی نووسەر و تێڕوانینی نووسەر ـتەوەر بۆ پرسی ڕاڤەیە. زاراوەی «بەرهەم» هەروەها پیشاندەری ئەو بۆچوونانەیە کە نووسەر بە کەسێکی هەڵاوێردەی هەڵکەوتەی تاقانە و سەرچاوەی خەیاڵ و خوڵقاندن دەزانێ کە نووسراوەیەکی هەتا بڵێی بەرز و ڕەسەن دادەهێنێ. بارت پێوایە، ئەم بیر و بۆچوونانە لە دیدێکی فرە ڕۆمانتیکاوی و لاف و گەزاف لێدەرانەوە بۆ پرسی داهێنانی ئەدەبی هەڵدەقوڵێ. تێڕوانینی ئەو بۆ دەق و «دەقێتی» (textuality)، تەواو لەم دیدە جیا دەبێتەوە.

"دەقێتی" کۆمەڵێك دەلالەتی پڕ پێچو پەنای هەیە و دواتر تێر و تەسەلتر تاوتوێی دەکەین، بەڵام هەنووکە پێویستە باسی ئەو چەمکە سەرەکییانە بکەین کە بارت و تیۆری داڕێژانیتر سەبارەت بە «دەق» هێناویانەتە ئاراوە کە باسێکە و ڕووبەڕووی چەمکی «بەرهەم» دەبێتەوە. یەکەم ئەوەیکە وەك هەندێ باسوخواسی پێشتر پێیان وابوو، نووسەر وەکو بەرهەمهێنەری سەرەکیی دەق چاوی لێ ناکرێ و پێویست ناکات لەگەڵ خوڵقێنەر دەق بە یەك کەسیان بزانین. هەر وەك بارت دەڵێ: «نووسەر وەك دەڵێن دەبێتە نووسەرێکی بێ دەسەڵات:



ژیانی وی نابێتە سەرچاوەی داستانەکانی، بەڵکو ئەوە داستانێکە و لە بەرهەمەکانیدا دەستی تێدایە... ئەو «من»ەش کە دەق دەنووسێتەوە هەرگیز شتێکی پتر لە «من»ێکی بێ دەسەڵات نییە.» بارت ئەم تێڕوانینە باوەی کە نووسەر بە چاوەدێریکەر و بەرهەمهێنەری زمانی دەق دەزانێ بەراوەژوو دەکاتەوە، بە باوەڕی ئەو نووسەر خۆیشی بەرهەمێکی دەقییە: «ئەوە زمانە کە قسان دەکات، نەك نووسەر.» بە وتەیەکی تر، بیرۆکەی نووسەر دەبێتە یەکێك لە گێڕانەوەکانی نێوان دەیان گێڕانەوە کە دواجار دەق پێکدێنن. ئەم بابەتە دەمان گەیەنێتە بەردەم خاڵی دووهەم، واتە ئەو خاڵەی کە دەڵێ، دەقەیلی ئەدەبی کۆمەڵێك تۆڕی (networks) مانایین کە لە گوتاری جۆراوجۆر و فرە چەشن پێکهاتوون، واتە دەقەیلی ئەدەبی خاوەن پێکهاتەی فرە توێژن. ئەم فرە توێژییە ناشێ بۆ یەك مانای تاقانە و دیاریکراو و نەگۆڕ کورت یان پوخت بکرێتەوە. خوێندنەوەیەکی تایبەت لەوانەیە تەنیا لایەنێکی دەق لەخۆ بگرێ و هەر ئەو لایەنە بە مانای سەرەکیی دەق لە قەڵەم بدات، بەڵام بە باوەڕی بارت بنەڕەتترین تایبەتمەندی هەر دەقێك، سریشتی «فرە لایەنێتی» ئەو دەقەیە: دەق خەسڵەتی «کورت نەبوونەوە»ی هەیە و هەڵگری خوێندنەوەی پەیتا پەیتا و ڕاڤەی سەر لە نوێیە. بیرۆکەی هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی دوا مانای «هەملێت» یان «چامەیەك بۆ بولبول» نەك هەر لە خۆڕایی و بێهوودەیە، بەڵکوو مانا جۆراوجۆرەکانی نێو ئەم دەقانەش فەرامۆش دەکات. سەیر لەوەدایە ڕەخنەی پێشووش هەر قامك دەخاتە سەر ئەم خاڵە: کاری ئەو ڕەخنەگرانەی کە بە سەرکەوتووییەوە ڕای دەگەیەنن دوا مانا و ڕاڤەی قسە هەڵنەگری شانۆنامە، شێعر یان ڕۆمانێکیان دۆزیوەتەوە دیارە سەر ناگرێ و نوشوستی دێنێ.

PDF 4 KURD

سێهەم ئەوەیکە بارت، زمان ـیان بە گوتەی تیۆری دارێژانی زمان، «نیشانە»ـ وەك بەرهەمهێنەری مانا چاوی لێ دەکا. ئەوە زمانە، نەك ئەزموون، کە مانا دەخولقێنێ. توانایی دەق بۆ بەدیهێنانی ماناگەلی جۆراوجۆر و هەمە چەشن، لە ڕێگەی وەرسووڕانی زمانناسانەی دەقەوە دەستەبەر دەکرێ کە لە هەناوی زەمینە و بەستێنی خوێندنەوە، واتە مێژوو و کەسی خوێنەر دا بوونی هەیە. قەناعەت هێنان بەو بۆچوونەی کە پێی وایە دەق هەڵگری تاقە مانایەکی تایبەتە، جا ئەو مانایە چ لە زەینی نووسەرەوە هەڵقوڵابێت، چ لە سۆنگەی هارمۆنیزاسیۆن و ڕێکوپێکی جوانی ناسانەی نموونەیی دەقەوە سەری هەڵدابێت، دەبێتە بەردی سەر ڕێگای خوێندنەوە گریمانەییەکانی تر، بە جۆرێك کە تەنیا هەندێ ڕاڤە و ڕوانینی تایبەت و بە ڕاست و ڕەوا دەزانێ.

بە باوەڕی بارت و هەندێ تیۆری دارێژی دیکە، خوێندنەوە و ڕاڤەکاری دوو کردەوەی گەلێ باس ورووژێن و ڕێژەیین، نەك دوو پرۆسە بن بۆ نیشاندانی هاودەنگی و پێکەوە گونجانیان. لێرەوە بوو کە چوار چێوەی ڕەخنەیەکی ئەدەبیی تەندروست و باڵادەستترین چەشنی چێژی خوێندنەوە لە سەر بنەمای بە ڕاست و ڕەوا زانینی تێڕوانینە جۆراوجۆرەکانی خوێندنەوە و کایەی نیشانە لە هەناوی دەقدا، دارێژرا. زاراوەی کایە پیشاندەری ئەو بیرۆکەیەیە کە زمان سریشتێکی دەسەڵاتدارانەی نەگۆڕ و تاقانەی نییە، بەڵکو هەڵگر و داگری ماناگەلێکی جۆراوجۆرە، کە ئەو مانایانە دەگەڕێن و دەگۆڕێن. بارت لە گوتەیەکی گرینگیدا، سەرنجی ڕەخنەگری ئەدەبی لە بەرهەمەوە بۆ دەق و هەروەتر، وەك چۆن پێشتر ئاماژەمان پێکرد، بۆ خوێنەر پەلکێش دەکا:

***سەر لە بەری بوونی نڤیسان بەم شێوەیە دەبووژێتەوە: دەق لە چەندان نڤیسان پێکهاتووە کە لە کولتوورەیکەلی جۆراوجۆرەوە بە پێوەندیگەلی دوو***



***لایەنەی لە چەشنی گفتگۆ و لاسایی کردنەوەی گاڵتەجارانە و دەمەتەقە دەگات، بەڵام ئەم فرە لایەنێتییە لە یەك خاڵدا کۆ دەبێتەوە، و ئەویش بە پێچەوانەی ئەوەی جاران دەیان گوت خوێنەرە نەك نووسەر.***

دواجار بارت و تیۆری دارێژانی دیکە، بە تایبەت لەو تیۆرییانەی پێوەندیان بە تۆژینەوەی کولتوورییەوە هەیە، «دەق» بە بەرفراوانترین واتای وشە بە کار دێنن. بە گوتەیەکی تر، مەبەستیان لە «دەق» تەنیا کولتووری ئەدەبیی بەرز و باڵادەست، یان «شوێنەوار»ی باوی ئەدەبیاتی «ئینگلیزی» نییە، بەڵکو فیلم و ڕێکلام و شێوەکاری و دیارە ئەدەبیاتی ڕەشۆکی پەسندیش دەگرێتەوە. ئەم تێڕوانینە سەبارەت بە تایبەتمەندییەکانی بەرهەم یان دەق، لە تەك بۆچوونگەلی نەریتی و پشت ئەستوور بە چەمکەیلی ڕەسمی جیاوازی هەیە و هەروەها دەق دەخاتە پانتاییەکی فراوانترەوە کە لەو سۆنگەیەوە دەکرێ هەندێ پرسیار سەبارەت بە ئەگەری جەوهەری بوونی جیاوازیی نێوان دەقەیلی وەك دەڵێن باڵادەست و دەقەیلی ڕەشۆکی پەسند بێتە ئاراوە، و هەر وەتر لە هۆکارەکانی مێژوویی و کولتووریی خۆیابوون و سەرهەڵدانی ئەم پۆلێن کردن و زنجیرە پێگانە[48] بکۆڵدرێتەوە. لە گۆشە نیگای ڕەخنە و تیۆرییەوە، ئەو تێڕوانینانەی لە زمان ناسی و تیۆریی زمان و تۆژینەوەی کولتووری و پانتاییە پێوەندیدارەکانی ترەوە وەرگیراون، ڕوانگەگەلێکی جیاوازیان سەبارەت بە ئەدەبیات هێناوەتە ئاراوە و ئەگەری شێوازی خوێندنەوەی تازەیان لە بری ئەو شتەی بۆی هەیە بە دیدی «هزری مەزن و شوێنەواری مەزن» ناودێر بکرێ خستۆتە بەردەست.

48- hierarchies.

## خوێنەر

وەك لە بەشی پێشوودا بینیمان، بە گوێرەی مۆدێلی بارت سەبارەت بە داهێنانی ئەدەبی، دەور و جێگە و پێگەیەکی نوێ بە خوێنەر دەبەخشرێ. لەوانەیە هۆیەکی ئەو راستییەی کە سەرنجێکی ئەوتۆ بە خوێنەر و کردەی خوێندنەوە نەدەدرا ئەمە بوو کە زۆر جار خوێنەران لە سەر تەوەرەی نووسەر ـ دەقـ خوێنەر کەمترین بایخیان پێ دەدرا: دەوری خوێنەر بە بابەتێکی ئاشکرا و بێ گرێوگۆڵ دەزانرا و هەر بۆیە پێویستییەك لە ئارادا نەبوو تا لێی بکۆڵدرێتەوە و شەنوکەو بکرێ. بە پێچەوانەی ئەو سەرنجەی کە بە نووسەران و شوێنەوار یان دەقەیلیان دەدرا، خوێنەران وەرگرانی خەسیوی مانا لە قەڵەم دەدران و دەوری ئەوان بە دەورێکی سروشتی و پەسندکراو دەهاتە ئەژمار، بە چەشنێك کە هەست بە پێویستیی تاوتوێکردنی گیر و گرفتەکانی خوێندنەوە نەدەکرا. رەخنەی نووسەر تەوەر، وەك پێشتر ئاماژەمان پێ کرد، نووسەر بە کانگا و ئامانجی ئەدەبیات و راڤەی ئەدەبیات دەزانیٚ.

ڕەخنەی بەرهەم/دەق تەوەر ـ وەك «ڕەخنەی نوێ» لە دەیەکانی ١٩٤٠ و ١٩٥٠ـ بە لەقەڵەمدانی «خودی شیعر» بە ژێدەری مانا و دوا وێستگەی رەخنە، بە هەمان رێژە خوێنەری خستە پەراوێزەوە و لە بازنەی سەرنج پێدان وەدەری نا. گەرچی پێویستە ئەم خاڵە بە وتەکانمان زیاد بکەین کە هەندێ دەقی ئەدەبی (لەوانەشە هەندێ نووسەر) خوێنەران بە خەسیو و یەکسان نازانن: رۆمانی تریسترام شەندی[49] (١٧٦٠) بەرهەمی لارێنس ستێرن[50]، ئەرکێکی

49- Tristarm shandy.

50- Laurence sterne (1713-1768) ڕۆماننووسی ئینگلیزی



ئەوەندە قورس دەخاتە ئەستۆی خوێنەر کە رێگای پێ نادا بە خەسیوی بمێنێتەوە.

ئەو رەخنە ئەدەبییە سەرەتاییەی کە هاوکات لەگەڵ سەرهەڵدانی لقی سەربەخۆی «ئەدەبیاتی ئینگلیسی» هاتە ئاراوە، بەم شێوەیە دەسەڵاتی خۆی لە مەیدانەکەدا مسۆگەر کرد کە دوا جار سەرلەبەری خوێنەرانی بە یەکسان لە قەڵەم دەدا، یان پێی وابوو کە بە جۆرێك رێك دەکەون و هاوڕا دەبن. ئەم راستییە کە خوێنەران بە پێی رەگەزێکی وەك چینی کۆمەڵایەتی، جنسیەت، مێژوو، نیژاد و کولتوور، گەلێ جیاوازن، وێدەچێ تا ئەم ساڵانەی دوایی لە رەخنەی ئەدەبیدا گرینگایەتییەکی ئەوتۆی پێ نەدرابێت. پێناسەی ئێف. ئار. لیویس بۆ خوێنەری ئایدیال و (دڵخواز)، وەك هەمیشە تەمومژاوی و نادیارە: «من رەخنەگری شێعر بە خوێنەرێکی کارامە و کامڵ دەزانم: رەخنەگری ئایدیال، خوێنەرێکی ئایدیالە.» ئەم پێناسەیە زیاترین رادەیەکە کە ئەو دەتوانێ، یان دەخوازێ، لێی بچێتە پێش. لەوانەیە مەبەستی لیویس کەسێکی «تەواو ئاگادار»ە بە هەموو مانا گونجاوەکانی هەناوی دەقێك. ئەم تێڕوانینە دەربڕی ناتوانایی زۆرینەی خوێنەران و پێداویستیی هاودەنگی و هاوڕاییەکی بە رواڵەت ئاگادارانەیە، نەك پەسند کردنی کۆمەڵێك خوێندنەوەی جۆراوجۆر کە بە یەك ئاست و ئەندازە جێی باوەڕ بن.

گرینگیی پتر پێدان بە خوێنەر لە تیۆریگەلی ئەدەبی و رەخنەگرانەدا، سەرنجی رەخنە و راڤەی لە تێڕوانینەیلی نووسەر و دەقتەوەر بەرەو ئەدەبیات راکێشاوە و بۆتە هۆی ئەوەی هەڵوێستی زیاتر لە هەمبەر دەق بگیرێت و هەروەها سەرنجی پتر بە پرۆسەگەلی پڕپێچوپەنای خوێندنەوە و راڤە بدرێت. بە مانایەکی تر، ئەم گۆڕانکارییە دەکرێ بە جۆرە دوورکەوتنەوەیەکی

PDF 4 KURD

ئایدیالۆژیکی لە نووسەر و دەقتەوەری، و نیزیك بوونەوە لە خوێنەرتەوەری بێتە ئەژمار. لە لایەکی دیکەوە، ئەم گۆڕانکارییە ئەدەبیات بە بەرهەمێکی مێژوویی لە قەڵەم دەدات کە پەیڕەوی زەمینەی بەکارهێنانە، و ئەوە دەسەلمێنێ کە دەقەیل بە پێی ئەو هەلومەرج و بارودۆخەی کە تێیدا دەخوێندرێنەوە، دەگۆڕدرێن. ئەو بیر و بۆچوونانەی پێوەندییان بە رەخنەی نووسەر تەوەر یان دەقتەوەرە هەیە و تەنیا یەك خوێندنەوەی تاقانە و یەکسان و «دروست»یان بە راست و رەوا دەزانی، چیتر جێی باوەڕ و متمانە نین. تیۆریی خوێنەرتەوەر[٥١]، و تیۆریی وەرگرتن[٥٢] کە پێوەندی بەم پانتاییەوە هەیە، لە تێڕوانینی دەروونشیکارانە و فێمینیستیشدا خاوەنی گرینگایەتین. لەوانەیە لێرەدا باسکردنی ئەم بابەتە بەکەڵك بێ کە تیۆری بە هیچ کلۆجێك ئەدەبیات لە خوێنەری تاك یان دەستە جۆراوجۆرەکانی خوێنەران جیا ناکاتەوە، بەڵکوو لە راستیدا دەق و «ئەزموون»ی خوێندنەوە بە شێوەگەلێك دادەڕێژێتەوە کە هەنووکە دەکرێ بە راشکاوی باسیان لێ بکرێ و هەڵسەنگێندرێن: ئەم جۆرە تێڕوانینانە رێگامان پێ دەدەن لە چۆنێتیی سەرهەڵدانی مانا و راڤە جۆراوجۆرەکان تێبگەین و دەتوانن لە رەواندنەوەی ترسی ئەو تێڕوانینە پاوانخواز و مەترسیهێنەرانەی کە لەوانەیە لە وانەگوتنەوە و فێرکاریی ئەدەبیاتدا بێنە ئاراوە، باش و بەکەڵك بن. تیۆری کەسەرەیەکی بەهێز و بەکارە کە بۆی هەیە رێگای توانایی یان زەمینەی سەرنەکەوتنی خوێنەر خۆش بکات.

---

51- Reader-theory.
52- Reception theory.

ئەم بەشەی کتێبەکەمان دوو بەستێنی سەرەکیی پێوەندیدار بە سەرهەڵدانی تیۆریی ئەدەبی و رەخنەگرانەی سەدەی بیستەم لە ئەورووپا و کاریگەرێتیی ئەوان لەسەر رەخنەی ئەدەبیی دواتری ئینگلستان تاوتوێ و شەنوکەو دەکات. وێدەچێ سەرەتا ئەم دوو بەستێنە بۆ تاوتوێ کردنی ئەدەبیات، وەك دوو شێوەی نائاسایی یان ناپێوەندیدار بێنە بەرچاو. بە دڵنیایییەوە دەڵێین ئەم بەستێنانە لەگەڵ ئەو شتەی پێی دەگوترێ «بۆچوونی باو» سەبارەت بە زمان و ئەدەبیات جیاوازن. خاڵی دەسپێکی ئەم تێڕوانینانە پێوەندییەکی ئەوتۆی بە کەسایەتی و ئەزموونەوە نییە،بەڵکوو لە هەوێنی گوتاری ئەدەبییەوە بەرهەم دێن، واتە، ئەو شتانەی وەسف دەکرێن یان دەنوێندرێن گرینگ نین، بەڵکوو چۆنێتیی پێکهاتن و نواندنیان شایانی سەرنج پێدانە. هەروەتر، ئەم تێڕوانینانە لەگەڵ ئەو رەخنەیەی ماتیۆ ئارنۆڵد و ئێف.ئار.لیویس و پەیڕەوانی وان مەبەستیانە گەلێ جیاوازی هەیە. زاراوەناسی[1] و هەڵوێستی تیۆریکی ئەم تێڕوانینانە لەوانەیە زانستیتر لەوە بێ کە بشێ پێوەندییان بە هەست و سۆز و باری عاتیفییەوە هەبێت: ئەمە رێك هەر ئەو شتەیە کە لیویس دژایەتی دەکرد و لەگەڵ ئەو روانگانەی کە گەلێ جار لە کۆڕ و کۆبوونەوەگەلی رەخنەی پراکتیك یان لە باسکردن و تێفکرین لەمەڕ رۆمان بە واتای هاوسەنگی «ژیانی راستەقینە»، دەهاتنە ئاراوە جیاوازی هەیە. بە مانایەکی تر، ئەم بیرۆکە نوێیانە دەکرێ وەك تێڕوانینگەلێکی زانستی لە قەڵەم بدرێن کە هەڵوێستی خۆیان لێرەوە دەسپێدەکەن کە دەڵێن، ئەدەبیات بابەتێکی شایانی ناسین و پێناسە هەڵگرە و پێوەندی بە کاریگەرێتیی عاتیفی و هەستەوەرییەوە نییە. زمان بە

1- Terminology.



بەرفراوانترین و تایبەتیترین مانای خۆی، ماکی سەرەکیی ئەدەبیاتە و هەر لەم سۆنگەیەوە کاتێك باسی گوتاری ئەدەبی دەکەین دەشێ قامك لەسەر ئەو تایبەتمەندییانە دابنێین کە «ئەدەبییەت»ی زمان دیاری دەکەن. گێڕانەوە شێوەیەکە بۆ پێداچوونەوە بە رێکخستن و پێکهاتەمەند کردنی زمان لە کۆمەڵێك یەکەی گەورەتردا، و گەرچی لەوانەیە بۆ تاوتوێ کردنی هەموو چەشنەکانی شێعر گرینگ نەبێت، بەڵام بۆ تۆژینەوە لەمەڕ ئەدەبیاتی داستانی و دەقی شانۆیی شێوازێکی هەتا بڵێی باش و بەکەڵکە. هەروەتر نابێ ئەم خاڵە لەیاد بکەین کە رەخنە و تیۆری، لانی کەم ئەو کاتەی لە روانگەیەکی مێژووییەوە لێیان دەڕوانین، هەر کامیان جۆری زمان و شێوەی گێڕانەوەی تایبەت بەخۆیان هەیە.

### ١- زمان:

زۆربەی یەکەمین رەخنەگرانی ئەدەبی، وەك کەرەسەیەکی پلە دوو یان ئامرازێکی دەستەوەستان و خەسیو بۆ راگواستنی ئەندێشە و ئەزموونی مرۆڤ چاویان لە زمان دەکرد. ئەم گوتەیەی دەبلیو.جێی.کۆرتۆپ، رەخنەگری ئەدبیی سەدەی نۆزدە و مامۆستای شێعر لە زانکۆی ئاکسفۆرد، نموونەی دیاری ئەم تێڕوانینەیە:

***زمان ئامرازی هزرە، و وەك پێڵاوە باڵدارەکانی «مێرکیوری»، یارمەتی زەوین دەدات تا بەسەر کێوەکانی قەڵەمڕەوی بەرزەجێیی هزر و خەیاڵدا هەڵزنێت. بەڵام هەڵەیە گەر پێڵاوەکانی مێرکیوری بە سەرچاوە و کانگای پلەی خوایەتیی ئەو بزانین. ئەگەر تۆژینەوەی زمان رێگای پێ بدرابایە بەسەر***

PDF 4 KURD

***تۆژینەوەی ئەدەبیاتدا زاڵ ببوایە، هەڵەیەکی لەمجۆرەیان دەهاتە سەر ڕێ، وەك چۆن لەوانەیە ئەم هەڵەیە لە ڕێبازی کۆرسی ئینگلیسیدا بێتە سەر ڕێ.***

ئەوە گرینگە کە کۆرتۆپ «هزر» و «خەیاڵ» جیا لە زمان و لەڕاستیدا تۆژینەوەی ئەدەبیات جیا لە تۆژینەوەی زمان دەزانێ. لە سەدەی بیستەمەوە لە بریتانیا، زمان و ئەدەبیات لە زانکۆکان بە شێوەگەلی تەواو جیاواز لێیان کۆڵدراوەتەوە. تۆژینەوەی زمان پتر لە شێوەی مێژوویی بووە، واتە لە گۆڕانکاری و گەشەسەندنی زمانی ئینگلیزی، یان لایەنە تەکنیکییە زمانناسانەکەی زمان دەکۆڵدراوە. هیچ کام لەم تێڕوانینانە بۆ چەمکی زمان تەواو تێکەڵ بە تۆژینەوەی ئەدەبیات نەبوو و بێگومان، لە زۆربەی هەرە زۆری بنکەکانی خوێندنی باڵادا، خەڵکان دەیانتوانی بێخوێندن و شارەزا بوون لە زمان بڕوانامەی کۆرسی «ئینگلیزی» وەربگرن، مەگین لە ڕەخنەی پراکتیکدا کە هەر لە بنجوبناوانەوە پشتی بە تیۆریی فۆرماڵی زمان ئەستوور نییە.

لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمەوە لە ئەورووپا، تیۆریگەلێکی جۆراوجۆر و جیاواز سەبارەت بە پرسی زمان ـ و بە تایبەتی زمانی ئەدەبی ـ هاتنە ئاراوە کە لە دواسالآنی دەیەی ١٩٦٠ـەوە کاریگەرێتییەکی بەبڕشتیان لەسەر لێکۆڵینەوەی ئەدەبیات لە بریتانیادا هەبووە. لێرەدا نامەوێ بڵێم بەر لە سەدەی بیستەم تیۆریگەلێك لە گۆڕێدا نەبوون کە زمانیان بە بنەمای ئەدەبیات یان بەرهەمهێنەری بیرۆکە و مانا دەزانی نەك ئامرازێك بۆ ڕاگواستنی ئەمانە. تیۆرییەکانی ڕەوانبێژیی[2] (rhetoric) یۆنانی کەونارا و لێکۆڵینەوەکانی سی.ئێس. پیرسی[3] ئەمریکی لە سەدەی نۆزدەهەم لەمەڕ زمان، پێش

٢- هونەری بەکارهێنانی زمان بە شێوەیەکی شوێندانەر و قەناعەت پێهێنەر.

٣- C.s.peirce (1839-1914) فەیلەسووف و فیزیکزانی بەناوبانگی ئەمریکی.



تیۆریەکانی تر دەکەون. هەندێ لە تۆژەران پێیان وایە کە تیۆرییەکانی یۆنانی کەونارا، لەوانەیە سەرلەنوێ لە تۆژینەوەی ئەدەبیدا برەویان ببووژێتەوە. تێری ئیگلتۆن، لە کتێبی «بەرکولێك بۆ تیۆریی ئەدەبی» (١٩٨٣) لە بەشی ئەنجامگیریدا، بە توندی پشتیوانی لە ژیانەوەی تۆژینەوەی ڕەوانبێژی دەکات. بەڵام سەرەتاکانی سەدەی بیستەم «قۆناغێکی» مێژوویی تایبەت پێکدێنێ، لە بەر ئەوەی کە لەم سەروبەندەدا زمان و دوابەدوای ئەویش گوتاری ئەدەبی کەوتنە بەردەم لافاوێکی پێداچوونەوەی فیکری، و بەتایبەت بیرۆکەکانی سوسور بەردی بناغەی بزاڤێکە کە پێی دەڵێن پێکهاتەخوازی، چەمکێك کە لە چاو تۆژینەوەی ئەدەبی مەیدانێکی بەربلاوتری بۆ خۆی تەرخان کردووە.

## تیۆریی نیشانە

بەرهەمەکانی زمانناسی سویسی فێردینان دو سوسور (١٨٥٧-١٩١٣) بۆ ئەم گریمانەیە کە دەڵێ، زمان دیاردەیەکی سروشتییە ملنادا و مشتومڕی لەسەر دەکات. لە سەدەی نۆزدەهەمدا وایان لێکدەداوە کە زمان لەو ڕووەوە سروشتییە کە نموونە و پێکهاتە دەنگییەکانی لەگەڵ جیهانی شت (objects) و بیرۆکەکان (ideas) یەکدەگرنەوە و دەگونجێن، بەو واتایە کە زمان بۆ هەر ڕەهەند و لایەنێکی جیهان وشەیەکی ڕاست و پڕ بە پێستی هەیە. بەڵام سوسور لەسەر ئەم باوەڕە بوو کە زمان سیستمێکی دڵخواز و خۆویست و بەپێی قەرار و بەڵێنە، واتە ئیختیاری (arbitrary) و قەراردادییە (conventional). مەبەستی سوسور لە دڵخواز و ئیختیاری بوون ئەوە بوو کە لە زاتی خۆیدا چ هۆکارێکی ئەوتۆ لەئارادا نییە کە وشەی «سەگ» دەشێ هەر ئەو مانایە بدات کە هەیەتی. هەر ئەم ئاژەڵە لە زمانەکانی دیکەدا بە وشەگەلێکی تەواو جیاواز

دەسنیشان دەکرێ: بۆ وێنە لە زمانی ئەڵمانیدا پێی دەڵێن "hund" و لە فەرەنسیدا "chien" تەنانەت وشەگەلی ناوـدەنگ[٤] (onomatopoetic) کە دەنگیان لاساییکردنەوەی سەدایانە، لە هەر وڵاتێك و بە شێوەیەکە. مەبەستی سوسور لە قەراردادی بوونی زمان ئەوە بوو کە زمان سیستمێکی نیشانەیی یان رەمزییە کە کۆمەڵێکی تایبەت لەسەر قەراردادەکانی رێك دەکەون، تا لەم رێیەوە هەلی پێوەندی بڕەخسێت. فێر بوونی زمانێك بە واتای بەشدار بوونە لەم قەراردادانەدا، قەراردادگەلێك کە پێکهاتە واژەیی و رێزمانییەکانیان لە هەر زمانێکدا بە شێوەیەکی تایبەت و جیاواز لە یەکدییە.

سوسور چەمکی زمانی بەسەر دوو لایەنی «لانگ» (laungue) و «پارۆل» (parole)دا دابەش کرد و ئەم دابەشکردنە دواتر لە تیۆریی ئەدەبیدا گرینگایەتییەکی فراوانی وەدەسهێنا. مەبەستی ئەو لە «لانگ» گشتێتیی زمان، واتە وشە و رێزمانە. «پارۆل» دەربڕینێکی تایبەت یان «کردەیەکی ئاخاوتن ئامێز»ـە (speech act) کە کۆمەڵێك رەگەزی جۆراوجۆر لە لایەنی «لانگ»ی زمان وەردەگرێ و ئاوێتەیان دەکات. غەزەل یان نوکتە و قسەی خۆش دوو نموونەی تەواو جیاوازی «پارۆل»ـن. زۆربەی هەرە زۆری رێبازەکانی رەخنەی ئەدەبی، ئەدەبیاتیان وەك پارۆل ـ واتە پاژێکی تاقانە و دیاریکراو بە شێوەی نووسراوە ـ لەبەرچاو گرتووە، بێئاوڕدانەوە لەم پرسە کە ئەم بەرهەمە چ پێوەندی یان جیاوازییەکی لەگەڵ نووسراوەی پتر ئاسایی و «لانگ» یان زمان بە واتا گشتییەکەی هەیە. وەك چۆن دواتر لە بەشی زمانی ئەدەبیـدا دەبینین، هەندێ لە تیۆری داڕێژانی ئەدەبیی دوای سوسور، «لایەنی ئەدەبی»ی زمان یان

٤- ئەو وشانەی کە رواڵەتی ناویان لاساییکردنەوەی دەنگێکی نێو جیهانی سروشتە وەکوو جیك جیكی چۆلەکە، حەوحەوی سەگ و...



گوتاری ئەدەبییان لە گوتارەکانی تر بە جیا لە قەڵەم دا. بۆچوونەکانی سوسور، لە سۆنگەی ئەوەی لە تێڕوانینێکی نامێژوییەوە بۆ زمان پاراو دەبوو، کەوتنە بەر لافاوی رەخنە: بە باوەڕی سوسور، گەرچی هەر سیستمێکی زمانی پێکهاتەیی دڵخوازانە و قەراردادیی هەیە، بەڵام زمان خۆی لە خۆیدا وەك بابەتێکی رەها و مشتومڕ هەڵنەگر چاوی لێ دەکرێ. ئەم بابەتە کە ئایا را و بۆچوونی سوسور هەڵگری تێڕوانینێکی مێژویین یان رێگا بە هاتنە ئارای تێڕوانینێکی وا بدات جێگەی باسوخواس و مشتومڕ و دەمەتەقە بووە. دەکرێ چەمکی «پارۆل» بەم چەشنە چاوی لێ بکەین کە هەر «کردەیەکی ئاخاوتن ئامێز» هەم بە پێی تایبەتمەندییە فۆرمییەکان، هەمیش بە پێی ئەو بارودۆخە مێژوییەی کە تێیدا بیچمی گرتووە، بۆی هەیە جیاواز بێت. ئەو واتایەی کە سوسور لە «لانگ»ی بە دەستەوە دەدات دەربڕی ئەوەیە کە زمان وەك بابەتێکی گشتی، بەردەام لە حاڵی گۆڕان و ساغبوونەوە و راسان و رۆچووندا نییە، لە کاتێکدا وێدەچێ «لانگ» و «پارۆل»، هەر تك، کاریگەرێتیی هەلومەرجی مێژوییان بە سەرەوەیە و ئەم گۆڕانکارییانەش لە پێکهاتەی خۆیاندا دەنوێنن. سەرەڕای ئەمە، سوسور بەتایبەتی سەری خۆی بەم بابەتەوە قاڵ نەکرد، و تیۆری داڕێژانی دوای ئەو بە پێچەوانەی سوسور چەمکی زمانیان نەك لە گۆشە نیگای فۆرمی یان پێکهاتەیی، بەڵکوو پتر لە گۆشە نیگای مێژوییەوە رەچاو کردووە. ئەم بابەتە نابێتە هۆی ئەوەیکە گرینگایەتیی دەور و کاریگەرێتیی شایانی سەرنجی بیر و بۆچوونەکانی سوسور لە حاند مەسەلەی داهێنان و هێنانە ئارای شێوازگەلی زۆر جیاواز بۆ تۆژینەوە لە زمان سەری تیا بچێ.

گرینگترین لایەنی کاری سوسور، تیۆریی نیشانەیە. سوسور سەرلەبەری سیستمە زمانییەکانی پێکهاتوو لە کۆمەڵێك نیشانەی جیا جیا و جۆراوجۆر

دەزانی کە لە سەر دەستی چەمك یان ئیماژ (وێنە) بە یەکەوە دەلکێن. کە واتە بەم ئاکامە دەگەین کە دەنگی «س ـە گ» بە واتای ئاژەڵێکی چوارپێی مووداره کە مەمکیشی هەیە و جیایە لە دەنگی وەك «گ س ك» یان «ن ۆ ك» کە هەر کام و مانایەکی تری هەیە و هەتا دوایی. بە باوەڕی سوسور، زمان سیستمێکی دوو فاقی یان دوو لایەنەیە، ئەم سیستمە هەڵگر و لەخۆگری ڕەمزێکە (code) کە لە ڕێگای نیشانەیلی زارەکی (verbal) یان چاوەکی (visual)ـیەوە، کە مانا و واتای دیاریکراو و پەسندکراویان هەیە، ڕادەگوازرێ. ئەم جیاوازی و جیاکارییە بە دوو زاراوەی پێوەندیدار بە یەکەوە دەسنیشان دەکرێ، واتە دال (signifier) و مەدلوول (signified). دال، دەنگ یان تێکەڵاوێکی دەنگیی تایبەتە کە وشەی «سەگ» پێکدێنێ، و مەدلوول، چەمك یان وێنەیەکە کە لە ڕێی ئەو وشەیەوە دێتە بەر چاومان. کە واتە، زمان سیستمی جیاوازییەکانە. سوسور گوتەنی: «لە زماندا تەنیا جیاوازییەکان هەن.» بە ڕای سوسور، ناسیاری و فامی ئێمە لە هەمبەر جیهان لە سەر دەستی پێکهاتەی جیاوازییە دەنگییەکان و ماناکانی پێوەندیدار بەوانەوە شکڵ دەگرێ. ئەم بابەتە سەرنجی تیۆری داڕێژانی دواتری بۆ لای خۆی ڕاکێشا، بەتایبەت ئەوانەی کە بە گشتی پێیان دەڵێن پێکهاتەخواز و پاش پێکهاتەخواز (post-structuralists). شایانی سەرنج پێدانە کە ئەم تیۆریداڕێژانە، کە کاریگەرێتییەکی قووڵیان بەسەر هزری سەدەی بیستەمەوە هەیە، «واقیع» لە گۆشە نیگای پێکهاتە و هێزی ژێرخانییەوە دەبینن. هزر و تێڕوانینی ئەوان سوژە و بکەری بە ڕواڵەت تاك و هەڵسووڕی هیومانیسم (مرۆڤگەرایی) و خاوەن بیری سەربەخۆ، کە بە شێوەیەکی واتادار «مرۆڤ»ی پێ دەگوترا، لە پێگەی سەرەکیی خۆی، کە پێشتر بە ژێدەر و پێکهێنەری مانا لە



قەڵەم دەدرا، دەرباز کرد. تیۆرییەکانی سوسور، ئەم تێڕوانینەی لێ کەوتەوە کە مرۆڤەکان زمان بە گوێرەی خواست و ویستی خۆیان ناگۆڕن، بەڵکوو ئەوە زمانە کە شوێن لەسەر ئەوان دادەنێ و بیر و هزریان دیاری دەکات، وەك چۆن فەیلەسووفی ئاڵمانی، مارتین هایدگێر، دەبێژێ: «زمان دەربڕی ئێمەیە.» بە لێکدانەوەیەکی تر، مرۆڤەکان لە سەرەتای ژیانیانەوە پێ دەنێنە قەڵەمڕەوی زمانەوە. ستێفن دادێلوس، کەسایەتیی سەرەکیی ڕۆمانی وێنەی هونەرمەند لە تافی لاویدا (١٩١٦) بەرهەمی جیمز جۆیس، ئەم بابەتەمان بە ڕوونی پیشان دەدا، چونکی ئەو لە هەناوی گوتاری دین و سیاسەت و بنەماڵە و سیستمی فێرکاریدا ـ کە جۆیس پێیان دەڵێ "تۆرەیلی" زمان ـ پەروەردە دەبێ و هەوڵ دەدات لەم تۆر و تەڵانە ڕزگاری بێت و بۆ دەربڕین و نیشان دانی شوناسی خۆی زمانێکی تاك و تایبەت بەرهەم بێنێ.

سوسور پێی وایە، زمان هەر لە بنەڕەتەوە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە نەك تاکە کەسی. هەر ڕێك ئەو لایەنە هاوبەش و پێوەندی ئامێزەی زمانە کە ناچارەکی تایبەتمەندییەکی کۆمەڵایەتی پێ دەبەخشێ:

***سریشتی قەراردادی بوونی نیشانە لە جێی خۆیدا پێمان دەڵێ کە بۆچی تەنیا واقیعی کۆمەڵایەتی توانایی بەرهەمهێنانی سیستمێکی زمانی هەیە. کۆمەڵ یان جڤات (community)، هۆکاری پێویستی ڕێکخستنی ئەو بەهایانەیە (values) کە تاقە هۆی بوونیان، بەکارهێنان و پەسند کردنی لە لایەن جەماوەرەوەیە، چونکی تاك بە تەنیایی توانایی مسۆگەر کردنی تەنانەت تاقە بەهایەکی زمانیشی نییە.***

کە واتە زمان دیاردەیەکی «سروشتییە»، نەك لە سۆنگەی ئەوەی کە بە پێی سروشت شێوازی بەردەستی پێناسە کردنی جیهانە، بەڵکوو بە هۆی

بەکارهێنانی باوی کۆمەڵایەتیی خۆی. لەم ڕێیەوە زمان دەبێتە پرۆسە یان کردەیەکی «بەسروشتکراو[٥]». لەوانەیە بە هەڵە وا تێبگەین کە زمان، چەمکێکی شەفاف و دەلالەت هەڵگرە، واتە ئەوەیکە ئاماژە بە جیهانێکی ئەو دیوی جیهانی خۆی دەکات، بەڵام تیۆرییەکانی سوسور دەربڕی ئەوەن کە زمان مانای جیهان بەو شێوەیە بەرهەم دێنێ کە ئێمە دەیناسین و دەیزانین. یەکێك لە تایبەتمەندییە بەرچاوەکانی زمان لە زۆربەی بوارەکانی بەکارهێناندا، نەزۆکییەتی لە نیشاندانی خۆیدا وەك زمان. وەك دواتر باسی لێ دەکەین، هەندێ لە تیۆری داڕێژانی ئەدەبی وایان لێکداوەتەوە کە یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی زمانی ئەدەبی یان شێعر، خودوشیاری یان خودئاگاهی شێعرە کە جێگە و پێگەی خۆی وەك زمان زەق دەکاتەوە. بە گشتی ـ هەڵبەت نەك هێندەش بە راشکاوی لەمەڕ "شێعری تاقیکارانە[٦]" یان دەقە شانۆییەکانی شێکسپیر ـ دەکرێ بڵێین زمان زایەڵە و ڕەنگدانەوەی جیهان نییە، بەڵکوو جیهان وێنا دەکات و بەرهەمی دێنێت. لەوانەیە پێمان وابێت کە پێوەندیی شتەکان لە جیهاندا وەك پێوەندیی ڕەگەزەکانی زمانە کە ئەو جیهانە دەرەکییە وێنا دەکات، بەڵام بە گوێرەی تیۆریی سوسور، دەکرێ وای لێکبدەیتەوە کە زمان ئەم پێوەندییانە بەو جیهانە دەبەخشێ کە ئێمە پێمان وایە لە دەرەوەی زمان یان جیا لە زمانە.

ئەم تێڕوانینە کە پێی وایە زمان دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و دەستەجەمعییە و چاولەدەستی داب و نەریتگەلێکی تایبەت و دیاریکراوە، وێدەچێ لەگەڵ ئەو تێڕوانینەی کە لە هەمان کاتدا زمان بە کەرەسەیەکی لەبار

5- naturalized.
6- experimental poetry.



و گونجاو بۆ دەربڕین و خۆیا کردنی بیرۆکەگەلێکی تەواو تاکەکەسی و ڕەسەن و خولقێنەرانە لە قەڵەم دەدات، دژایەتی دەکات. (گومانی تێدا نییە ئەم شێوە تێڕوانینە پتر پێوەندی بە بۆچوونی تەواو ڕۆمانتیکەوە هەیە سەبارەت بە هونەرمەندی ئەدەبی "ئەدیب"). پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە چۆن چۆنی هەندێ لە تیۆریداڕێژانی دیاری ئەدەبی لەسەر چەمك و واتای "داهێنەر" (author) مشتومڕیان کردووە و سەر لەنوێ پێناسەیان کردۆتەوە. بیر و راکانی سوسور هەلی ئەوەمان بۆ دەڕەخسێنێ کە بە شێوەیەکی پێکهاتەمەندتر و زانستیانەتر لە زمان بکۆڵینەوە، بە چەشنێك کە ئەو شتەی کە جاران وەك زەین و خەیاڵی نووسەر لە قەڵەم دەدرا، هەنووکە وەك زمان ئاوڕی لێ بدرێتەوە. تاقانە و بێوێنە بوونی دەقێکی ئەدەبی دەکرێ لە سۆنگەی تایبەتمەندیگەلی فۆرمی و زمانییەوە باسی لێ بکرێ،، هەر بۆیەش دوان لە ژیانی نووسەر و زەمینەکانی چیتر وێناچێ پێویست بێ. بەڵام ئەمە ڕێگامان پێ دەدات، بە گوێرەی زاراوەناسی سوسور، نقیسان بە "پارۆل"ێك بێنینە ئەژمار کە لە دڵی "لانگ"ێکەوە سەر دەردێنێ، ئەوەش دەقێکی دیاریکراو یان تایبەتە کە پێوەندی بە سیستمی گشتی و ڕێساکانی زمانەوە هەیە. هەنووکە زماننasan و تیۆری داڕێژانی ئەدەبی هەوڵ دەدەن تا بابەتەیلی "لانگ" و "پارۆل"ی سوسور سەر لە نوێ پێناسە بکەنەوە، بەڵام ئەم تێڕوانینە ڕێگامان پێ دەدات کە ئەدەبیات لە پێوەندی دەگەڵ فۆرم و شێوەکانی تری زمان بخەینە ژێر تیشکی لێکۆڵینەوەوە و هەروەها ئەم پرسیارە بێنینە ئاراوە کە تاقانە بوون یان ڕەسەنایەتی گوتاری ئەدەبی لە چییەوە سەرچاوە دەگرێ، بە وتەیەکی تر "پارۆل" تا چ رادەیەك بۆی هەیە لە ڕێساکانی "لانگ" خۆی دوور بخاتەوە؟ یان بە پێی بۆچوونی سوسور لەمەڕ زمان وەك جیاوازی، گوتاری

PDF 4 KURD

ئەدەبی تا چ ئاست و ئەندازەیەك بۆی هەیە لەگەڵ زمانە "باو"[7]ەکانی دیکە جیاوازی هەبێت؟

لە ئەنجامگیریی ئەم بەشەدا سەبارەت بە تیۆریی نیشانە، شایانی باسکردنە کە تیۆرییەکانی سوسور، کە ساڵی ١٩١٤، لە قەوارەی کتێبێکدا بە ناوی "کۆرسی زمانناسیی گشتی"[8] بڵاو بۆوە، نووسراوەی خۆی نەبوون، بەڵکوو قوتابی و هاوڕێیانی بە پێی ئەو یاداشتانەی کە لە وانەبێژییەمانی وی لە پاریس کۆیان کردبۆوە، ئەو تیۆرییانەیان ڕێکخست و دواجار وەشاندیانن. ئەم بابەتە یەکێك لە واتا و هێماکانی تیۆرییەکانی ئەو زەق دەکاتەوە: ئایا ئێمە ڕووبەڕووی ئەو تێڕوانینانە بووینەتەوە کە هەڵقوڵاو لە هزری تاکە کەسێکن و پێشتر، لە دەرەوەی ئەو زمانەی کە پێی نووسراون بوونیان بووە، یان ئەوەیکە ئەم تێڕوانینانە دەقێکی هاوبەش و دەستەجەمعی و «کۆمەڵایەتی»ـن کە خۆی تێڕامان و خورد بوونەوەیەکە لە زمان؟

## زمانی ئەدەبی

تیۆرییەکانی سوسور ڕێگای پێ دایـن جارێکی تر بە سریشتی زمانـدا بچینەوە و بەشێك لەو بزاڤە بەربڵاوترەی پێکهێنا کە بە تایبەتی لە فەلسەفەی زمانناسانەدا لە گۆڕێدا بوو. بە کورتی پێویستە بڵێین کە لەم سەروبەندەدا، هەندێ فەیلەسووف، وەك لودویگ ویتگنشتاین[9]، هەستیان بەوە کردبوو کە ئەو پرسیارە گرینگانەی کە فەلسەفە بە شێوەی نەریتی سەبارەت بە مانای ژیان و چەمکگەلێکی لەم دەستە هێناویەتە ئاراوە، لە ڕاستیدا پرسیارەیلێك بوون

7- normal.
8- Course in General Linguistics.
9- Ludwig Wittgenstein.



لەمەڕ زمان، گەرچی زۆر جار بەم شێوەیە لێك نەدراونەتەوە. بەم حاڵەشەوە لە پانتایی ئەدەبیاتدا، زمانناس و ڕەخنەگر ئەم پرسیارەیان ورووژاند کە ئایا بۆمان هەیە سریشتی ئەدەبیات بەپێی تایبەتمەندییە زمانییەکانی پێناسە بکەین. بە پێچەوانەی شێوازی نەریتخوازانەی ڕەخنەگرانی بریتانی کە لە هەندێ چەشنی تایبەتی تەجرەبە و بەها ئەخلاقییەکانیان دەکۆڵییەوە، تاقمێك لە ڕەخنەگرانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات چەند باسوخواسێکیان سەبارەت بە سریشت و گەوهەری زمانی ئەدەبی هێنایە گۆڕێ. دەکرێ ئەم باسوخواسانە وەك یەکەم نموونەی ئەدەبیی مودێڕن، و لایەنگرانیان (کۆمەڵێك نووسەری ڕووسی) وەك یەکەم تیۆریداڕێژانی ئەدەبی لە قەڵەم بدرێن کە لەسەر کاری تیۆری داڕێژانی دوای خۆیان، بەتایبەتی لە فەرەنسە و دوابەدوای ئەو لە ئەمریکا و بریتانیا شوێنی کاریگەریان داناوە. ئەوەی ڕاستی بێت، بەشێکی زۆر و زەوەندی لێکۆڵینەوە و تۆژینەوەکانیان تەنیا لە دەیەی ١٩٦٠ بەم لاوە وەرگێڕدراون و لە ئاست و ئەندازەیەکی بەرفراواندا بڵاو بۆتەوە و پەرەی ئەستاندووە. شتی شایانی سەرنج لەم نێوانەدا، بەتایبەتی لە گۆشەنیگای مێژووییەوە ئەوەیە کە چەمکگەلی «ئەدەبی» و دەور یان ئەرك و کارکردی ئەدەبیات کە لە لایەن ئەم تیۆریستانەوە هاتۆتە ئاراوە لەگەڵ چەمکەیلێك کە لە هەمان سەروبەندا لە بریتانیا برەوی هەبوو، دژایەتییان هەیە و لەگەڵ یەك ناکۆکن. هەروەتر دەبی سەرنج بەم خاڵە بدەین کە ڕەخنەی ئەدەبی و تیۆریی ئەدەبی و ڕەخنەگرانە، وەك ئەو دەقانەی کە ڕوویان تێدەکەن و ڕەخنەیان لێ دەگرن، بەرهەم و دەرەنجامی پرۆسەیلی مێژوویین.

## زمانی ئەدەبی و «ئەدەبییەت»

سەرەکیترینی تیۆرییەکانی سەبارەت بە سریشتی ئەدەبیات، بە پێی تایبەتمەندییە زمانییەکانی، لە لایەن ئەو گرووپەوە هاتە ئاراوە کە ساڵی ١٩١٥ لە رووسیا پێكهات و هەنووکە زۆر جار وەك فۆرمالیستەکانی رووس باس لە ئەندامەکانی دەکرێ. لێرەدا نابێ بە هەڵەدا بچین و زاراوەی «فۆرمالیسم» پیمان وابێ هەر ئەو بزاڤە رەخنەگرانەیەیە کە هەر بەم ناوە و لە دەیەکانی ١٩٤٠ و ١٩٥٠ لە ئەمریکا سەریان هەڵدا و زۆر جار بە فۆرمالیسم و پێکهاتەخوازی و «رەخنەی نوێ»ش باسیان لێ دەکرێ. هۆگری و خواستی فۆرمالیستی رووسی لەگەڵ ئەو تێڕوانینە بەرتەسك و دەقخوازانەیەی کە «رەخنەگرانی نوێ» لە فۆرمالیسمی خۆیاندا هێنایانە ئاراوە زۆر جیاوازە و زۆرتر لەو گۆڕانکارییانە نیزیکە کە دەیەی ١٩٦٠ لە تیۆریی ئەدەبیدا هاتنە گۆڕێ.

## ویکتۆر شکلۆڤسکی[10] و «ئاشنایی سڕینەوە»

شکلۆڤسکی یەکێك لە ئەندامە هەرە هەڵکەوتەکانی «ئەنجومەنی زمانناسیی مۆسکۆ» بوو و ساڵی ١٩١٧ وتارێکی بە ناوی «هونەر وەك تەکنیك» بڵاو کردەوە. لەم وتارەدا، شکلۆڤسکی باسی چەمکێکی هێنایە ئاراوە کە بە زمانی وەرگێران دەبێتە «ئاشنایی‌سڕینەوە[11]». تێزی شکلۆڤسکی ئەوە بوو کە لە زۆر کردەوەدا، تێگەیشتن (perception) دەبێتە پرۆسەیەکی خود بە خودی و ئوتوماتیك کە ئێمە گەلێ جار لێی بێ‌ئاگاین و بۆچوونی خۆمان لە شتەکان و پێوەندیی نێوانیان وە پشت گوێ دەخەین. زمانی شێعر

10- Victor Shkovsky.
11- defamiliarization.



دەتوانێ ئەم «خوو گرتووییە» تێکبدات و وامان لێ بکات تا لە شتەکان بە شێوەیەکی جیاواز و نوێ بڕوانین. ئەم کارە بە دەستی زمانی شێعری یان ئەدەبی دەکرێ لە پێناوی «نامۆ کردن» یان ئاشنایی سڕینەوە لە جیهانی ئاشنا و ناسراو. لە راستیدا ئەوە جیهان یان شتەکان نین کە دەگۆڕدرێن، بەڵکوو شێوازی تێڕوانین و شێوەی تێگەیشتنیانە کە گۆڕانی بەسەردا دێت.

***هونەر بۆیە دێتە بەرهەم هاتن، تا مرۆڤ بۆی هەبێت هەستی ژیان سەرلەنوێ بلۆزێتەوە. هونەر دەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤ هەست بە شتەکان بکات و بەرد بۆی ببێتە شتێکی بەردین. ئامانجی هونەر، بە شێوەیەکی راستەوخۆ و بێ‌نێوبژی هەست کردن بە شتەکانە بەو شێوەیەی کە دەکەونە بازنەی تێگەیشتنەوە، نەك بەو جۆرەی کە ناسراون. تەکنیکی هونەر «نائاشنا کردن»ی شتان و بە پێچوپەنا کردنی فۆرمەکان و بردنە سەری ئاستی ئەستەمی و پتر کردنی مەودای جوانی‌ناسانەیە و دەشێ مەوداکەی بەرفراوان بکرێ. هونەر رێیەکە بۆ ئەزموون کردنی هونەری بوونی شتێك، ئەو شتە خۆی گرینگ نییە.***

دیارە سەرلەبەری شوێنەواری ئەدەبی ئەم تاو و تەئسیرەی ئاشنایی‌سڕینەوەیەیان نییە. بۆ وێنە زۆربەی رۆمانەکانی سەدەی نۆزدەهەم و بیستەم، وێدەچێ تەواو بە پێچەوانەوە دەجووڵێنەوە و بە یارمەتی زمانێکی ئاشنا یان قابیلی تێگەیشتن کە ئاشنایی و ناسیاوی بەرهەم دێنێ، توانایی ناسینمان لەمەڕ جیهان بەهێز دەکات. ئەم تیۆرییەی شکلۆڤسکی بۆ تێگەیشتن لە شێوە نووسینی ئەزموونگەرا، بەتایبەت ئەو بزاڤە ئەدەبییەی کە لە کاتی بڵاو بوونەوەی وتارەکەی ئەودا بە ناوی مۆدێرنیسم دەناسرا و لەوپەڕی گەشە و نەشەی خۆیدا بوو، یارمەتیدەر و رێشاندەرە. بە دڵنیاییەوە دەکرێ بڵێین

شێعری ئێزرا پاوند[12] یان تی.ئێس. ئیلیۆت، و بە شێوەیەکی جیاواز، پەخشانی داستانیی رۆمانی "ئۆلیس"[13] (١٩٢٢) بەرهەمی جیمز جۆیس یان "دۆنادۆن"[14] (١٩١٦) بەرهەمی فرانتس کافکا، کاریگەرێتییەکی لەم چەشنەیان هەیە. مۆدێرنیسم لەسەر فۆرم پێدادەگرێ نەك لەسەر ناوەرۆك، و لەم جۆرە دەقە ئەدەبییانەدا هەڵسوکەوتێکی رۆژانەی وەك پیاسە کردن لە شەقام یان هەستان لە خەو لە بنەڕەتەوە گۆڕانگاری بەسەردا دێت. هەڵبەت شکلۆڤسکی دان بەوەدا دەنێت کە تاو و تەئسیری ئاشنایی سڕینەوە بە تێپەڕینی زەمان دەگۆردرێ، بە چەشنێك کە ئاشنایی سڕینەوە بۆ نەوەیەك، دەبێتە عادەت و رێسای نەوەی دواتر. ئینجا خاڵێکی تر کە تیۆرییەکەی شکلۆڤسکی پیشانمان دەدا ئەمەیە کە هەموو شێوەکانی واقیع دەسهەڵبەستن. بەڵام ئەو تایبەتمەندییە خودئاگا و تێکدەرانەیەیان نییە کە تەکنیك و فرت و فێڵەکانی ئاشنایی سڕینەوە بە کاری دێنن. رۆمانی ریالیستی لە سۆنگەی کەڵك وەرگرتنەوەی سەر لەنوێ لە زمانی عادەتی و باو و هەروەها لە پرۆسەگەلی تێگەیشتنی پێوەندیدار بە زمانەوە، سروشتی و ئاسایی دێتە بەرچاو، بەڵام ئەمەش خۆی جۆرێك لە کاریگەرێتی دێتە هەژمار. بێرتولت برێشت[15]ی شانۆنامەنووس، ئەم تیۆرییانەی لە بۆتەی جۆرە کردەیەکی شانۆییدا تواندەوە کە بوو بە هۆی ئەوەی شانۆنامەی ریالیستی زەق بێتەوە و لەبەر چاوان دیار بێت، بەم شێوەیە کە هات کۆمەڵێك راقە و رووداوی تری

١٢- Ezra pound شاعیری پێشڕەوی ئەمریکایی سەرەتای سەدەی بیستەم.

13- Ulysses.

14- Metamorphosis.

١٥- Bertolt Brecht (1898-1956) شانۆکاری ئەڵمانی کە لەسەر رەوتی شانۆی مۆدێرنی جیهان کاریگەرێتی زۆری بووە.



بەردەوام دەخستە نێو ئاخافتنی کەسایەتی و هەناوی بەسەرهاتەکانی شانۆوە تا یەکپارچەیی و یەکدەستیی ئەو رووداوانە بسڕێتەوە. ئەو شتەی برێشت پێی دەگوت «کاریگەرێتیی نامۆیی»، هاوواتای چەمکی ئاشنایی‌سڕینەوەی شکلۆڤسکییە کە وا لە بەردەنگان و بینەران دەکات تا لە گۆشەنیگای جۆراوجۆرەوە لە کردەی داستانی بڕوانن و ئەمەش دۆخ و مەوقعییەتی ئەوان سەبارەت بە دەق نائاشنا و نامۆ و ناسروشتی دەکات.

تیۆریی شکلۆڤسکی، ئەلتەرناتیڤ و جێگرەوەی ئەو تێڕوانینانەیە کە ئەدەبیات بە کانگا و سەرچاوەی بەها و هەقیقەتە هەرمان و جیهانییەکان دێننە ئەژمار: "ئەدەبییەت" جۆرە کاریگەرێتییەکی زمانییە کە لە بوار و بەستێنێکی تایبەتدا و بە نیسبەتی جۆرەکانی تری مەعریفە یان گوتار بەرهەم دێت. هەروەتر باسی ئەم بیرۆکەیە دێنێتە ئاراوە کە دواجار ئەدبیات یان دەقی ئەدەبی لە زاتی خۆیدا ئۆرگانیك و یەکگرتوو نییە، بەڵکە پێکهاتووە لە کۆمەڵێك نووسراوە و تەکنیك و فرتوفێڵی هەمە چەشن کە لەوانەیە بە شێوازی جۆراوجۆر کۆ بکرێنەوە و راقە بکرێن. نموونەیەکی راشکاوانەی ئەم باسە شێعری «قوبلای خان» (Kubla khan)ی کۆلریجە. گەلەك هەوڵ دراوە تا بە پێی پەراوێزەکانی کۆلریج خۆی ئەم شێعرە لە گۆشەنیگای نووسەر، یان لە دەلاقەی زەمان و هتدەوە «شیبکرێتەوە». بەڵام خوێندنەوە و لێکدانەوەی وردی تایبەتمەندییە زمانییەکانی ئەم شێعرە و بەراورد کردنیان لەگەڵ گوتارە باوەکان، چ لە باری قۆناغی داهێنانی شێعرەکە و چ لە لایەنی سەردەمی خوێندنەوەی، نیشاندەری ئەمەیە کە دەنگ و سینتاکس (ڕستەبەندی) و وشەکانی بە شێوازێکی فرە نائاسایی و ئەزموونکارانە بەکار هاتوون و هەندێ کاریگەرێتی بەدی دێنن کە زۆرتر بە دەسکەوتی «خەیاڵ

کردنەوە»ی حسێب دەکەن. هەروەتر ئەم تێڕوانینە، لەبری بەستنەوە و بەرتەسك کردنەوەی شێعر، تا رادەی باسکردن لە تەنیا یەك لایەن (وەك نووسەر یان شوێنی نووسینی بەرهەمەکە) و سەرنجدان بە یەکێتی ئۆرگانیکی شاراوە لە شێعردا، بۆچوونێکی ئازاد و هەمەچەشن و فرەلایەنی هەیە.

## باختین: ڤۆلۆشینۆڤ و مەنتقی گفتوگۆ

میخاییل باختینیش لەگەڵ «ئەنجومەنی زمانناسیی مۆسکۆ» لە پێوەندیدا بوو و هەندێ تیۆریی سەبارەت بە زمانی ئەدەبی دارشت کە لەم ساڵانەی دواییدا شوێنێکی دیاری لەسەر رەخنەی ئەدەبی داناوە. سەبارەت بە پێناسە و شوناسی میخاییل باختین، یان لانی کەم سەبارەت بە هەندێ لەو نووسراوانەی کە بە ناوی هاوکارەکەی ڤ. ن. ڤۆلۆشینۆڤ بڵاو بوونەتەوە، هەندێ تەمومژ و خاڵی نادیار لە گۆڕێدایە. باسوخواس و مشتومڕ سەبارەت بە داهێنانی ئەو دەقانە هەر وا بێ چارەسەری ماونەتەوە، بەڵام ئەو دەقانەی کە بە ناوی باختین یان ڤۆلۆشینۆڤ بڵاو بوونەتەوە، چوارچێوەیەکی تیۆریکی هاوبەشیان هەیە و بە لەبەر چاو گرتنی باسی پێشوومان سەبارەت بە داهێنەر، لەبری هێنانە ئارای پرسیارگەلێکی ناپێویست و رێ ونکەر لەمەڕ داهێنان و بابەتە پێوەندیدارەکان بە داهێنان کە باختین/ڤۆلۆشینۆڤ بە نیاز بوون ئاشکرای بکەن، باشتر وایە ئەم داهێنانگەلە وەك پاژێك لە هەڵسوکەوتێکی زمانیی هاوبەش لە قەڵەم بدەین.

هەرچەند باختین لەم بۆچوونەدا لەگەڵ سوسور یەکی دەگرتەوە کە زمان بەردی بناغەی هەموو مانایەکە و رەگەزی سەرەکیی مەعریفەیە، بەڵام بە پێچەوانەی سوسور زمانی وەك پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتی و مێژوویی لە قەڵەم دەدا، نە سیستمێکی رووت و ئەبستراکت و یەکانگیر کە سوسور پێی دەگوت



"لانگ" (langue). بە رای باختین زمان لە هیچ حاڵێکدا نەگۆڕ یان چەقبەستوو نییە، بەڵکوو بەردەوام لە حاڵی گۆڕاندایە. مانا هیچ کات تاقانە و باسهەڵنەگر نییە، بەڵکوو فرە لایەن و مشتومڕ ورووژێنە. لە بنەماییترین ئاستدا، بۆ هەر چەشنە کردەیەکی پێوەندی ئامێز، بە شێوەیەکی هێزەکی، لانی کەم دوو بۆچوون لە ئارادایە: یەکیان بۆچوونی بێژەر/نووسەر و ئەوی تریان بۆچوونی بیسەر/خوێنەرە. بەم شێوەیە، ئەگەر بێت و بڵێم «باوەڕم بە ئازادیی تاك هەیە.» ئەم وشانە بۆ من بە لانی کەمەوە یەك مانایان هەیە، بەڵام بە پێی باروودۆخی جۆراوجۆر لەوانەیە بۆ بەردەنگ چەند مانا و واتایەکی تریشی هەبێت. گەر کەسانێکی جۆراوجۆر، بەتایبەت بە درێژایی چەندین ساڵ، ئەم وشانە بخوێننەوە، لەوانەیە ئەم مانایانە گۆڕانی پتریان بەسەردا بێت. بە بۆچوونی باختین، زمان گۆڕەپانێکە بۆ ململانێ و مشتومڕ، هەر بۆیە کاتێك وشەی «ئازادی» بەکار دێنین، مانایەکی روون و قسەبڕ و قەتعی نییە، بەڵکوو بۆی هەیە بۆ کەس و گرووپە کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکان ماناگەلێکی تەواو جیاواز و تەنانەت دژوازی هەبێت. بۆ وێنە، لە ساتەوەختی ئێستادا، ئەم وشەیە لە نێو حیزبە سیاسییەکانی بریتانیادا بۆی هەیە واتاگەلێکی جۆراوجۆری هەبێت کە هەندێ جار تەواو دژ بە یەکن. هەڵبەت ئەم باسە لەگەڵ باسی «سیستمی قەراردادی»ی سوسور لەمەڕ هاوئاهەنگیی نێوان دەنگ و شت «ئۆبژە» جیاوازی هەیە.

باختین توانایی زمانی بۆ بە دەستەوەدانی ماناگەلی جۆراوجۆر بە «مەنتقی گفتوگۆ» ناودێر کرد. دیارە ئەم دەستەواژەیە لەو سۆنگەیەوە پێوەندی بە گفتوگۆوە هەیە کە بە پێچەوانەی تیۆرییەکانی سوسور، زمان بە پرۆسەیەکی دوو لایەنە یان فرەلایەن لە قەڵەم دەدات، نەك بە دیاردەیەکی

PDF 4 KURD

تاقانە. تێڕوانینی گشتیی باختین سەبارەت بە زمان گۆڕەپانی ململانێیەکە لە نێوان هێزەکانی «ناوەندخواز» (centripetal) یان «تاك بێژانە» (monologic) لە لایەك کە هەوڵ دەدەن مانایەکی تاك و نەگۆڕ بە دەستەوە بدەن، و هێزەکانی «دژەناوەند» (centrifugal) یان «گفتوگۆخواز» لە لایەکی تر کە حاشا لە مانای تاك دەکەن، یان مانای تاك بە سەر مانای کۆ یان فرەلایەندا دابەش دەکەن. بە بۆچوونی باختین، لە مێژووی رۆژاوادا هەوڵ و تەقالاگەلێك بۆ «یەکانگیر کردن و کۆ کردنەوەی جیهانی کەلامی-ئایدلۆژیکی لە ناوەندێکدا» دیار و بەرچاوە، بەڵام:

***شانبەشانی هێزەکانی ناوەندخواز، هێزەکانی دژەناوەندی زمان کاری بێبڕانەوەی خۆیان بەڕێوە دەبەن، شانبەشانی یەکانگیری و ناوەندخوازیی کەلامی-ئایدیالۆژیکی، پرۆسەگەلی بێبڕانەوەی دژەناوەندی و نایەکانگیریش بۆ پێشەوە ڕێگا دەبڕن.***

بە پێی لێکدانەوەی باختین، گەرچی سەرلەبەری دیاردەی زمان لە زاتی خۆیدا گفتوگۆخوازە، بەڵام ئەم تایبەتمەندییە لە هەندێ جۆری نڤیساندا پتر لەوانی تر ئاشکرا و لەبەر چاوانە. بەتایبەتی زمانی ئەدەبی پیشاندەری ڕێژەیەکی باڵای گفتوگۆخوازییە و بە رای باختین، رۆمان نیشاندەری ئەو تایبەتمەندییە «فرەدەنگی» یان «فرەمانایی»یە (heteroglossia) کە سەروەری مانا بەردەستەکانی نێو زمان ئاشکرا دەکات. بە باوەڕی باختین، ڕۆمان لە چەندین توێژی گوتار پێکهاتووە کە بە شێوازی جۆراوجۆر لە پەنا یەکتر ریز دەبن، هەندێکیان بە شێوەیەکی هاوئاهەنگ و ڕێکوپێك و هەندێکیشیان بە شێوەیەکی دژواز و بەرامبەر بە یەك. ڕۆمان لەسەر گوتاری تاك بێژانە و دەسەڵاتخوازانەی چەشنەکانی تری زمان کە گاڵتە بە زمان و بەها



سەرەکی و رەسمییەکانی دەکەن یان روخساری ئەو زمان و بەهایانە دەڕووشێنن، مشتومڕ دەکات و دەیخاتە تەنگانەوە. ئەم تواناییەی رۆمان پێوەندی بەو چەمکەی باختینەوە هەیە بە ناوی «کەرنەڤالی[16]» کە بە پێی ئەم چەمکە ئەدەبیات بۆی هەیە گوتارەکانی دەرەوەی زمانی سەقامگیر و زاڵ دەستەمۆ بکات و بە کاری بێنێ بۆ ئەوەی «پێکهاتەی هیرەمی و هەموو شکڵ و شێوەکانی ترس و بەگەورەزانین و پارێزکاری و یاسا و ڕێسا پێوەندیدارەکان بەمانە» بە هەڵپەساردەیی بهێڵێتەوە. ئەو کەسانەی کە لە ژیاندا «لەبەر تەگەرە و کەند و کۆسپە سەختەکانی پێکهاتەی هیرەمی لە یەکتر دوور و تەریك کەوتوونەتەوە»، بە یارمەتی کەرنەڤال هەلی ئەوەیان بۆ دەرەخسێ «ئازادانە و دۆستانە پێوەندی بەیەکەوە بکەن». بەم چەشنە کەرنەڤال، نەزمی رەسمی و سەقامگرتووی تێکدەدات و ڕێگای پێوەندیگەلی نوێ خۆش و هەموار دەکات. بە باوەڕی باختین، کەرنەڤال هەر لە بنەڕەتەوە دوو ئاراستەیی و «دوالیستیکە[17]» و بە راشکاوی ئەگەری پێوەندیگەلی دامەزراو لە سەر بنەمای گفتوگۆ کردن دەرەخسێنێ و پاڵپشتی پێوەدەنێ.

ڕۆمان بۆی هەیە گوتارە زۆر و زەوەندەکانی خۆی بە شێوەیلی جۆراوجۆر ڕێکوپێك بکات، بە چەشنێك کە لە دەقێکی ریالیستیدا، گوتارەکان هیرەم (hierarchy) و زنجیرە پێگەیەکی دیاریکراویان هەیە کە دەنگێك یان گێڕەرەوەیەکی دەسەڵاتدار و چەقبەستوو کۆنترۆڵ و چاوەدێرییان دەکات، لە کاتێکدا دەقێکی مۆدێرنیستی خاوەنی دەنگێکی ناوەندگەرای چەقبەستووی لەم شێوەیە نییە، بەڵام سەربەستی و ئازادیی جموجووڵی پتر بۆ ئەو دەنگانە قایل

16- carnivalesque.
17- dualistic (دوولایەنە).

دەبێت کە هیچ کامیان بە ئاشکرایی و تایبەتی دەنگی زاڵ نین. سەرەڕای ئەمانە، سروشتییە رۆمانەکان گوتارگەلی جۆراوجۆر بەکار دەبەن کە دەبێتە هۆی گۆڕانکاری و پێداچوونەوەی هێزەکیی پێکهاتەی زمان و پێوەندیی کۆمەڵایەتی. نموونەی دیار و کەموزۆر وردی تیۆرییەکانی باختین، رۆمانی "سەردەمانی تفت و تاڵ"[18]ی «دیکێنز»ە کە تێیدا گوتارە رەسمییەکانی وەك پەروەردە، زانست، بە پیشەیی بوون (industrialization)، سەروەت و سامان و «واقیعەکان» کە لەسەر دەستی خاوەن کارگاکان، سیاسەتمەداران و چەوسێنەرانی کرێکاران دەردەبڕدرێن، لە هەمبەر زمانی پێوەندیدار بە «سیرك»ەوە رادەوەستن کە وەك جێگە و پێگەی کۆمیدیا و کایە و توانایی خەیاڵکردنەوە لە قەڵەم دەدرێ. لەم رۆمانەی دیکێنز، گەرچی قەڵەمڕەوەکانی رەسمی بوون بە تەواوی لەناو ناچن، بەڵام مام ناوەندی دەکرێن و لە خەستوخۆڵییان کەم دەبێتەوە و لە رەوتی ئەم رووبەڕوو بوونەوە و دژایەتییانەدا رێگا چارەیەکی سنگفراوانتر وەدەست دێت: ستراتیژییەك کە پتر لە ئەدەبی داستانیی سەدەی نۆزدە سەرنجی پێ دەدرا و ئاوڕی لێ دەدراوە.

واتا و دەلالەتگەلی تیۆرییەکانی باختین لەمەڕ ئەدەبیات و زمان و رەخنەی ئەدەبی زۆر گرینگن. ئەدەبیات بریتی نییە لە کۆمەڵە بەرهەمێکی بێ زەمان و جیهانشمول و نەگۆڕی مەعریفە، بەڵکوو بابەتێکە کە گۆڕانی بەسەردا دێت و خوێندنەوەی جیاوازی و تەنانەت دژواز هەڵدەگرێ. هەر بە هەمان شێوە، زمانیش چیتر سیستمێکی یەکگرتووی هاوشێوە و ئەبستراکت نییە، بەڵکوو لە سۆنگەی ئەوەی مەعریفە و وشیاری بەرهەم دێنێ، ناهاوشێوە و «مادی»یە. دەکرێ رەخنەی ئەدەبیش وەك زمان یان گوتارێك لە قەڵەك بدەین کە سریشتی

18- hard Tims.



گفتوگۆئامێزی تایبەت بە خۆی هەیە، گەرچی لەوانەیە تاقمێك لە رەخنەگران یان هەندێ لە بزاڤە رەخنەییەکان ئیدیعایەکی دژ بەمەیان هەبێ، و لە هەمان کاتدا رەخنەی ئەدەبی پابەندی بارودۆخی مێژووییە. پێوەندی و کەینوبەینی نێوان رەخنەی ئەدەبی و ئەدەبیات دەکرێ وەك پێوەندیی نێوان دوو گوتاری رەقیب لە قەڵەم بدرێ کە بە دوای «هەقیقەتگەلێکی» دیاریکراودا دەگەڕێن و دەیانەوێ کۆتایی بە خوێندنەوەی تر بهێنن، رێك وەك دەنگی زاڵ لە رۆمانی ریالیستیدا کە دەبێتە هۆی ئەوەی خوێنەر رووداوەکان بە چەشنێك بێتە بەرچاوی وەك بڵێی بە شێوەیەکی سروشتی پێکهاتوون. تیۆرییەکانی باختین پەرەیان داوە بە رەخنەیەکی فرەچەشنتر و کراوەتر لەو رەخنانەی کە هەندێ رەخنەگر و بنکەی زانکۆیی دەیخوازن.

رۆلان بارت گەشە و نەشەی بە بیرۆکەکانی باختین لەمەڕ زمان بەخشیوە و وای لێکدەداتەوە کە ئەو زمانەی وا تایبەتمەندیی زمان بوونی خۆی خۆیا دەکات ـ ئەو شتەی بە نیشانەی "دووپاتە" (double) ناودێری دەکات، واتە نیشانەیەك کە هاوکات لەگەڵ راگوازتنی مانا، چلۆنایەتیی بەرهەم هێنانی ئەو مانایەش دەسنیشان دەکات ـ پتر جێی باوەڕ و متمانەیە لە چاو ئەو زمانەی کە لە رێگەی گۆڕینی روخساری خۆیەوە خۆی وەك دیاردەیەکی سروشتی دەنوێنێ و پرۆسەی دەلالەتگەری و واتابەخشی دەشارێتەوە. ئەم تێڕوانینە، چەمکی باختین لەمەڕ مەنتقی گفتوگۆ و چەمکی شکلۆڤسکی لەمەڕ ئاشنایی سڕینەوە، کە هەرتك خوازیاری هەڵوەشاندنەوەی بابەتی ئاسایی و عادەتین، تێکەڵ بە یەك دەکات.

## یاکوبسن و «خوازە و مەجاز»

ڕۆمن یاکوبسن (Roman Jakobson) یەکێکی‌تر لە ئەندامانی «ئەنجومەنی زمانناسیی مۆسکۆ» بوو کە دواتر و لە دەیەکانی ١٩٢٠ و ١٩٣٠ تێکەڵ بە «ئەنجومەنی زمانناسی پڕاگ» بوو و پاشان ڕووی لە ئەمریکا کرد. هەم لە ئەمریکا، هەمیش لە بریتانیا، تیۆرییەکانی یاکوبسن شوێنێکی فراوانیان لەسەر تیۆریی ئەدەبی و ڕەخنەگرانە بەجێ‌هێشتووە.

یاکوبسن سەرنجی فراوانی خۆی بەو پاژە لە زمان و زمانناسی تەرخان دەکرد کە لە چوارچێوەی کاری ئەدەبی زۆر زیاتر دەترازا. لێکۆڵینەوەکانی یاکوبسن لەمەڕ تیۆرییەکانی زمانئالۆزی (psychiatry) یان نوقسانی زمانیی نەخۆشە دەروونییەکان لە دەروونشیکاریدا هەروەتر گەلێ گرینگ و شایانی سەرنجن. ئەوەی ڕاستی بێ، بابەتەیلی پێوەندیدار بە زمانئالۆزی یان نوقسانیی زمانی بەردی بناغەی گرینگترین تیۆرییەکانی یاکوبسن سەبارەت بە زمان و ئەدەبییەت پێکدێنن. بە بۆچوونی یاکوبسن، دەکرێ سەرلەبەری زمان بە سەر دوو تەوەرەی سەرەکیدا دابەش بکرێ. بە وتەیەکی وردتر، هەندێ جۆری تایبەتی زمان پیشاندەری کۆمەڵێك تایبەتمەندین کە وایان لێ‌دەکا ئەوان هاوئاراستە لەگەڵ ئەو تەوەرە یان قوتبە زمانییانە بن کە یاکوبسن ڕووناکییان دەخاتە سەر (واتە خوازە و مەجاز). یاکوبسن ئەم قوتبە زمانییانەی بە یارمەتی لێکۆڵینەوەی ورد لەو نەخۆشە دەروونییانەی کە تووشی «زمانئالۆزی» یان نوقسانی لە ئاخافتندان ڕوون کردۆتەوە. یاکوبسن ئاکام و دەسکەوتی ئەم لێکۆڵینەوانەی لە وتارێکدا بە ناوی «دوو لایەنی زمان و دوو جۆری زمانئالۆزی» (١٩٥٦) بە دەستەوە دا. دوو زاراوەی خوازە[19] و

19- metaphor.



مەجاز[20]، ئاماژە بە دوو تایبەتمەندیی ئاخافتن دەکەن و یاکوبسن پەرەیان پێ دەدات و وەك خەسڵەتی زمانی ئاسایی لە نقیسان یان ئاخافتنێکی تایبەتدا دەیانناسێنێ. مەجاز زاراوەیەکی کەمتر ناسراوە کە ڕێك بە مانای جێنشین کردنی ناوی تایبەتمەندیی شتێك لەبری خودی ئەو شتەیە، وەك «تاج» لەبری «پاشا»، یان «قەڵەم» لەبری «نووسەر» ﴿وەك لەم ڕستەیەدا «قەڵەمێکی بەتوانای ئەم بوارەیە»﴾. لە لایەکی ترەوە لە خوازەدا، ناو یان دەستەواژەیەك لە جێی شتێك دادەنێین کە سەرزارەکی بەو مانایە لەکار ناکرێ، بۆ وێنە «شێر» کە ناوی ئاژەڵێکە دەیخوازین و لە ڕستەیەکی ئاوادا بە کاری دێنین «شێری ئەم مەیدانەیە» تا ئازایەتی کەسێکمان وێنا کردبێت.

یاکوبسن لە ڕێگەی بینین و شیکردنەوەی حاڵوباڵی نەخۆشانی گیرۆدەی زمانئالۆزی، بە دوو جۆر شێواویی زمان یان ئاخافتنی زانی. ئەو بە جۆری یەکەمی دەگوت «شێواویی هاوشێوەیی[21]» کە تێیدا نەخۆشەکان تووشی زنجیرەیەکی زمانی دەبن کە ناتوانن لە داوی ڕزگاریان بێت، گەرچی لەوانەیە وشەیەك لە جێگەی وشەیەکی تری سەر بە زنجیرەیەکی دیاریکراوی دیکە دابنیشێ، بۆ وێنە «چەقۆ» لە جیاتی«چنگاڵ» یان «تیغ» لەبری «چەقۆ» بەکار بێت، بەڵام ڕزگار بوون لە داوی ئەم زنجیرە زمانییە مومکین نییە. نەخۆشی گیرۆدە بە «شێواویی هاوشێوەیی» هەروەتر ناتوانن بە چەشنێکی سەڵت و مەجازی زمان بەکار بێنن، کە واتە گەر بەڕاستی باران نەبارێ، ناتوانن بڵێن «باران دەبارێ». یاکوبسن ئەم جۆرە شێواوییەی بە لایەنی

20- metonymy.
21- Similarity disorder.

PDF 4 KURD

مەجازی[22] زمان شوبهاند کە تێیدا تایبەتمەندیی گوتار (discourse) پێوەندییە هاوشێوەییەکانی گوتارە.

یاکوبسن جۆری دووهەمی زمانئالۆزیی ناو نا «شێواویی هاوسێیەتی» کە تێیدا ئاخافتنی نەخۆش یان هەڵگری مانایەکی زۆر کەمە، یان هەر هیچ مانایەکی نییە، چونکی لە ئاخافتنیاندا پێوەندیی سروشتیی نێوان وشەکان تووشی شێواوی و شپرزەییەکی فراوان دێت. لەم سۆنگەیەوە، زمانی نەخۆشەکە لەوانەیە تەواو شێوا و نارێکوپێك بنوێنێ. یاکوبسن ئەم چەشنە زمانئالۆزییەی بە لایەنی خوازەییی[23] زمان شوبهاند، چونکی تێیدا وشەیەکی زنجیرە یان مەودایەکی زمانی جێی خۆی لەگەڵ وشەیەکی تر دەگۆڕێتەوە تا مانا زەق بکاتەوە.

یاکوبسن هەروەتر لەسەر ئەم باوەڕە بوو کە هەندێ لە فۆرمە تایبەتەکانی نڤیسانی ئەدەبی و چەشنەکانی تری زمان بەرەو یەکێك لەو دوو لایەنی خوازەیی یان مەجازی دادەگەڕێن. بۆ وێنە، ریالیسم یان بابەتی بەڵگەمەند (documentary) تایبەتمەندیگەلێکی تەواو مەجازییان هەیە، لە حاڵێکدا ئەدەبی داستانی و شێعری مۆدێرنیستی و ئەزموونگەرایانە خاوەن قاوغێکی تایبەتی نین و پتر هەڵگری سروشتێکی خوازەیین. هەڵدەکەوێ هەندێ دەق هەڵگری هەر دوو لایەنەکە بن: شالیر (ی شێکسپیر) نموونەیەکی پڕ بە پێستی ئەم جۆرە دەقانەیە. ئەم شانۆنامەیە بە زمانێکی شاهانە و دەسەڵاتێکی باوکانە و نەزمێکی کۆمەڵایەتیی سەقامگرتوو و بە شێوە ئاخافتنێکی زۆر مەجازی دەسپێدەکات، بەڵام ئەو کاتەی بنەماڵەی لیر و دامودەزگا و

22- metonymic aspect.
23- metaphoric aspect.



کەسایەتیی شا لێك هەڵدەوەشێتەوە، زمانی شالیریش دەبێتە زمانێکی زۆر ئالۆز و شێواو و خوازەیی. خوازە تەمهیدێکی تازە و داهێنەرانەترە و دەتوانێ ماناگەلی تازە بە شێوەیەك بێنێتە ئاراوە کە زمانی مەجاز دەرەقەتی نایات، چونکی مەجاز تەنیا پێوەندیی بە پتەو و بەهێز کردنی شێوازە ئاساییەکانی تێگەیشتنە. مەجاز نەك هەر تەنیا لە ئاستی مانا یان دەلالەت، بەڵکوو لە ئاستی پێکهاتە (structure) یان نەحو (syntax)ـیشدا هەر کارکردێکی لەم چەشنەی هەیە. بەم پێیە، رستەیەکی رێکوپێك و هاوئاهەنگ و بەرودوا (periodic) پێوەندی بە مەجازەوە هەیە، لە کاتێکدا پێکهاتەیلێکی شێواوتر و شپرزەتر، تەنانەت تا رادەی بەکار نەهێنانی نیشانەکانی چۆنێتیی نووسین، وەك شێعرەکانی ئی.ئی. کامینگز (e.e. cummigs) یان هەندێ شوێنەواری داستانیی جیمز جۆیس یان ویلیام فاکنێر پێوەندییان بە خوازەوە هەیە.

تیۆرییەکی تر کە یاکوبسن سەبارەت بە زمانی ئەدەبی دەیهێنێتە ئاراوە، پێوەندی بە باسێکەوە هەیە کە ئەو پێی دەگوت «بابەتی شێعری» (poetic). یاکوبسن لەم تیۆرییەدا وای لێکدەداتەوە کە زمانی ئەدەبی یان شێعر لەگەڵ قاڵب و قاوغەکانی تری نڤیسان جیاوازی هەیە، لەبەر ئەوەی کە ئەم زمانە «هەڵدەمسێ» (thicken) و سەرنجی خوێنەر بەرەو لای خۆی پەلکێش دەکات. ئەم تێڕوانینە لەچاو هەندێ لەو بۆچوونانەی کە تا ئێستا لەمەڕ زمانی ئەدەبی لێکمان داوەتەوە جیاوازییەکی ئەوتۆی تێدا بەدی ناکرێ. چەمکی «ڕەگەزی زاڵ» (dominant) کە یاکوبسن لەسەری دەدوێت هەر پێوەندی بەم باسەوە هەیە. بە باوەڕی ئەو، ژانر یان فۆرمەکانی نڤیسان و ئەم دەقەیلە تایبەتە بە شێوەیەکی تایبەتی پیشاندەری تایبەتمەندیگەلێکی زمانیی زاڵن. دەکرێ ئەم بابەتە بە شێوەیەکی تریش لێی بڕوانین و بڵێین کە هەر دەقێك

هەندێ لایەنی زمان زەق دەکاتەوە، بە وتەیەکی تر، لە هەر دەقێکدا لەسەر هەندێ تایبەتمەندی زمانی پێدادەگیرێ. بە گشتی شێعر بە چەشنێك دەنگ یان لایەنی دەنگیی زمانی زەق دەکاتەوە کە لە ژانرەکانی تردا رمێنی نییە. لە شێعردا، هەندێ ریزبەندیی دەنگی رێگای ئەوەمان پێدەدات قاڵبە شێعرییە تایبەتەکان کە خاوەنی زەقکردنەوەی پێکهاتەیی خۆیانن بناسینەوە، بە چەشنێك کە بۆمان بلوێ غەزەل (sonnet) لە بەیت (ballad)[٢٤] و هتد جیا بکەینەوە. شوێنەواری ریالیستی یان بەڵگەمەند، زمانێکی ئیرجاعی یان روون و ئاشکرا زەق دەکەنەوە، واتە زمانێك کە وێدەچێ ئاماژە بە جیهانێکی ئەو دیوی خۆی دەکات، لە کاتێکدا ئەو بەرهەمانەی کە بە نڤیسانی ئەوپەڕ داستانی (metafictional) ناسراون سروشتی دەسکرد و زمانیی خۆیان زەق دەکەنەوە، نەك دنیایەکی دەرەوەی زمان. رێك وەك چۆن دەقێك خاوەن هەندێ تایبەتمەندیی لایەنی زاڵە، هەر ئاواش لەخۆگری هەندێ لایەنی چەمکی "لادان"ـە (deviance)، واتە ئەو تایبەتمەندییە زمانییانەی کە لە راستەڕێی حوکمە باوەکانی رەگەزی زاڵ لادەدەن. نموونەی پڕ بەپێستی ئەم چەشنە لادانە شوێنەواری بەڵگەمەندی «جۆرج ئۆروێل»[٢٥]ـە. بۆ وێنە لە «جادەی بەرەو ویگان پییەر» (The road to wiganpier)دا کە ساڵی ١٩٣٧ نووسیوێتی

٢٤- شێعرێکی گێڕانەوەیی کە پتر لە ژێدەرێکی فۆلکلۆرییەوە وەرگیرابێت و بە گۆرانیش بگوترێ و لە چەندین بەند و سەربەند پێکهاتبێت. هاوواتای پڕ بە پێتسترم لە «بەیت» بۆ ئەم وشەیە نەدۆزییەوە.

٢٥- (George Orwell) نازناوی نووسەری بریتانیایی ئێریك ئارتۆر بلێرە. ساڵی ١٩٠٣ لە دایك بووە. شوێنەواری ئەدەبی و بەڵگەمەندی ئەو وێنەیەکی راست و دروستی سەردەمی وێنا کردووە. ساڵی ١٩٥٠ کۆچی دوایی کردووە.



جاروبار گێڕانەوەکەی لە زمانی ئیرجاعی و مەجازی دوور دەکەوێتەوە و لە تەوەری خوازەیی نیزیك دەبێتەوە. لەم نووسراوەیەی خوارەوەدا، جۆرج ئۆروێل دەقی لە خۆگری وەسفی باو و بەڵگەمەند بە شێوەیەکی بەرچاو دەگۆڕێت و دەیکاتە دەقێکی شێعرئامێز و ئەدەبی و خوازەیی، وەك بڵێی لە روانگەی شوێنێکی سەنعەتی وەڕێ کەوتبێتین و گەیشتبێتنە روانگەی گوندێك:

*لە وڵاتێکی بچووك و پڕ جەماوەر و پیسی وەك وڵاتی مە، مرۆڤ پیسایی بە لایەوە دەبێتە شتێکی ئاسایی. گردی زبڵ و دووکەڵکێشەکان سروشتیتر لە سەوزایی و درەخت دێنە بەرچاو و تەنانەت لە نێو دڵی دەشت و دەریشدا کەموزۆر چاوەڕوانی ئەوە دەکەن لەسەر عەرد چاوتان بە بترییەکی شکاو یان قوتوویەکی ژەنگهەڵێناو بکەوێ. بەڵام لە دەرەوەی ئێرە، بەفر دەقی نەشکابوو. هێندە قورس بارییبوو و وا وڵاتی داپۆشیبوو کە تەنیا سەرووی دیوارە بەردینەکانی لێواری سنوور، کە وەك رێگایەکی رژدی رەش بەسەر سنگی گردەکانەوە رادەخوشین، دیار بوو. هاتەوە بیرم کە د. ه. لارێنس[٢٦] لە وەسفی ئەم دیمەنە، یان شوێنێکی لێرە نیزیکدا، دەبێژێ کە گردی بەفرگر، وەك ماسوولکە، تا شوێنی گەلێ دوورە دەست، وەکوو پێلی دەریایان دێتە بەر نەزەر. ئەم شوبهاندنە، شوبهاندنێك نەبوو بە مێشکی مندا تێپەڕێ. لەبەر چاوی من، بەفر و دیوارە رەشەکان، پتر لە جلوبەرگێکی سپی دەچوون کە بە هێڵی باریکی رەش پەراوێزەکانی پڕ کراونەتەوە.*

٢٦- David Hrbert Lawrence رۆماننووس و شاعیری بریتانی. ساڵی ١٨٨٥ لە دایکبوو. رۆمانێکی ژیاننامەیی بەناوبانگی هەیە بە ناوی «کوڕان و ئەڤینداران». ساڵی ١٩٣٠ کۆچی دوایی کرد.

PDF 4 KURD

تیۆرییەکانی یاکوبسن لەبەر ئەوەی زۆریان لەسەر فۆرمالیسم پێدادەگرت و بە تەواوی لایەنی مێژوویی زمانیان وەپشت گوێ دەخست، کەوتوونەتە بەر شالاوی ڕەخنە. گومانی تێدا نییە خوازە و مەجاز بابەتەیلێکی «نەگۆڕ» نین: زمان بەردەوام لە گۆڕاندایە، هەر بۆیە کاتێك خوازەکان بڕشت و کاریگەرێتیی ئەوتۆیان نامێنێ کۆن دەکەون و «ئاسایی» دەبنەوە. ئەو مانا و چەمکەی کە یاکوبسن-یش بۆ «لایەنی شێعری» و زەقکردنەوە دەیخواست باسی ئەوە دەکات کە زمانی ئەدەبی، چەشنێك لادانە لە زمانی باو. هەندێ تیۆریست گومان لە ڕاستیی ئەم ڕایە دەکەن و پێیان وایە شتێك بە ناوی زمانی «باو» لە گۆڕێدا نییە. لە ڕاستیدا هەندێکی تری لە تیۆریستان پتری لەسەر ڕۆیشتوون و وایان لێکداوەتەوە کە زمان بە گشتی سریشتێکی خوازەیی هەیە و هەر بۆیە زمانی ئەدەبی ناچارەکی جیاوازی لەگەڵ گوتارەکانی تردا نییە. بە دڵنیاییەوە من وای بۆ دەچم کە دابەشکاری و سنووردانانێکی قەتعی و قسە هەڵنەگر بۆ گوتاری ئەدەبی و نائەدەبی، کارێکی ناڕاست و مەترسیهێن بێت، گوتاری ئەدەبی، چ لە گۆشەنیگای شێوەیی و فۆرمیکەوە و چ لە ڕوانگەی مێژووییەوە، بابەتێکی ڕێژەییە و هەر بۆیە، بەردەوام لە حاڵی گۆڕان و ناساندن و ناساندنەوە دایە. تایبەتمەندییە فۆرمیکەکانی گوتاری ئەدەبی بە جیا کردنەوە و پالاوتنی لە چەشنەکانی تری زمان، و خەسڵەتەکانی مێژوویی ئەو گوتارە لە سۆنگەی جیاوازی، یان پەیڕەوی کردن، لە گوتارە ڕەسمی و باوەکان دەردەکەون. هەڵەیە گەر وەکوو هەندێ ڕەخنەگر پێمان وابێت، زمانی ئەدەبی دیاردەیەکی تەواو زەینییە، یان بە وتەیەکی تر پێویستە بە فام و تێگەیشتنی خوێنەر، چونکی ئەو کات لایەنەیلی کۆمەڵایەتی و ئایدیالۆژیکی زمان و گوتاری ئەدەبی وەپشت گوێ دەخەین. بەڵام لە لایەکی دیکەوە، چەمکی ئەدەبیات و



«ئەدەبییەت» بوارێکی قسەهەڵگر و باس ورووژێنە و بابەتێکە بۆ پێناسە کردنەوەی سەر لەنوێ. ئەم چەمکە لە چوارچێوەی زماندا، وەکوو ئەخلاق یان هەقیقەت، بابەتێکی بەرهەست (objective) و نەگۆڕ نییە.

ڕەنگە ڕوانگەیەکی گونجاوتر کە بشێ بمانبێ ئەوەیە کە بەو ڕاستییە بزنین لە هەموو فۆرمەکانی نڤیسین و هەموو دەقێکدا، تەمهید و فرتوفێڵی زمانی و گێڕانەوەیی جۆراوجۆر بەکار دێن کە مەبەست لە بەکار هێنانیان مسۆگەر کردنی هەندێ مەعریفە و باوەڕمەندی تایبەت و دیاریکراوە. ئەم تەمهید و فرتوفێڵانە گەلێ هەمەچەشن و جۆراوجۆرن. هەندێکیان زۆر ناسراون، و ئەوەی ڕاستی بێ لەوانەیە هێندە ناسراو بن کە چیتر بە تەمهید و فرتوفێڵ لە قەڵەمیان نەدەین، و هێندێکی تریان ناباو و پڕپێچوپەنا و گرفتهێنن. ئاوڕدانەوەی بە تەنها لە دەقەیلی ئەدەبی ناهێڵێ سەرنج بدەینە "فۆرمەکانی دەقێتی"[٢٧] کە هەمیشە ئێمەیان لە خۆ گرتووە و لە ڕاستیدا لەوانەیە خاوەنی تایبەتمەندیی ئەدەبی بن، یان وەك «لایەنی ئەدەبی» خاوەن پێچوپەنا و وردەکاریگەلێك بن کە لە سۆنگەی تێڕوانینی نەریتی بۆ «ئەدەبیات» سەرنجیان پێ نەدراوە یان وەلانراون. هەوڵدان بۆ بەرتەسك کردنەوەی زمانی ئەدەبی لەسەر دەستی وشەیلێکی پالاوتە و تایبەتی (بۆ وێنە وەك «شێوەی دەربڕینی شاعیرانە» کە سەرنجی زۆربەی شاعیرانی سەدەی هەژدەی بۆ لای خۆی ڕاکێشابوو)، دەبێتە هۆی هێنانە ئارای فۆرمێکی نڤیسانی داخراو و دوا بە دوای ئەو، وەڕەزیهێن و جاڕزکەر. ئەم ڕاستییە بۆ ڕەخنەگر زۆر گرینگە کە دەشێ شارەزا و ئاگاداری هەموو جۆرە زمانێکی باوی سەروبەندی داهێنان و بەکار هێنانی دەقەیل بێت و بتوانێ ئەو دەقانە بە پێی گرینگایەتی مێژووییان،

27- The forms of textuality.

«بخوێنێتەوە». دیارە دەق بە درێژاییی مێژوو دەگۆڕێن و هۆی سەرەکیی ئەم گۆڕانەش، شێوە و چۆنێتیی کار کردنی زمانە. هەندێ زمانی ئەدەبی هەن لە پەراوێزی گوتاری باو دان و لە سەردەمێکی مێژوویی تایبەتدا پەرە بە مانا دەدەن. بەڵام ئەدەبیات، لەوانەیە پتر لە هەر گوتارێکی تر، توانایی ئەوەی هەبێت مەعریفە بگۆڕێت و زمانی داخراو و تاکبێژانەی گوتاری ڕەسمی یان باو بکاتەوە و وەگەڕی بخات. بۆ نموونە، لە شێعری «لەندەن»ی ویلیام بلێیک[٢٨] لە کتێبی «سترانەیلی ئەزموون»[٢٩]دا (١٧٩٤)،لە دێڕی سەرەتای ئەم دەقەدا " I wander thro, each charter'd street" وشەی "charter'd" بۆی هەیە دوو مانای تەواو جیاوازی هەبێت: "charter'd" مانای ڕێسا و بەڵێنی دەستەبەر کردنی دەرباری شاهانە بۆ دابینکردنی ئازادی دەدات، بەڵام بە واتای بەکرێ دان و سنووردار کردنیش دێت. واتای دووهەم ئەوەمان پێ دەڵێ کە ئازادی ئەو شتە نییە کە دێتە بەرچاو. زمانی ئەدەبی لە دەستی دێت «دال»ی بەڕواڵەت نەگۆڕ بکاتە کۆمەڵێك «مەدلوول»ی نوێ.

### ٢- گێڕانەوە:

گێڕانەوە، وێڕای زمان، بە یەکێك لە گرینگترین بوارەکانی تیۆریی ئەدەبیی مۆدێرن هاتۆتە ئەژمار. تۆژینەوەکانی گێڕانەوە ناسانەی سەدەی بیستەم، بەتایبەتی ئەو تۆژینەوانەی کە لە ئەورووپاوە دەستیان پێ کرد، بەردی بناغەی

٢٨- (William Blake) شاعیر و شێوەکاری بریتانی. ساڵی ١٧٥٧ لەدایك بووە. لە تەمەنی دوازدە ساڵییەوە شێعری نووسی. زۆربەی شێعرەکانی خۆی بە وێنە دەڕازاندەوە. ساڵی ١٨٢٧ کۆچی دوایی کرد.

29- Songs of experience.



«پێکهاتەخوازی» (structuralism) پێکدێنن و لە لێکۆڵینەوەی رووتی دەقەیلی ئەدەبی ترازاون و پێیان ناوەتە بوارگەلی بەربلاوتری کولتوور و مرۆڤناسییەوە.[٣٠] جاری وایە هەڵدەکەوێ گێڕانەوە هێندە بەڵگەنەویست یان سروشتی دێتە بەرچاو کە گرینگایەتییەکەی وەپشت گوێ دەخرێ: لەوانەیە رێك وەك زمان روون و ئاشکرا بێت یان ون و نادیار. لە لایەکی ترەوە، رەخنەگران یان تیۆری دارێژان لە ئەرەستوو بەم لاوە گێڕانەوەیان وەك ماکی سەرەکی و بنەڕەتی دەقەیلی ئەدەبی و شانۆیی و داستانی یان هۆنراوەیی لە قەڵەم داوە، هەڵبەت هەندێ شێعر و هۆنراوە هەن کە لە چاو چیرۆك یان شانۆنامە کەمتر خاوەنی تایبەتمەندی گێڕانەوەیین. بە باوەڕی ئەرەستوو شانۆنامە لە سێ پاژی سەرەتا و نێوەڕاست و کۆتایی پێکهاتووە. ئەرەستوو هەڵبەت هەندێ تایبەتمەندی پڕپێچوپەناتریشی لە چوارچێوەی شانۆی کلاسیکی یۆنانیدا شی کردەوە، وەك "Peripeteia"[٣١] ئەو شوێنەی کە کردەی داستانی گۆڕانی بەسەردا دێت یان ئاراستەکەی دەگۆڕێ. سەدەی بیستەم لە بریتانیا و ئەمریکا، شانبەشانی پەرەسەندنی رەخنەی رۆمان، و لە سەرەتای پێکهاتنی تیۆریی داستانیدا، رۆمان وەك بابەتی تۆژینەوەیلی ئەدەبی گرینگایەتیی خۆی خستە بەرچاوان. ئەو «پێشەکی»یانەی کە هێنری جیمز بۆ رۆمانەکانی دەنووسین، سەرنجی رەخنەگرانی ئەدەبیی بۆ ئەم خاڵە رادەکێشا کە شێوازی گوتنی چیرۆك

٣٠- مرۆڤناسی فەرەنسەیی کلۆد لیڤی ستراوس لە رێی لێکۆڵینەوەکانی خۆیەوە سەلماندی کە کولتووره جۆراوجۆرەکانی ئینسانی، لە سۆنگەی زمان و گێڕانەوە شاراوەکانی نێو ئۆستوورەوە، خاوەن پێکهاتەگەلی وێکچوون.

٣١- لە ئەسڵدا وشەیەکی یۆنانییە، پێکهاتووە لە peteia (کەوتن) و peri (پێش) لەوانەیە بشێ بە «وەرگەڕانی تەخت و بەخت» وەریبگێڕین.

PDF 4 KURD

لە ناوەرۆکی چیرۆك گرینگترە، و ئەم باسانەش دەستەواژەی «پۆستی نیگابان[٣٢]»ی لێکەوتەوە کە دواتر پالێودرا و بوو بە «گۆشەنیگا[٣٣]» و لەم دواییانەدا بە ناوی «بەناوەندی کردن[٣٤]»ی گێڕانەوەیی تیۆرییان بۆ دارشتووە. ئی.ئێم. فۆرستێر لە کتێبی «لایەنەکانی رۆمان[٣٥]»دا لە نێوان «چیرۆك» و «پەیرەنگ[٣٦]» (یان گەڵاڵە)دا جیاوازی داناوە و ئەم جیاکارییەش پەرەی پێ دراوە و پتر پالێودراوە.

گێڕانەوە و زمان دەکرێ وەك لایەنی شایانی یەکگرتنەوەی دەق یان گوتارە ئەدەبییەکان بێنە ئەژمار. گێڕانەوە رێگایەکە بۆ ئاوێتەی یەك کردنی یەکەکانی زمان و دامەزراندنی کۆمەڵێك پێکهاتەی گەورەتر، و کەموزۆر سەرلەبەری کاربردەکانی زمان: لە خۆگر یان دەلالەتکەری لایەنی زەمان و ئاراستە و کردەن. «بێژەر» و «بیسەر» یان «خوێنەر»، کە لە تیۆرییە جۆراوجۆرەکاندا لەسەر دەستی زاراوەگەلی جۆراوجۆر باسیان کردوون، ماکە بنەرەتی و پێویستەکانی گێڕانەوەن. رۆمن یاکوبسن لە «مۆدێلی پێوەندی»ی خۆیدا، بە «دەنگدەر» (Addresser) و «بەردەنگ» (Addressee) ناویان دەبات کە سەرلەبەری وەگێڕان (narrator) و بەردەنگان (narratee)ی گێڕانەوە دەگرێتەوە. یەکەکانی گێڕانەوە بۆیان هەیە لە ساکارترین تا بە پێچوپەناترین پێکهاتە و کارکردە زمانییەکان پێکبێنن. بە باوەڕی دوو تیۆری دارێژی سەردەم، گێڕانەوە مەرجی پێویست و حاشاهەڵنەگری زمان و مانا و مەعریفەیە. رۆلان

32- Post of observation.
33- point of view.
34- focalization.
35- Aspect of the novel.
36- plot.



بارت لە وتاری «بەرکولێك بۆ تۆژینەوەی پێکهاتەیی گێڕانەوە»دا (١٩٦٦)، سەبارەت بە گێڕانەوە بەم چەشنە دەدوێ و دەڵێ:

*«گێڕانەوەکانی دنیا، بێئەژمارن، گێڕانەوە، سەرەتا و پێش هەموو شتێك، بریتییە لە ژانرەیلی ئەدەبیی هەمەچەشن کە خۆی بە نێو بابەتگەلی جۆراوجۆردا بڵاو بۆتەوە، وەك ئەوەی بڵێی چیرۆکەکانی مرۆڤ لەگەڵ هەر ماك و پێکهاتەیەکدا دەگونجێ. گێڕانەوە لە رێگای زمانی دەربڕاو و پەیڤین یان نڤیسین و وێنەگەلی نەگۆڕ یان بگۆڕ و هێما و ئاماژە و تێکەڵاوێکی تەکووز و رێکوپێکی سەرلەبەری ئەم رەگەزانە دەگوازرێتەوە. گێڕانەوە لە ئوستوورە و ئەفسانە و حیکایەتی ئەخلاقی و چیرۆك و کورتە رۆمان و شێعری حیماسی و مێژوو و تراژیدی و شانۆنامە و کۆمێدی و شانۆی بێدەنگ و شێوەکاری («ئورسولا»ی پیرۆز بەرهەمی کارپاچیو لەبەر چاو بگرن) و شووشەکاری نەخشدار و سینەما و ئەدەبی گاڵتەجاڕی و هەواڵ و وتووێژدا بەدی دەکرێ. سەرەڕای ئەمە، گێڕانەوە بە شێوە و شکڵی جۆراوجۆر و بێئەژمار، لە هەموو سەردەم و شوێن و کۆمەڵگایەکدا ئامادەیە. گێڕانەوە لەگەڵ مێژووی مرۆڤ دەسپێدەکات و لە هیچ شوێنێك گەلی بێگێڕانەوە بەدی ناکرێ... بێئاوڕدانەوە لە جیاوازیی نێوان ئەدەبی باش و ئەدەبی خراپ، گێڕانەوە بابەتێکی نێونەتەوەیی و ئەوپەڕی مێژوویی و ئەوپەڕی کولتووریە: گێڕانەوە رێك وەك ژیان وایە، هەمیشە هەیە[٣٧].»*

37- Roland Barthes, "Introduction to structural Analysis of Narratives" in Image-music – text (London, Fontana.1977) p.79

ڕەخنەگر و تیۆریدارێژی ئەمریکایی فریدریك جیمسۆن دەڵێ: «من پرۆسەی شوێندانەری گێڕانەوە وەك كاركردی سەرەكی یان نموونەی زەینی مرۆڤ لە قەڵەم دەدەم[38].»

کەواتە، گێڕانەوە بنەمای تێفکرین و سەرومڕی نقیسین، یانی گشت شێوەکانی مەعریفە و زانیاریمان دادەمەزرێنێ یان پێکهاتەیەکی ڕێکوپێکی پێ دەبەخشێ. چاوڕەوانی ئەوە دەکرێ گێڕانەوەکانیش، وەکوو زمان، تایبەتمەندییگەلێکی هاوبەشیان هەبێت و لە هەمان کاتدا جیا لە یەك و خاوەن پێناسەی خۆیان بن. چ شتێك «ئاواتە مەزنەکان[39]» (١٨٦٢) لە «ماڵی تەریك[40]» (١٨٥٢-٣) هەڵداوێرێ؟ چۆن دەکرێ لە نێوان ئەم دوو بەرهەمە و بەرهەمێکی ئاگاتا کریستی بە ناوی «کوشتنی ڕاجێر ئاکرۆید[41]» جیاوازی دابنێین و بزانین کە ڕۆمانەکانی دیکێنزیش خاوەن تایبەتمەندیگەلێکی دیاریکراون کە لە چوارچێوەیەکی باوتر و ناسراوتردا، ئەم بەرهەمانە وەك شوێنەواری نووسەرێکی تاك وا لێ دەکەن کە خاوەن ناسنامەی خۆیان بن؟ ململانێی نێوان هاوشێوەیی یان شتی باو و جیاوازی لە نێو دڵی تیۆریی گێڕانەوەدا گرینگایەتییەکی فراوانی هەیە و بۆ ناسینی شێوازەیلی پۆلێن کردن و ڕێکخستنی فۆرمە جۆراوجۆرەکانی نقیسین، کە زنجیرە پێگە (hierarchy) هەمە چەشنەکانی مەعریفە و هەقیقەت دەخەینە پاڵ ئەوان، یارمەتیمان دەدات.

38- Fredric Jameson, The political Unconscious; Narrative as a Socilly symbolic Act (London, Metuen, 1981) p.13.
39- Great Expectation.
40- Bleak House.
41- The Murder of Roger Ackroyd.



## گێڕانەوەناسی: گێڕانەوە و گێڕانەوەگەری[42]

تۆژینەوەی تیۆریکی گێڕانەوە، یان لە ڕاستیدا ڕێزمانی گێڕانەوە بە گێڕانەوەناسی ناودێر دەکرێ. هەر وەك بابەتی زمان، یەکەم تیۆرییەکانی گێڕانەوەش لە ڕووسیای سەدەی نۆزدە و قوتابخانەی فۆرمالیسمی ڕووسی سەری هەڵدا. دواتر ڕۆلان بارت ئەم پرسیارەی هێنایە ئاراوە کە چلۆن دەکرێ گێڕانەوەکان پۆلێن بکەین و "مۆدێل"ێك بە دەستەوە بدەین کە پیشاندەری تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی گێڕانەوە بێت. بارت بۆ ئەم کارە ئەگەری دوو ڕێگای خستە بەرچاو. یەکەم، شێوازی ئیستیقرایی (لە پاژەوە بۆ گشت) کە لەم شێوازەدا هەرچی گێڕانەوەیە، یان ئەوەندەی لە توانادا بێت، لێی دەکۆڵدرێتەوە و تایبەتمەندییەکانیان تۆمار دەکرێن. شێوازی دووهەم، شێوازی ئیستینتاجییە (لە گشتەوە بۆ پاژ) کە لەودا باسی مۆدێلێکی گریمانەیی یان تیۆرییەك دێتە گۆڕێ و پاشان ئەم باسە لە بۆتەی گێڕانەوەیلی جۆراوجۆردا دەتوێتەوە و تاقی دەکرێتەوە.

وەك یەکەمین و گرینگترین تەقالا بۆ بەرهەمهێنانی "مۆدێل"ێك بۆ گێڕانەوە، تێکەڵاوێك لە هەرتك ڕێگا بەکار هات، کە بریتی بوو لە تاوتوێ کردنی نیزیکەی دووسەد نموونەی جۆرە ئەدەبێکی گێڕانەوەیی دیاریکراو، واتە حیکایەتی فۆلکلۆری، و لێکۆڵینەوە لە ڕەگەزە پێکهێنەرەکانی. مەبەست ئەوە بوو کە ئەم مۆدێلە دواتر بۆ شێوەکانی تری گێڕانەوەش بەکار بێت. ئەم ئەرکە کەوتە ئەستۆی فۆرمالیستی ڕووسی ولادیمیر پراپ (Vladimir prop) و دەسکەوتی لێکۆڵینەوەکانی لە کتێبی "ڕوخسارناسیی حیکایەتی فۆلکلۆری"دا

٤٢- پێکهاتەی ناو + گەری لە ڕێزمانی کوردیدا باوە، وەك: ئاسنگەری، کارگەری، مسگەری.

(١٩٢٨) بڵاو بۆوە. حیکایەتی فۆلکلۆری لە حەوت "بواری کردە[٤٣]" و سی و یەك "کارکرد[٤٤]"ی نەگۆڕ پێکهاتووە و لەهەر حیکایەتێکی فۆلکلۆریدا بەدیلگەلێکی جۆراوجۆر لەمانە بە کار دەبرێن: "بوارەکانی کردە"، ئەو کەسایەتییانەن کە لەم حیکایەتانەدا دیار و باڵادەستن، بۆ وێنە قارەمان، خراپەکار، یارمەتیدەر، کەسی ونبوو و کەسانی لەم چەشنە. "کارکردەکان" ئەو بەسەرهات یان کردەوانەن کە گێڕانەوە بە ئاراستەیەکی دەسنیشانکراوەوە بەرەو پێشی دەبەن. ئەنجامی تۆژینەوەکانی پراپ پێمان دەڵێ کە پێویست ناکات هەر سی‌ویەك کارکردەکە لە هەر گێڕانەوەیەکدا دووپات ببنەوە، بەڵام ئەوانەی کە هەڵدەبژێردرێن هەموو کات بە شێوەیەکی یەکسان و وێکچوو روو دەدەن. بە پێی گەلاڵەکەی پراپ، حیکایەتەکان بە "کارکردی" پێكگەیشتن کۆتاییان پێ دێت، کە هەڵبەت پێكگەیشتن هەمیشە بە واتای واژەیی خۆی، واتە "ژنهێنان" نییە، بەڵکوو دۆخی لە چەشنی وەدەست هێنانی سەروەت و سامان یان گەڕانەوە بۆ ئامێزی بنەماڵەیەکی کۆك و تەباش دەگرێتەوە. ئەو شتەی لە لێکۆڵینەوەکەی پراپدا خاوەنی گرینگایەتی‌یە، ناساندنێکی پڕبەپێستی گێڕانەوە نییە، ئەوەی راستی بێ هەر لە بنەڕەتەوە ناساندنێکی لەم چەشنە لە بابەتی پراپ بە دوورە، چونکی حیکایەتگەلی فۆلکلۆری زیاتر خاوەن گێڕانەوەیلێکی سادە و ساکارن و رووداو و بەسەرهاتەکانیان لەسەر راستە هێڵێکی زەمانیدا دەچێتە پێشێ، بەڵام ئەو شتەی ئەو کاری بۆ کردووە بە دەستەوەدانی مۆدێل یان پێکهاتەیەکی بنەڕەتی یان ناوەکیی گێڕانەوەی جۆرێکی ئەدەبیی (یان ژانرێکی) تایبەتە. ئەو بابەتەی کە پراپ پێوەی

43- Spheres of action.
44- functions.



خەریکە، ناچارەکی مەیدانی تۆژینەوەکەی بەرتەسك دەکاتەوە و تۆژینەوەکەش خۆی تەنیا لایەنی ئاسۆیی یان هێڵی زەمانیی رووداوەکانی گێڕانەوە دەگرێتە خۆ و لە لایەنی فرە رەهەند یان ئەستوونیی گێڕانەوە کە پێچوپەنایەکی پتر لە پێکهاتە و مانادا بەدی دێنێ، ناکۆڵێتەوە. لە ئاستی راڤەکاریدا، پراپ گرینگایەتییەکی فراوان بۆ لایەنی "خواست"ی گێڕانەوە قایل دەبێ و ئاکامەکانی "پێكگەیشتن" کە تێیدا خواستی شاد و شوکر بوونەوە بە کەسێك (وەکوو شازادە خاتوونێك) یان وەدەسهێنانی شتێك (وەکوو قاپێکی زێڕ) دێتە دی، وەك کۆمەڵێك خوازە بۆ نیشاندانی پێداویستیی وەرزێڕانی رووس بە خواردەمەنی لێکدەداتەوە. پراپ بۆ ئەو ئاکامانەی کە لە راستەڕێی ئەم مۆدێلە لادەدەن و ئەنجامێکی رێکوپێکیان نییە، شیکردنەوەیەکی ئەوتۆ بە دەستەوە نادات. بەم حاڵەشەوە، لێکۆڵینەوەکەی پراپ هەوڵێکی پێشەنگە کە بە مەبەستی تیۆریزە کردنی گێڕانەوە کەوتۆتە گەڕ و سەرنجی بۆ لای سریشتی پێکهاتووی گێڕانەوە راکێشاوە. کەسایەتی (character) پتر بە کەرەسە یان "کارکرد"ێك لە قەڵەم دەدرێ کە یەکێتیی بەسەرهاتەکانی حیکایەت دەپارێزێ، نە ئەوەی وەك کۆمەڵێك مرۆڤی "راستەقینە" بێنە ئەژمار بە هەندێ کار و کردەی "راستەقینە"شەوە.

لە دوای پراپەوە، گەلێ گۆڕانکاری هاتوونەتە ئاراوە کە هەندێکیان تێڕوانینێکی پێکهاتەخوازانەتریان لە هەمبەر گێڕانەوە رەچاو کردووە. رۆلان بارت پرۆسەی گێڕانەوە بۆ دوو رەگەز یان ئەرك کورت دەکاتەوە کە ناویان دەنێ "کاتالیزۆر" (catalyser) و "ناوك" (nucleus). کاتالیزۆرەکان دەورێکی پاش زەمینەیی یان ناڕاستەوخۆ دەگێڕن، لە کاتێکدا ناوکەکان "شوێنی پێكگەیشتن"ی گێڕانەوەن کە ساتەوەختی گرینگی گۆڕانکاری یان یەکپارچە

PDF 4 KURD

بوونیان سەرەتای چەشنێك ناحەتمی بوونە یان دەبێتە هۆی وەها حاڵەتێك. کەواتە لە رۆمانی "ئاواتە مەزنەکان"دا چاو بە یەككەوتنی نێوان پیپ (Pip) و مەگویچ (Magwitch) لە دەسپێکی رۆمانەکەدا وەك "ناوك"ێك بەکار دێت، وەك چۆن روونبوونەوەی دواجاری ئەم بابەتەش کە مەگویچ پشتیوانی راستەقینەی پیپ و باوکی ئێستێلایە (Estella) هەروەتر لەم گێڕانەوەیەدا وەك ناوك لەقەڵەم دەدرێ. لە کتێبی "کوشتنی راجێر ئاکرۆید"ی ئاگاتا کریستی‌دا، لەوانەیە سەرەتا وا وێبچێ کە ئامرازی تۆمار کردنی دەنگ دەوری کاتالیزۆر بگێڕێ، بەڵام دواجار دوای پێزانین بە پەیڕەنگی ئەم چیرۆکە ئەم ئامرازە دەبێتە ناوك و وەك هۆکارێکی گرینگی ئەم کوشتنە دێتە ئەژمار. چیرۆکی پۆلیسی یان پیاوکوژی زۆر جار لە رێگەی شاردنەوەی گرینگایەتی فراوانی یەکەکانی گێڕانەوەیی، تا پێش ئاشکرا بوونی نهێنیی چیرۆکەکە، کایە بەم یەکانە دەکات. تیۆریی گشتیی بارت لەمەڕ گێڕانەوە تیۆرییەکی پرپێچوپەنایە و دەشێ بە تەواوی لێی بکۆڵدرێتەوە. بەردی بناغەی ئەم تیۆرییە تۆژینەوەی پراپ و ئەوانی تر بە ئاراستەی نیشاندانی توێژە دەروونییەکانی گێڕانەوەیە، بە چەشنێك کە ئێتر ناتوانین دوای خوێندنەوەی دەق، لە ئاستی "رووکەش"ی راڤەدا بمێنینەوە.

دەکرێ وای لێکبدەینەوە کە تیۆرییەکانی پراپ و بارت دەربارەی بە گێڕانەوە، پتر باسی "ناوەرۆك" دەکەن کە بریتییە لە کەسایەتی و رووداوی چیرۆك و کات و شوێن. گێڕانەوە نەك هەر وەك کۆمەڵێك چیرۆکی لەمەڕ کەسایەتی و بەسەرهات و شوێنەکان هەڵسوکەوت دەکەن، بەڵکوو لە ئاستی گوتنەوە یان گێڕانەوەگەریی ئەو رەگەزانەشدا کارکردی خۆیان هەیە. رەخنەی نەریتی (ترادسیۆنال) بۆ لێکجیا کردنەوەی ئەم لایەنانەی دەق لە دوو زاراوەی "ناوەرۆك" و "فۆرم" کەڵکی وەرگرتووە. ناوەرۆك دەربڕی بابەتی گێڕانەوە و فۆرم پیشاندەری شێوەی



بەدەستەوەدانی ئەو بابەتەیە. لەم دواییانەدا لەگەڵ پەرەسەندنی تیۆریی گێڕانەوە، ئەم جیاکارییە کۆمەڵێك ناوی جۆراوجۆر ی پەیدا کردووە. ژێرار ژێنێت (Gerard Genette) تیۆریدارێژی فەرەنسەیی لە کتێبی "گوتاری گێڕانەوەیی[45]"دا (١٩٧٢) لە نێوان "چیرۆك" و "گێڕانەوە" و "گێڕانەوەگەری"دا جیاوازی دادەنێ. ژێنێت لەسەر بنەمای ئەم سێ چەمکە، گێڕانەوەش بە سەر پاژە پێکهێنەرەکانیدا دابەش دەکات و بەتایبەتی لەسەر دەقێتی و رەوت و پرۆسەی گێڕانەوەگەریدا پێدادەگرێ. مەبەست لە "چیرۆك" بە دوای یەکدا هاتنی رەوتی رووداوەکانە کە ژێنێت ناوی دەنێ "ناوەرۆکی گێڕانەوەیی". بۆ وێنە لە رۆمانی "بەرزاییە باگرەکان[46]"دا (١٨٤٧)، ئەگەر بڕیار بێت "دەربارەی" بە بابەتی رۆمانەکە قسە بکەین، ئەو کات دێین پوختەی چیرۆکەکە بە پێی رەوتی هێڵی زەمانی و کەسایەتی و رووداوەکانی ئەو رۆمانە دەگێڕینەوە. ژێنێت هەروەتر "چیرۆك" لەگەڵ چەمکی داهێنراوی سوسور، واتە "مەدلوول" بەراورد دەکات و هەڵیدەسەنگێنێ. مەبەستی ژێنێت لە گێڕانەوە دەق خۆیەتی، واتە زمانی گوتراو یان نووسراو یان ئەو گوتار و گفتمانەی کە چیرۆکەکەی پێ دەردەبڕدرێ و لەوانەیە رەوتی رووداوەکان سەر لەنوێ دابڕێژێتەوە و کەسایەتییەکان لەنێو بازنەی پێوەندیگەلێکی جۆراوجۆر دا لە هەمبەر یەك دابنێت کە لە گۆشەنیگای چیرۆکەوە کامڵ و تەواو نین. ژێنێت ئەم چەمکە بەرامبەر بە باسی "دال"ی سوسور دێنێتە ئەژمار. کە واتە لە رۆمانی "بەرزاییە باگرەکان"دا رووداوەکان بە پێی رەوتی هێڵی کاتی روودانیان بەدەستەوە نادرێن، بەڵکوو لە دوو توێی گەڵاڵەیەکی زەمانیی ئاڵۆزدا نیشان دەدرێن. هەروەها تا

45- Narrative Discourse.
46- Wuthering Heights.

شیکردنەوەیەکی پڕبەپێستی کەسایەتیی "هیتکلیف"مان بۆ نەکرێ، بە شێوەیەکی شایان و پڕمانا لەم کەسایەتییە ناگەین. مەبەست لە گێڕانەوەگەری، گوتنەوەی ڕووداوەکانی چیرۆك و گێڕانەوەیە کە ژێنێت ناوی دەنێ "داهێنانی کردەی گێڕانەوەیی". با دیسان ئاوڕێك لە "بەرزاییە باگرەکان" بدەینەوە. گێڕانەوەگەری یان گوتنی چیرۆك لەم ڕۆمانەدا بەتایبەت لە سۆنگەی سەرنجدان بە چەند توێژ بوونی بەپێچوپەنای دەفتەری بیرەوەریی "لاك وود" (Lockwood) و شیکردنەوەی "نێلی دین" (Nelly Dean) و چەند هۆکارێکی تری وەك نامەکان و گێڕانەوە لە زمان ئەم و ئەوەوە گرینگایەتی وەدەس دەهێنێ. گەلاڵەی زەمانییی گێڕانەوەگەریش دەگۆڕدرێ و پرۆسەی گێڕانەوە پڕپێچوپەناتر دەکات.

وا نییە هەرچی ڕۆمانە شێوازی گێڕانەوەگەرییەکی نائاسایی لەم چەشنە بەکار بێنێت، بەڵام لە لایەکی دیکەوە ئێمە دەروەستی قەراردادەکانی وەگێڕی (ڕاوی) "ئاسایی" سێهەم کەس یان یەکەم کەس هەین و هەر بۆیە هەر چەشنە ناتەبایی و ناکۆکییەکی گێڕانەوەگەری و پەیڕەنگ قبووڵ دەکەین و هەر چەشنە لادانێك لەم قەراردادانە بە تشتێکی نائاسایی لەقەڵەك دەدەین.

تیۆریداڕێژانی تریش پۆلێن کردنی لە چەشنی ژێنێتیان بەکار هێناوە. زۆر پێش ژێنێت فۆرمالیستەکانی ڕووسیا زاراوەی "fabula"یان بۆ بابەتی چیرۆك و "suzet"یان هاوواتای پەیڕەنگ بەکار هێناوە، واتە شێوازی هەڵبژاردن و ڕێکخستن و گێڕانەوەی بابەتی چیرۆك. ئەم زاراوانە لە تیۆرییەکانی تری گێڕانەوەیی هاوچەرخی فەرەنسەییدا، هاوواتاگەلێکی لە جۆری "بەسەرهات" و "گوتار"یان بۆ دادەنرێ، بەڵام ئاشکرایە کە هاوواتای بابەتە پاڵاوتەترەکانی ژێنێتن. لە ڕەخنەی گێڕانەوەییی بریتانیایی و ئەمریکایی دەیەکانی ١٩٥٠ و ١٩٦٠دا، بەر لە سەرهەڵدانی گێڕانەوەناسیی ئەورووپایی تێڕوانینێك هاتە ئاراوە



کە خاوەن پێکهاتە و بنەمایەکی تیۆریکی پڕ و پاراو نەبوو. نموونەی هەرە دیاری ئەم تێڕوانینە کتێبی "بوتیقای ئەدەبی داستانی"[47]یە (١٩٦١) بەرهەمی وین.سی. بوت (Wayne. C. Booth). بوت لەم کتێبەدا لە سەر ئەم خاڵە گرینگە پێدادەگرێ کە دەشێ بزانین گێڕانەوە لە دوو "پاژ" پێکهاتووە: "وەگێڕ" و "چیرۆك". ئەوەی ڕاستی بێ بوت ئەم زاراوانەی لەم گوتە بەناوبانگەی دی. ئێچ. لارێنس وەرگرتووە: «قەت پشت بە هونەرمەند مەبەستە. پشت بە چیرۆك ببەستە» تێڕوانینی بوت نموونەیەکی "ئەزموونباوەڕیی"[48] ئینگلیسیئەمریکایی و سەر بە قۆناغێکی پێش تیۆرییە. ئەم کتێبە لێکۆڵینەوەیەکی بەرفراوان و تا ڕادەیەك هەمەلایەنە دەربارەی کۆمەڵێکی زۆری دەقەیلی داستانی کە بوت لەسەر بنەمای وان گێڕانەوەگەرییە جۆراوجۆرەکان شەنوکەو دەکات و بەتایبەتی سەرنج دەگرێتە چەمکی "گۆشەنیگا". گەرچی کتێبی "بوتیقای ئەدەبی داستانی" تۆژەرانە نووسراوە و زۆر بە وردی لە باسەکان دوواوە، بەڵام لە ڕێگای خوێندنەوەی ئەم کتێبەوە ئەستەمە بکرێ مۆدێل یان زاراوەناسییەکی دیاریکراوی لێ هەڵێنجرێ و لەو سۆنگەیەوە باسی چەمکی گێڕانەوە بێتە ئاراوە. هەروەتر ئەم کتێبە، لە چاو ئەو تێڕوانینە ئیستیقراییەی (inductive) کە بارت هەیەتی، پتر ڕەچاوی تێڕوانینێکی ئیستینتاجی (deductive) دەکات.

تۆژینەوەی بوت لە زاراوەی "گۆشەنیگا" پێشبینی کردنێکە بۆ چەمکی "بەناوەند کردن" بەو چەشنەی کە ژێنێت ئەم زاراوەیە بەکار دێنێت. وەك چۆن ژێنێت ڕوونی دەکاتەوە، زاراوەی "گۆشەنیگا" دەبێتە هۆی تێکەڵیی دوو لایەنی

47- The Rhetoric of fiction.
48- Empiricism.

گێڕانەوە: ئەو کەسەی خەریکی گێڕانەوەیە و کەسی نێو دەق کە رووداوەکان لە چاوی ئەوەوە دەبینرێن، بە یەك کەس لەقەڵەم دەدرێن. لە کاتێکدا ئەم دوو کەسە ناچارەکی هاوواتا و یەکسان نین و لە راستیدا "وەگێڕ" (narrater) و هۆکاری بەناوەند کردن (focalizer) لە پرۆسەی گێڕانەوەدا دوو رەگەزی جوداوازن. رۆمانی "پارکی مەنسفیلد" (Mansfield Park) بەرهەمی جین ئاستن[٤٩] لە زمانی وەگێڕی سێهەم کەسەوە دەگێڕدرێتەوە، بەڵام هۆکاری بەناوەند کردنی زۆرتر "فەنی پرایس" (Fanny Price)ـە. لە گێڕانەوەی سێهەم کەسدا لەوانەیە ئەم دوو هۆکارە کەمتر هەڵکەوێ بە هەڵە لەبری یەکتر بەکار بێن، بەڵام لە گێڕانەوەی یەکەم کەسدا زۆر جار وێدەچێ کە "وەگێڕ" و "هۆکاری بە ناوەند کردن" هەر یەك کەسن. هەڵبەت پێویستە ئەم بابەتە سەرنجی وردی بدرێتێ. لە رۆمانی "ئاواتە مەزنەکان"دا، پیپ هەم وەگێڕە و هەمیش کەسایەتیی سەرەکی، بەڵام زمانی گێڕانەوەکەی زمانی پیاوێتیی پیپە، کەچی "هۆکاری بەناوەند کردنی" زۆرتر پیپی مێرمناڵە. لە دەقەیلێکی لە چەشنی "دڵی تاریکی" (١٨٩٩) بەرهەمی جۆزێف کۆنراد[٥٠] یان "گێتسبی مەزن" (١٩٢٦) بەرهەمی ئێف. سکات. فیتزجرالد[٥١]، پێوەندییەکانی نێوان "وەگێڕ" و "هۆکاری بەناوەند

---

٤٩- (١٧٧٥-١٨١٧) Jane Ausen، ژنە رۆماننووسی ئەسڵە ئینگلیسی کە بەرهەمە بەنرخەکانی بووە هۆی کۆتایی هێنان بە قۆناغی نیوکلاسیسمی سەدەی هەژدە و پێنانە نێو قۆناغی رۆمانتیسیزمی سەدەی نۆزدەوە. رۆمانی پارکی مەنسفیلدی ساڵی ١٨١٤ نووسی.

٥٠- (١٨٥٧-١٩٢٤) Joseph Conrad، رۆماننووسی ئینگلیسی و لەدایکبووی لەهێستان، لە رۆمانەکانیدا پتر باسی ئەخلاقی ناسەقامگرتووی نێو دڵی ژیانی مرۆڤ دەکات.

٥١- (١٨٦٩-١٩٤٠) F.Scott Fitzgerald، یەکێك لە باشترین چیرۆکنووسانی ئەدەبی سەدەی بیستەمی ئەمریکا.



کردن" بەپێچوپەناترن، بەڵام لەو گێڕانەوەگەرییانەی یەکەم کەس کە رووداوەکانی رابردوو لە زەمانی هەنووکەدا دەگێڕدرێنەوە، وەك نموونەکانی گۆڕین، بە دڵنیاییەوە دەکرێ ئەم دوو هۆکارە لێك جیا بکرێنەوە و فەرق و جیاوازیین لە نێوان دابنرێ. لە رۆمانی "بەرزاییە باگرەکان"دا "بەناوەند کردن"ی چەند لایەنە لە ئارادایە، واتە کەسایەتییە جۆراوجۆرەکان دەوری هۆکاری بەناوەند کردن دەگێڕن، تەنانەت دووانیان وەگێڕیشن: لاك وود و نێلی دین. پێزانین بەم پێوەندییانە، بۆ لێکۆڵینەوە لە میتۆد و رەوشتی گێڕانەوەیی و دوابەدوای ئەو سەرەتیی کەسایەتییەکان و دۆخی مەعریفە و شێوەی دەسەڵات و هێزی پێوەندیدار بەوان، لەنێو دەقێکدا گەلێ گرینگە. وەگێڕ/هۆکاری بەناوەند کردنی بە رواڵەت تێکەڵاو، لەچاو ئەو وەگێڕانەی کە بە تەواوی لێکجیان یان چەند لایەنەن، تێڕوانینێکی یەکدەستتر و رێکوپێکتر بەدەستەوە دەدات. لێرەدا بۆمان هەیە تێڕوانینی "باختین" لەمەڕ رۆمان ـ کە دەکرێ ئەم بۆچوونە بەسەر ژانرەکانی تریشدا ساغ بکرێتەوە ـ بەم شێوەیە بەرفرە بکرێتەوە کە دۆخ و گۆشەنیگاگەلی جۆراوجۆر و بە ئاشکرا یەکنەگرتوو، دەبێتە هۆی هێنانە ئارای دەقێکی دیالۆژیك (وتووێژکەر) یان کراوە کە ناخوازێ ئایدیالۆژی یان تێڕوانینێکی تاك بەسەر کەسدا داسەپێنێ. "بەرزاییە باگرەکان" لەم روانگەیەوە دەقێکی شایانی سەرنجە، چونکی هەوڵ و تەقالای "لاك وود" بۆ داسەپاندنی تێڕوانینێکی یەکگرتووی تاك سەبارەت بە رووداوەکان و لەسەر دەستی هۆکارگەلی بەناوەند کردنی ئامادەی بواری گێڕانەوەگەری بە ئەنجام ناگات. لە رۆمانی "یولیسیز" (Ulysses)ی جیمز جۆیس‌دا بە شێوەیەکی راشکاوانەتر کۆمەڵە هۆکارێکی بەناوەند کردنی جۆراوجۆر زەق دەبنەوە کە زنجیرە پێگەیەکی نەگۆڕ بەسەر دەقدا ناسەپێنن، بەڵکوو هەلی هێنانە گۆڕێی تێڕوانینگەلێکی

هەمەچەشن و کراوە و ڕێژەییتر دەڕەخسێنن. گەر ئاوڕێك لە دەقەیلی شیعری بدەینەوە، دەکرێ "دوایین دوشسی من"[52] (١٨٤٢) هۆنراوەی "براونینگ" بە نموونە بێنینەوە کە تێیدا جیاوازییەکی بەرچاو {لەنێوان وەگێڕ و هۆکاری بەناوەند کردندا} دەبینرێ. گەرچی ئەم شێعرە بە تەواوی لە زمان "دوکی فێرارا"[53]وە دەگێڕدرێتەوە، بەڵام گێڕانەوە ئەم دەرەتانە بە خوێنەرەکەی دەدات کە روانگە یان گۆشەنیگاگەلی گریمانەیی بەناوەند کردن لە دەرەوەی دەسەڵاتی وەگێڕ بەدی بێنێ تا بۆی هەبێت لەوێوە لە دوك بڕوانێ و قسانی لەسەر بکات. هۆکارگەلی بەناوەند کردنی تری نێو دەقەکە بە شێوەیەکی تەشەراوی دەخرێنە پاڵ هاوسەری خوالێخۆشبووی دوك و راسپاردەی ئۆتریشی کە لە شێعرەکەدا بەردەنگی قسەکانی دوکە. ئەوان لە ڕێگای بێدەنگیی خۆیانەوە وەك ئەوە وایە قسان بکەن و لەم سۆنگەیەوە وا لە خوێنەر دەکەن کە کەسایەتیی دوك هەڵسەنگێنێ. "سترانی ئەڤیندارانەی جێی. ئالفرێد پروفراك"[54] (١٩١٧) هۆنراوەی تی. ئێس. ئیلیۆت وەگێڕێکی تاك و تەرای هەیە، بەڵام لە ناخی ئەودا کۆمەڵێك دەنگ یان هۆکاری بەناوەند کردن هەیە کە بیرۆکەی هەبوونی کەسایەتییەکی تاك و تەنیا دەخەنە نێو بازنەی گومانەوە.

لایەنی ئایدیالۆژیکی گێڕانەوە بە شێوەیەکی بەرچاو لە تیۆریگەلی "ئاکامی" (closure) گێڕانەوەییدا دەردەکەوێ. چەمکی کۆتایی دیارە لە شێوەی کاریگەرێتیی گێڕانەوەدا زۆر گرینگە. گێڕانەوە بەسەر هێڵێکدا دەڕوات کە زۆر جار بە جۆرە لووتکە یان کۆتاییەك دەگات. شێوەی گێڕانەوەیی گێڕانەوەکان بە چەشنێکە کە دەشێ بە کۆتایی بگەن، بەڵام ئاکامی گێڕانەوە

52- My last Duchess.
53- Duke of Ferrara.
54- The love song of J. Alfred Prufrock.



لەوانەیە بە تەرزێکی ڕێکوپێك یان بە گوتەی ئی. ئێم. فۆرستێر لە کتێبی "لایەنەکانی رۆمان"دا "گردوکۆ کردنەوە"ی چیرۆك بێت یان بە شێوەی کراوەتر و لە دوو توێی کۆمەڵێك دۆخی چارەسەر نەکراو. فرانك کێرمۆد[55] لە کتێبی "واتای کۆتایی"[56] (١٩٦٦)، لە لێکۆڵینەوەیەکی بەربڵاودا سەبارەت بە دەقەیلێکی جۆراوجۆر، لەم بابەتەی کۆڵییەوە کە بەشی هەرە زۆری ئەدەب، گێڕانەوەگەلێکی لەخۆگری ئەو تێڕوانینانەیە کە ئاکام یان کۆتاییەکی دیاریکراوی وەك کارەساتی ئاخر زەمان[57] یان ئارمانجشار[58]یان هەیە. بەم شێوەیە، دەکرێ بنەمای ئەدەب بریتی بێ لە کۆمەڵێك گێڕانەوەی گەورەتر کە لە سەردەمان و کولتوورە جۆراوجۆرەکاندا لەئارادا بوون. پێشتر "نۆرترۆپ فرای" رەخنەگری کەنەدایی*،لە دەیەکانی ١٩٥٠ و ١٩٦٠دا لەمەڕ ئەو ئوستوورە سەرەتاییانەی[59] کە بەردی بناغەی ئەدەبن، بە پێداگرییەوە بەرگری لەم تێڕوانینە کردبوو. هەڵبەت لەم دواییانەدا هەندێ کۆتایی پتر لە لایەنی ئایدۆلۆژیکییەوە لێیان کۆڵدراوەتەوە و هەر بۆیە لە بری ئەوەی بە رەنگدانەوەی پێکهاتەیلی ئوستوورەیی گەورە لە قەڵەم بدرێن، بە شێوەیەکی تایبەت بە لایەنەکانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسییەوە کە دەقی ئەدەبی لەخۆ دەگرن، لکێندراون. ئەو زاراوەیەی بەم شێوە کۆتاییە بەکار هاتووە، "ئاکام"ـە کە پتر بریتییە لە کۆتایی یان خاڵێك کە لەودا بە لووتکە یان دەسکەوتی گێڕانەوە دەگەین. ئەم زاراوەیە بەتایبەتی بۆ رۆمانی سەدەی نۆزدە بەکار دێت کە هەنووکە زۆربەی رەخنەگران و تیۆریداڕێژان

55- Frank Kermode.
56- The sense of an Ending.
57- apocalypse.
58- utopia.

* لە دەقی ئینگلیزیدا گوتراوە ئەمریکایی، بەڵام فرای لە بنەڕەتدا کەنەدایییە.

59- archetypal myths.

PDF 4 KURD

بۆ ئاماژە کردن بە رۆمانێکی لەم چەشنە دەستەواژەی "دەقی کلاسیکریالیستی" بەکار دێنن. ئەم دەستەواژەیە هەروەتر بۆ ئاماژە کردن بە فۆرمەیلی نڤیسانی تریش وەك ئەدەبی داستانیی جەماوەرپەسەند و پروپاگەندە و رێکلامی بازرگانی و فیلمی زنجیرەییی تەلەڤزیۆنیش بەکار دەبرێ. چەمکی "ئاکام" ئاماژە بەو شێوازانە دەکا کە دەق، لە پێناوی تێگەیشتن و پەسند کردنی "هەقیقەت"ێکی تایبەت یان شێوەیەکی مەعریفە و زانیاری خوێنەر دنە دەدات تا لەو سۆنگەیەوە تێروانینێکی تایبەتی خۆی بۆ دنیا، بە راست یان سروشتی بزانێ. "ئاکام" راستەوخۆ وەك شتێکی هەڵقولاوی روانگەی نووسەر یان پابەندی تێڕوانینەکانی خوێنەر نایەتە ئەژمار، بەڵکوو وەك پاژێك لە هەناوی فۆرمی دەق و ستراتژییە نڤیسانییەکانی دەق و چاوەڕوانییەکانی خوێندنەوەی پێوەندیدار بە ژانرێکی ئەدەبیی تایبەتی لە گوێن رۆمان لەقەڵەم دەدرێ. کاترین بێلزی "ئاکام" بەم شێوەیە دەناسێنێ:

**چرکەساتی "ئاکام" ئەو ساتەیە کە رووداوەکانی چیرۆك بە تەواوی بۆ خوێنەر شایانی تێگەیشتن بن. بەرچاوترین نموونەی ئەم باسە چیرۆکی پۆلیسییە، کە لە چرکەساتی ئاکامدا، دوایین لاپەڕەکان، روون دەبێتەوە پیاوکوژ کێیە و هانە و ئەنگیزەی کوشتنەکەش چییە**[٦٠].

هەندێ رەخنەگر، یەك لەوان بێلزی "ئاکام" بە چەشن یان ژانرگەلێکی تایبەتی ئەدەبیات دەبەستنەوە. لە کاتێکدا رەخنەگرانی تر وایان لێکداوەتەوە کە "ئاکام" لە ناخی هەموو دەقێکدا هەیە. بەڵام وا نییە هەمیشە روون و ئاشکرا و

60- Cotherine Belesy. Critical Practice (London. Methuen. 1980). P.70.



لەبەرچاوان بێت، کەواتە ئەو بەرهەمانەی بە روالّەت کۆتایی "کراوە و نادیار و تەمومژاوی"یان هەیە، خاوەن جۆرە ئاکامێکی ئایدۆلۆژیکین.

کەوایە، گێڕانەوە بنچینەی ئەدەب و یەکێك لە رەگەزە سەرەکییەکانی تیۆریی ئەدەبییە. ئەم زاراوەیە بۆی هەیە بە مانایەکی بەرتەسك و پتر فۆرمالیستی، یان بە واتایەکی بەربلاو و زێتر ئایدیالۆژیکی بەکار بێت. ناسینی شێوازەکانی کارکرد و ئەرکی گێڕانەوە لە تێگەیشتنی دەقەیلی ئەدەبیدا یارمەتیمان دەدات، لە کاتێکدا رەخنەی نەریتی توانایی ئەم کارەی نەبوو. ناسینی گێڕانەوە هەروەتر دەستمان دەگرێ دەق و شێوەکانی تری مەعریفە و زانیاریی بەردەستی دنیای کۆمەڵایەتی خۆمان راڤە بکەین و پێوەندییان لەگەڵ پێکبێنین. گێڕانەوە لە پێناوی تێڕوانین و تێبینی {ئێمە بۆ جیهان} شێوازی تاکەکەسی و دەستەجەمعیمان ئاراستە دەکەن و زۆر جار هێندە بە چڕوپڕی شوێنمان لەسەر دادەنێن کە بە گێڕانەوە بوونیان نازانین. گوتاری ئەدەبی بەو شێوە جۆراوجۆرانەی کە بینیمان گێڕانەوە زەق دەکاتەوە و لەوانەیە بشێ بڵێین یەکێك لە گرینگترین ئەرکەکانی ئەدەب، شاندان یان دەرخستنی ئەو میکانیزم و رێگا و رەوشتانەیە کە مانا بەرهەم دێنن و زۆر جار لە گوتارەکانی دیکەدا ون و نادیارن.

PDF 4 KURD

ئەو بەستێن و بوارانەی تا ئێستا لێمان کۆڵیونەتەوە، پتر لە روانگەی فۆرمی یان پێکهاتەییەوە پێوەندییان بە ئەدەبیاتەوە بووە و زێتر دەقەوەر بوون. دەکرێ ئەم تێڕوانینانە لەو سەرەوە کە پێوەندیی نێوان ئەدەبیات و "جیهانی واقیع" لەبەر چاو ناگرن بە تاوانبار لە قەڵەم بدرێن، چونکی ئەوان دێن دەقی ئەدەبی بە شێوەیەکی سەربەخۆ و لەسەر دەستی وشەگەلێکی پسپۆڕانەی ئەو بوارە شەنوکەو دەکەن، و ئەم وشانەش پێوەندیی نێوان ئەدەبیات، و خەڵك، چ تاك و چ جەماوەر، و ئەدەبیات و ئەو رووداوە مێژووییانەی کە ئەم پێوەندییانە پێکدێنن و لە خۆیان دەگرن، دەپچڕێنێ. ئەوەی راستی بێت، ئەم تیۆرییانە بۆ روونتر کردنەوەی پێوەندیی نێوان ئەدەبیات و ئەوەی پێی دەڵێن دنیای راستەقینە و هەروەتر ئەو شتەی پێی دەڵێن مێژوو، زۆر یارمەتیبەخش و بەکەڵکن، ئەم تیۆرییانە هەر لە سەرەتاوە گومان لەم بۆچوونە باوە دەکەن کە پێی وایە ئەدەبیات جیایە لە جیهان، یان تەنیا بە شێوەیەکی بێدەسەڵاتانە و ئاوێنەئاسا جیهانمان پێ "نیشان دەداتەوە". ئەدەبیات هەر بەو رێژەیە کە بەرهەمی جیهان و پاژێك لە جیهان یان هەر پرۆسەیەکی دەلالەتگەری ترە، بەشێکیشە لە راستەقینە، یان تێڕامانێکە لەسەر ئەو راستەقینەیە. لەوانەیە وا باو بووبێت لەبری ئەوەی ئەدەبیات خۆی بە رووداوێکی کارا و کاریگەر لە قەڵەم بدەن، بە رەنگدانەوەیەکی بێدەسەڵاتانەی رووداوەکانیان زانیوە، بەتایبەتی لە سۆنگەی ئەوەی ئەم لێکدانەوەیە ئەدەبیات دەکاتە کاڵایەکی کەموزۆر "جێی متمانە" و پەرە بەم بیرۆکە ناڕاستە دەدات کە ئەدەبیات پێگەیەکی مەعنەوی یان جوانیناسانەی



سەربەخۆی هەیە: ئەم بیرۆکانە لە دابڕاندنی ئەدبیات لە ژیانی راستەقینە و جیهانی واقیع، لە چاو ئەو تێڕوانینانەی کە پێوەندییان بە تیۆریی ئەدەبییەوە هەیە، کاریگەرێتی زیاتریان هەبووە.

سەرباری ئەم قسانە، ئەدەبیات هەر لە کۆنەوە لەسەر دەستی کۆمەڵێك سەرەباسی وەك "ئەدەبیات و کۆمەڵگا" لێی کۆڵدراوەتەوە و وای بۆچوون کە ئەدەبیات سەبارەت بە خەڵکان (جا چ تاك و چ کۆمەڵ) قسەی گرینگی بۆ گوتن لە هەمبانە دایە. سەرەڕای ئەمە، دەقی ئەدەبی لە سۆنگەی ئەو رووداوانەی کە لە هەناویدا هەڵیاندەگرێ و نیشانیان دەداتەوە و هەروەتر لە سۆنگەی ئەو وەڵام و پەرچە کردارانەی کە خوێنەر لە ئاست ئەو رووداوانەدا بە دەستەوەی دەدات، یەکێکە لە گرینگترین و بنەماییترین بوارەکانی "ئەزموون"ی مرۆڤ. (هەڵبەت با ئەوەش بڵێین کە "ئەزموون" زاراوەیەکی مشتومڕهەڵگر و گرفتهێنە). ئەدەبیات بۆ تواشاکەرانی شانۆ یان خوێنەرانی تاکی جیهانی شیعر، جێگە و پێگەیەکی تایبەت و جیاوکداری[1] هەیە کە زۆروکەم لەگەڵ شێوەکانی تری گوتار ناخوێنێتەوە. تیۆرییە ئەدەبییەکان کۆمەڵێك شێوازی پالاوتە و روون و رێکوپێك بۆ ئاوڕدانەوە لە ئەدەبیات بە دەستەوە دەدەن. ئەم تیۆرییانە کەم وا هەیە خۆ لە قەرەی رێساداڕێژییەکی بێبنەمای لە چەشنی "رۆمان و کۆمەڵگا" بدەن. کۆمەڵێك تیۆری جۆراوجۆر هەن کە پێوەندییان بە چۆنێتیی ئەرك و کارکردی کۆمەڵایەتی مێژوویی ئەدەبیاتەوە هەیە و یاریدەمان دەدەن کە بۆچوون و باوەڕی خۆمان لەمەڕ ئەدەبیات و لەڕاستیدا گوتارەکانی تریش، وەکی رۆژنامە و رادیۆ و تەلەڤزیۆن،

١- "جیاوك" وشەیەکە لەبری "امتیاز" یان (privilege) بەکار دەبرێ. بۆ (privilegd) کە ئاوەڵناوە "جیاوکدار"م بەکار هێناوە.

دیاری و دەسنیشان بکەین. وای بە باش دەزانم کە لە دووتوێی سەرەباسەیلی "چینی کۆمەڵایەتی" و "نێرمایی[٢]" و زەینییەتدا لەسەر ئەم بۆچوونانە بدوێم و لە هەندێ نموونەی تیۆریی ئەدەبی کە شێوازی زانیاری و ناسیاریی ئێمە لەم بابەتانە پێکدێنن، بکۆڵمەوە. ئەم بابەتانە گەلێ لایەنی هاوبەشی بەرچاویان هەیە: کێشەگەلی پێوەندیدار بە چینی کۆمەڵایەتی بە کۆمەڵێك بابەتی سەر بە باسەیلی نێرمایی و شوناسی تاکەکەسی پەرژین کراون، بەڵام یارمەتیدەری روونکردنەوەی ئەو باس و بابەتانەن کە گەر بێت و روونی نەکەنەوە مەترسی ئەوەیان لێ دەکرێ گۆڕانیان بەسەردا بێت و بچنە ناو پانتاییەکی ئاڵۆز و نادیارەوە.

## ١- چینی کۆمەڵایەتی:

کۆمەڵگا لە قۆناغگەلێکی مێژوویی جۆراوجۆردا کۆمەڵێك گرووپی جیاوازیی بەرهەم هێناوە، بەڵام ئەم گرووپبەندییانە هەموو کات یەکسان نەبوونە، و هەروەها زمان کە دەسنیشانکەری شوناسی چینی کۆمەڵایەتییە، بە شێوەیەکی بەرچاو گۆڕانی بەسەردا هاتووە. ئەدەبیات و رەخنەی ئەدەبی لەمەڕ بابەتەیلی پێوەندیدار بە چینی کۆمەڵایەتی پێوەندییەکی دوو لایەنەیان هەبووە، لەم رووەوە کە بەشی هەرە زۆری ئەدەبیات و رەخنە وێدەچێ سەبارەت بە پرس و کێشەکانی چینی کۆمەڵایەتی کەمتەرخەم بن، و تا رادەیەك پێیان وابێت کە بەرهەمی ئەدەبی لە دەرەوەی شێوە کۆمەڵایەتییە دیاریکراوەکاندا بوونی هەیە. گەلێ جار ئەم تێڕوانینە لەم سەرچاوەیەوە هەڵدەقوڵێ کە لە نێو پرسەیلی

٢- وشەیەکە کاك ئەحمەد قازی لەبری (Gender)، کە جنسی نێر و مێ دەگرێتەوە، پێشنیاری کردووە.



پێوەندیدار بە تایبەتمەندییە جوانیی ناسییەکانی دەق چەمکی چینی کۆمەڵایەتی وەپشت گوێ خراوە یان گرینگی کەمی پێ دراوە، و یان بەو هۆیەی کە بە پێی روانگەیەکی هیومانیستی، ئەدەبیات پتر باسی ئەو "تاکانە" دەکات کە نوێنەری تایبەتمەندیی جیهانشموولی هاوبەش یان تایبەتمەندیی هێزەکیی هاوبەشی نێون هەموو پیاوان و ـ لەوانەشە هەموو ژنانن، واتە ئەو تایبەتمەندییانەی کە پێوەندی بە دۆخی کۆمەڵایەتی و ئابووریی ئەوانەوە نییە. رۆمانی "پارکی مەنسفیلد" (بەرهەمی جین ئاستین) نموونەیەك لەو دەقانەی کە نابەرامبەریی ئابووریی ئاشکرای نێوان هەندێك لە کەسایەتییەکان، کە بە سەرنجڕاکێشترین شێوە لە نێوان بنەماڵەی "فەنی" و بنەماڵەی "بێرترام"دا هەستی پێدەکرێ، تەواو "سروشتی" و ئەوەی راستی بێت لەبارەی ئەخلاقییەوە بە رەوا دەزانن، چونکی سەرنجی سەرەکیی رۆمانەکە رووی لە رەفتار و هەڵسوکەوتی تاکەکەسیی کەسایەتییەکانە، نەك رەفتاری ئەوان کەسان وەك ئەندامانی گرووپگەلێکی سەر بە چینێکی ئابووریی تایبەت. پرس و بابەتەکانی سەر بە چەمکی چینی کۆمەڵایەتی تەنیا بە پێی پێوەندییان لەگەڵ زنجیرە پێگەیەکی دیاریکراودا ئاوڕیان لێ دەدرێتەوە و ئەم زنجیرە پێگەیەش بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ خۆیا دەبێ و کاریگەرێتیی فراوانیشی هەر رێك لەم سۆنگەیەوەیە. لەوانەیە شایانی سەرنجترین مەسەلە سەبارەت بەم کێشەیە ئەمەیە کە بەشێکی فراوانی خەڵکی ئینگەلترا لە قۆناغی رۆماندا، لەنێو کۆمەڵگای رۆماندا نیشان نادرێن و نانوێندرێن، تەنانەت پێشخزمەتان یان جووتیارانیش چ ئاماژەیەکیان پێ ناکرێ. دەق دێت و سەرنجی فراوانی خۆی دەکاتە پاوانی تاقە یەك کەسایەتی و لە سۆنگەی سەرنجدانی بە ئاکاری تاکەکەسی، هۆکارەیلی کۆمەڵایەتی و هێزی ئابووری وەپشت گوێ دەخات.

فەنی پرایس، قارەمانی ژنی ئەم رۆمانە، وەك ژنێکی نموونەیی دەنوێندرێ، بەڵام لەڕاستیدا نوێنەری کۆمەڵێك بەهای چینایەتیی تەواو تایبەتە. زۆربەی ئاو باسوخواسانەی کە وەك رەخنەی ئەم رۆمانە کراون ئەم تێڕوانینانە دەسەلمێنن: بەشێکی فراوانی ئەم رەخنانە سەبارەت بە جیاوازییە وردەکانی ئاکار و ئەخلاقی تاکەکەسی‌یە کە فەنی سەری پێوەیان قاڵە، و لەسەر سەرەتیی تاکەکەسێتی پێدادەگرێ. لە ساتەوەختی ئێستادا، هەموو شوێنەوارێکی ئەدەبی بە شێوازی "پارکی مەنسفیلد" باس لە بابەتی چینی کۆمەڵایەتی ناکەن یان بۆ باسکردن لەم پرسە خۆ نابوێرن، هەروەتر هەموو شێوەکانی رەخنەی ئەدەبی، ئەخلاقی تاکەکەسی بە سەنگی مەحەکی چلۆنایەتی ئەدەبیی دەق لە قەڵەم نادەن. بەڵام ئەخلاقی تاکەکەسی بۆ بێدەنگ راگرتن یان کەم گرینگی پێدان بە پرس و کێشەگەلی کۆمەڵایەتی مۆدێل و سەرمەشقێکی گونجاو بە دەستەوە دەدات، لە هەمان کاتدا دەکرێ بە لەبەر چاو نەگرتنی ئەو پرس و کێشانە هەندێ لەو بەهایانەی کە پێوەندییەکی زۆریان بە چینی کۆمەڵایەتییەوە هەیە بسەلمێندرێن. ئاسەواری ئەدەبی و رەخنەی ئەدەبی هەموو کات پێوەندییەکی تایبەت و دیاریکراویان بە چینی کۆمەڵایەتییەوە هەیە و ئەوەی راستی بێ بەشێکی فراوانی ئەو شتەن کە پێی دەگوترێ: وشیاریی چینایەتی، بەڵام داگەڕان و ئاراستەیان لە هەمبەر چینی کۆمەڵایەتی دەکرێ گەلێ جیاواز بێت.

تیۆریی چینی کۆمەڵایەتی پتر لە بۆچوونەکانی کارل مارکس، لە سەدەی نۆزدەدا، سەرچاوە دەگرێ و شێوازی تۆژینەوەی مێژوویی و کۆمەڵایەتی و بە شێوەیەکی گشتیتر تۆژینەوەی کولتووریی ئەدەبیات بەتایبەتی لە بەرکار هێنان و سازگار کردنی (modification) تیۆریی مارکسیسم شوێنیان وەرگرتووە.



سەرەتا شایانی ئاماژە پێکردنە کە ماتیۆ ئارنۆلد کولتووری بە هۆکارێك لە قەڵەم دەدا کە بۆی هەیە ژیانی خەڵك بەرەو باشی ببات و هەر بۆیە پێی وا بوو هەوڵدان بۆ وەدەسهێنانی کولتوور و پەرەپێدان بە کولتوور خواستێکی رەوایە، لە کاتێکدا تێڕوانینی مارکس و لایەنگرانی سەبارەت بە کولتوور گەلێ جیاواز بوو. بە بۆچوونی مارکس، بەرهەمە کولتوورییەکان پێوەندییان بە گرووپەیلی کۆمەڵایەتی تایبەتەوە هەیە و مەبەست لە خوڵقانی ئەو بەرهەمانە پتر بەهێز کردنی بەرژەوەندیی گرووپی چینایەتیی چینی زاڵ یان دەسەڵاتدار، واتە چینی ناوەڕاست یان بورژوازییە، چونکی ئەم بەرهەمانە تێڕوانینێك سەبارەت بە جیهان دێننە ئاراوە کە بەرژەوەندیی چینی دەسەڵاتدار دەستەبەر دەکات، بۆ وێنە دابەش کردنی "سروشتیی" کۆمەڵگا بە کۆمەڵێك چینی ئابووریی نابەرامبەر کە ئەرك و کاری جۆراوجۆر وەئەستۆ دەگرن، یان دابین کردنی مافی دەس بەسەرداگرتنی دارایی و ماڵوحاڵ بۆ چینێکی تایبەت. بە باوەڕی مارکس، پێکهاتەی چینایەتی، بە درێژایی مێژوو، لە مانای بەربڵاوی خۆیدا، گۆڕانیان بەسەردا دێ، بە چەشنێك کە لە سەردەمی فیۆدالیدا، دابەش بوونی کۆمەڵگا بە سەر خاوەن زەوی یان ئاغاکان و جووتیار یان رەعیەتەکاندا، لە سۆنگەی بارودۆخی ئابووریی جۆراوجۆر و سیستمی چەوساندنەوەی هەڵقولاو لەو بارودۆخانە بووە. لە سەردەم و سیستمی سەرمایەداریدا، کۆمەڵێك پێوەندیی نوێ لە نێوان سەرمایەداران و بێسەرمایەکان هاتە گۆڕێ. لەگەڵ سەرهەڵدان و بیچمگرتنی کۆمەڵێك چینی نوێ، شێوەگەلێکی کولتووریی تازە سەر هەڵدەدەن و لە سەردەم و سیستمی سەرمایەداریی پیشەسازیدا، رۆمان بوو بە گرینگترین فۆرمی ئەدەبی: واتە شێوازێکی نقیسانی زاڵ کە تا ئێستا وەك ریالیسمی کلاسیك ئاماژەی پێ کراوە. مارکس "ململانێی چینایەتی"، لە

پێوەندییە چینایەتییەکانی سەردەمی سەرمایەداریدا، بە گرینگترین پرۆسەی مێژوویی لە قەڵەم دەدات، ململانێیەك لە نێوان چینی خاوەن زەوی یان زاڵ و چینە چەوساوەکانی بێبەری لە زەوی. بەر لە مارکس، هیگێل، فەیلەسووفی ئەڵمانی، وای لێکدابۆوە کە ململانێی سەرەکی لە نێوان هێزە مادی یان فیزیکییەکانی ژیان و مانای "هێزێکی جیهانیی مەعنەوییە"[3]، وزەیەك کە خەڵك لێی نامۆن، بەڵام دواجار هەر ئاشکرا دەبێت. مارکس ئەم ململانێیەی سەر لەنوێ پێناسە کردەوە، واتە هات ئەم ململانێیەی تەنیا لە بەستێنێکی مادیدا گونجاند و پێی وا بوو کە ئەم ململانێیە لەو نابەرامبەرییانەدا دەردەکەوێ کە خەڵك لە ژیانی رۆژانەیاندا هەستی پێ دەکەن. دەرەتانی چارەسەر کردنی ئەم ململانێیەش دواجار لە سۆنگەی ئەو شۆڕشەوە وەدەس دێت کە دەبێتە هۆی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی. مارکس بابەتی مەعنەوی بە جۆرە لادان و "وشیارییەکی درۆزنانە" دەزانی کە سەرنجی خەڵك بۆ بابەتەیلی مادیی راستەقینە لە مێژوودا بە لارێدا دەبات. مارکس پێی وابوو کولتوور رەنگدانەوەی ئایینێکی مەعنەویی بالادەست نییە، بەڵکوو بەرهەم و دەسکردی هێزە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانە. ئەم بیرۆکەیە، روون و ئاشکرا، لە راڤەیەکی بەناوبانگدا کە بۆچوونی باوی گۆڕی، بە دەستەوە درا:

*شێوازی بەرهەمهێنانی ژیانی مادی، ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و عەقڵانی بە گشتی دیاری دەکات. ئاگایی و وشیاری مرۆڤەکان بوونی ئەوان*

3- spiritual world force.



*دەسنیشان ناکات، بە پێچەوانە، ئەوە بوونی کۆمەڵایەتی ئەوانە کە دەسنیشانکەری ئاگایی و وشیارییانە.*[4]

نووسەرانێکی لە چەشنی بێرتۆلت برێشت کە پەرەیان بە تیۆرییە مارکیسیییەکان داوە و هەروەتر ئەو رەخنەگر و تیۆری دارێژە ئەدەبییانەی لە روانگەی مارکسیستییەوە لە ئەدەبیاتیان تۆژیوەتەوە، هەوڵ و تەقالایان بۆ پرس و بابەتی ململانێی چینایەتی تەرخان کردووە. ئەدەبیات، وێڕای بەرهەمە کولتوورییەکانی تر، {لە شوێنەواری ئەم تاقمە لە نووسەران و رەخنەگرانەدا} پتر وەك فۆرمێکی ئایدۆلۆژی دێتە هەژمار.

## ئایدۆلۆژی

ئایدۆلۆژی لە تیۆریی ئەدەبیدا بۆتە چەمکێکی گەلێ گرینگ کە لە تیۆرییەکانی مارکسیستی کە پێوەندییان بە چەمکی چینایەتییەوە هەیە وەرگیراوە، بەڵام دەکرێ سەبارەت بە جنسییەت و رەگەز و ئەو بوارانەی تریش بەکار ببردرێ کە پێوەندییان بە سەر لەنوێ بەرهەم هێنانەوەی پێوەندییە نابەرامبەرەکان بە شێوەی پێوەندیگەلێکی "سروشتی" یان "باو"ەوە هەیە. زاراوەگەلی "بە سروشتی کردن" (naturalization) و "باو نواندن" (normalization) ئاماژە بەو شێوازانە دەکەن کە بە پێی ئەوان، هەندێ بارودۆخ، بە شێوەیەکی سروشتی یان بێئەوەی گومانیان لێ بکەین، بە راست و دروستیان لە قەڵەم دەدەین. لەم بارەیەوە، شێوازەکانی مەعریفە و زانیاری و رێگا و رەوشتەکانی نواندنی ژیان، کە ئەدەبیات دەستێکی بالای لەم بوارەدا

4- Karl Marx, Preface to A contribution to the Critique of political Economy, in Marx and Engles: Selected Works Vol.I, (London, Lawrence and wishart, 1968) p.181. originally published in 1859.

هەیە، چەشنگەلێکی وشیاری و ئاگایی بەرهەم دێنیّ کە ڕێگا بە خەڵك دەدات خۆیان بەو جۆرە بنوێنن و بناسن کە بە گوێرەی وتەی مارکس، پێوەندییەکانی هێزی ئابووری لە کۆمەڵگادا دەسنیشانیان دەکەن. لەسەر ئایدۆلۆژی گەلیّ شت نووسراوە: لە ساکارترین پێناسەیدا، ئایدۆلۆژی ڕێگایەك بۆ بەیاسایی کردن و پاساو دانەوەی دەسەڵاتی چینی زاڵ و باڵادەست دێتە هەژمار، بەڵام تیۆری داڕێژانی مارکسیست جارێکی تر لەسەر ئەم مۆدێلە بنەڕەتی و ئەم بیرۆکەیە لەنگەریان گرتووە کە پێی وایە ئایدۆلۆژی "سەرخانێکە" کە ڕەنگدانەوەیەکی سادە و ساکاری بنچینەی ئابوورییە، یان پێی وایە "ژێرخانی" کۆمەڵگا گۆڕاوە و بۆتە ئایدۆلۆژی. بە دڵنیاییەوە دەکریّ بڵێین زۆربەی تیۆرییەکان، ئایدۆلۆژی بە هۆکاری بەدیهێنانی وشیاری درۆزنانە یان وەهمی لە قەڵەم دەدەن کە بارودۆخی ڕاستەقینەی مێژوو بە لاڕێدا دەبات. دەکریّ ئایدۆلۆژی بە تاریکخانەی کاروباری فۆتۆگرافی بشوبهێنین کە واقیع بەراوەژوو دەکاتەوە، بە چەشنێك کە وێنەی فۆتۆگرافیك سەراوقوون دەبیّ: ئایدۆلۆژیش لە ڕێگای بەراوەژوو کردنەوەی ڕووداو و بەسەرهاتەکانەوە هەر بەم چەشنە نیشانی خۆی دەپێکیّ. ئایدۆلۆژی زۆر جار کۆمەڵێك وێنە و ئیماژی ساکار و ئاشناش بەرهەم دێنیّ، گەرچی دەتوانیّ لە پێناوی وەشاندنی زەبری کاریگەرێتیی خۆی، شێوازی گەلیّ پڕپێچوپەنا و نائاسایی بەکار بێنیّ، وەك چۆن گەلیّ لە پڕوپاگەندە و ڕێکلامەکان بە شێوەیەکی بەرچاو ئەم ڕاستییە دەسەلمێنن. لەوانەیە شوێندانەرترین ئایدۆلۆژی هەر ئەو ئایدۆلۆژیەیە کە لێی بیّئاگاین و بیّئەوەی خۆ بنوێنیّ لە هەناوی خۆیدا هەڵمان دەگریّ و وێدەچیّ بە سانایی بە بەرگی باوەڕ و خواست و ویستی ئێمە خۆی پۆشتە دەکات.



ئەو نووسراوەیەی کە گرینگترن یارمەتی بە پەرەسەندنی تیۆری ئایدۆلۆژیکی بەخشی، وتارەکەی فەیلەسووفی فەرەنسەیی، "لویی ئالتۆسێر"[٥]ە، بە ناوی "ئایدۆلۆژی و دامودەزگا ئایدۆلۆژیکەکانی حکوومەت" (١٩٧١). ئالتۆسێر لەم وتارەدا چەمکی ئایدۆلۆژیی لە ڕێگای لە هەمبەر یەك دانانی "دامودەزگا ئایدۆلۆژیکەکانی حکوومەت" لەگەڵ "دامودەزگا سەرکوتکەرەکانی حکوومەت" هێنایە ئاراوە و پەرەی پێدا. "دامودەزگا سەرکوتکەرەکانی حکوومەت" ئەو شێوازانە دەگرێتەوە کە حکوومەت لە ڕێگەی ئامرازە ڕەسمی و بنکە دامەزراوەکانەوە، لە چەشنی پۆلیس و هێزی چەکدار و ڕێکخراوەی حکوومەتی و دامودەزگای سزادان و هتد، بە شێوەی ڕاستەوخۆ خەڵك دەخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. "دامودەزگا ئایدۆلۆژیکەکانی حکوومەت" لەو سەرەوە جیاوازن کە لە شێوەی هەڕەشەی ئایدۆلۆژیکی ڕاستەوخۆ داسەپاو خۆیا نابن، بەڵکوو لە هەناوی کۆمەڵگاوە سەرچاوە دەگرن. ئەم دامودەزگایانە بریتین لە دین، سیستمی دادوەری، پەروەردە و کولتوور، میدیا و ڕاگەیاندن و داب و نەریتە جۆراوجۆرەکانی ژیانی بنەماڵەیی. جیاوازیی نێوان ئەم دوو چەشن دامودەزگایانە لەوەدایە کە "دامودەزگا ئایدۆلۆژیکەکانی حکوومەت" وێدەچیّ لەسەر دەستی "هاوڕایی" (consensus) یان "ئیجماع" بەڕێوە بچن، واتە ئەم دامودەزگایانە وا دەنوێنن کە سروشتین و سەربەستانە هەڵبژێردراون و وەك ئالتۆسێر باسی دەکات لە هەمبەر حکوومەت یان چینی دەسەڵاتدار خاوەن "سەربەخۆییەکی ڕێژەیین".

٥- Louis Altusser (1918-1990) کارەکانی ئالتۆسێر لە دەیەکانی ٦٠ و ٧٠ی سەدەی ڕابوردوودا گەلیّ باسوخواسی هێنایە ئاراوە. ناسراوە بە شرۆڤەکاری بیر و باوەڕەکانی کارل مارکس.

لە راستیدا وا لێکدەدرێتەوە کە "دامودەزگا ئایدۆلۆژیکەکانی حکوومەت" وەك کۆمەڵێك سیستمی یاسا و ئامرازی چاوەدێری کۆمەڵایەتی، گەلێ کاریگەرتر و شوێندانەرتر لە بەکار هێنانی هەڕەشە و گوڕەشەیە، چونکی خەڵك بە خواستی خۆیان، لە پرۆسەی ملکەچی و مەندڕاگرتنی دۆخی بەردەستدا دەبنە شەریك و برابەش. ئەوەی راستی بێ ، دامودەزگا ئایدۆلۆژیکەکانی حکوومەت" توند بە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و نێرمایی و زەینییەتەوە گرێ دراون. بۆ وێنە، پەروەردە یان سیستمی دادوەری یان هەندێ فۆرمی کولتوور، پێوەندیی چینایەتیی وەك دیاردەیەکی سروشتی و نەزۆك نیشان دەدەن، بەو واتایە کە لە هەر رێگایەکەوە بۆی بچیت مرۆڤەکان پێکەوە بەرابەر و هاوسەنگن و لەم سۆنگەیەوە شێوەکانی نکوولّی کردن لە بەرابەری و هاوسەنگیی خەڵکان، لە روانگەی بارودۆخی ئابووری یان کۆمەڵایەتییەوە دەشارنەوە یان دیزە بە دەرخۆنەی دەکەن. ئالتۆسێریش وەکوو مارکس لەسەر ئەو باوەڕەیە کە وشیاری و ئاگایی لەسەر دەستی ئایدۆلۆژیکەکان بەرهەم دێت، بەڵام ئەو لەسەر ئەو شێوازانەش پێدادەگرێ کە لە سۆنگەیانەوە ئایدۆلۆژیکەکان لە رێگای سیستمگەلێکی پێوەندیدار بە مانا و باوەڕی خۆیانەوە ئەو هەلە بۆ خەڵك بڕەخسێنن تا کۆمەڵك پێوەندیی وەهمی و ناڕاستەقینە و جیا لەو پێوەندییە راستەقینەیە یان ئەو بارودۆخەی تێیدا دەژین، بەرهەم دێنن. بۆ روونکردنەوەی ئەم بابەت و بیرۆکەیە دەکرێ بڵێین لە هەندێ دەقی ئەدەبیدا، وەك "پارکی مەنسفیلد" و "ئاواتە مەزنەکان"، لەمپەڕی چینایەتی یان سەروەت و سامان، دەبنە بەردی سەر رێگەی چینی هەژار و دەسکورت و هەر بۆیە دەبنە هۆی ئەوەی ئەو شتەی کە لە ئاکار و واقیعی کۆمەڵایەتیدا نابەرابەر و ناهاوسەنگە، لە خەیاڵماندا بە بەرابەر و



هاوسەنگی بزانین. خاڵی سەرەکیی تیۆریی ئالتۆسێر ئەمەیە کە ئایدۆلۆژی مرۆڤەکان دەکاتە سووژە (subject)، بە واتای ئەوەی کە جێگە و پێگەی خەڵکان لەسەر دەستی کۆمەڵێك فۆرمی پێوەندی ئامێزی لە چەشنی رۆمان دیاری دەکرێت، یان بە گوتەیەکی تر، ئەو خەڵکانە دەبنە خاوەن زەینییەتێکی بەدەڵ تا لە سۆنگەیەوە لە رووداوەکان، بە شێوەیەکی تایبەت، بڕوانن و پێیان وا بێ لەم پرۆسەیەدا بکەرێکی سەربەست و سەربەخۆن کە بە رواڵەت دەتوانن بەو چەشنەی پێیان خۆشە دەق بخوێننەوە و راڤەی بکەن. بەڵام ئەوەی راست بێت، ئەوان لە چوارچێوەی رەمز و نیشانە و ستراتیژییەکانی دەقدا دەبەسترێنەوە و چاوەدێری دەکرێن. مەبەستی ئالتۆسێر لە "لێپرسینەوە" (interpellation) ئەو شێوازەیە کە مرۆڤەکان تێیدا دەگۆڕدرێن و دەبنە سووژە و وایان لێ دەکرێ باوەڕ بە شوناسێکی تایبەتی خۆیان بێنن، یان بە پێی ئەو خوازەیەی ئالتۆسێر بەکاری دێنێ "لێپرسینەوە" واتە چۆنێتیی "کارکێشان" لە مرۆڤەکان. چەمکی "تاكگەرایی[6]" بەردی بناغەی سیستمی سەرمایەداریی رۆژاوایە و لە باسوخواسی پێوەندیدار بە گەلێ لە گوتارەیلی کۆمەڵایەتی و کولتووری جیاجیادا دێتە ئاراوە. قسەی ئالتۆسێر ئەمەیە کە مرۆڤەکان لە راستیدا تاکانێکی سەربەست و خاوەن خواست بۆ دیاری کردنی چارەنووسی ژیانی خۆیان نین، بەڵام زۆر سانایە قەناعەتیان پێ بێنین کە وا پێیان وا بێت سەربەست و خاوەن خواستی خۆیانن.

ئایدۆلۆژی وەك چەمك بەردەوام پەرەی سەندووە و لە باسوخواسەیلی هزری و تیۆریکدا، بوارێکی مشتومڕهەڵگر و گرفتهێن بووە. ناشێ لە هەمبەر ئەو شتەی لەوانەیە پێی بڵێین "ئایدۆلۆژیی ئایدۆلۆژی" کەمتەرخەم بین، بەم واتایە

---

6- individualism.

PDF 4 KURD

که گوتارگەلی مارکسیستی و ئەوانەی تریش لافی ئەوە لێدەدەن کە وا لایەنی شاراوە یان ناڕاستەقینەی فۆرم و شێوەکانی مەعریفە و کولتوور ئاشکرا دەکەن و دەمامك لە روخساریان دادەماڵن، بەڵام لەوانەیە خۆیان وا نیشان بدەن کە بێلایەن یان خاوەن هەقیقەتن. بۆ نموونە، مارکسیزم بارودۆخی مێژوویی "راستەقینە" یان "واقیعی" لە هەمبەر هەلومەرجی ناڕاستەقینە و درۆیین دەسنیشان دەکات، و ئێمە دەبێ ئەوە بزانین کە تیۆریی مارکسیستی خۆی گوتار و گفتمانێکە کە کۆمەڵێك فۆرمی زانیاری و مەعریفە بەدی دێنێ، هەرچەندە ئەو فۆرم و شێوانە بە بەراورد لەگەڵ گوتارەیلی باڵادەستی سەرمایەداری گەلێ جیاوازن و تەنانەت دژایەتیشیان دەکەن. بەم پێودانگە، دەکرێ ئایدۆلۆژی وەك کردە و هەڵسوکەوتێکی کارا و ململانێکەر لە قەڵەم بدەین کە تەنیا هەر سەری بە پەرەپێدانی بەها باو و باڵادەستەکانی کۆمەڵگاوە قاڵ نییە، بەڵکوو لە هەمبەر فۆرمە نوێ و جۆراوجۆرەکانی مەعریفەشدا، کە خۆیان ماناگەل و فۆرمگەلێکی تری وشیاری و ئاگایی بەرهەم دێنن، رادەوەستێ یان رێگایان پێ دەگرێ. کە واتە، ناکرێ لە روانگەی ئایدۆلۆژیکییەوە ئەرکێکی پاشکەوتنخوازانە بخرێتە سەر شانی ئەدەبیات. هەنووکە دەخوازم ئاورێك لە دوو بابەتی وەرگیراو لە تیۆرییەکانی ئایدۆلۆژی بدەمەوە کە لە تیۆریی ئەدەبیدا بەکار دەهێنرێن.

## هێژمۆنی[7]

ئانتۆنیۆ گرامشی، فەیلەسووفی مارکسیستی ئیتاڵی، کە شوێنەواری خۆی لە دەیەی ١٩٣٠دا نووسی، پێشتر باسوخواسی هەندێ لە تیۆرییەکانی

7- Hegemony.



ئالتۆسێری هێنابووە گۆڕێ. گرامشی لە سەردەمی موسولینی و لەنێو بەندیخانەدا بابەتەکانی خۆی دەنووسی و بەرهەمەکانی پاش مەرگی بڵاو بوونەوە. بەرهەم و نووسراوەکانی گرامشی لەو بەستێنەدا کە هەنووکە وەك تۆژینەوەی کولتووری پێناسە دەکرێن و شوێنێکی فراوانی لەسەر ناساندنەوە و ساغکردنەوەی رەوشت (method) و ناوەرۆکی تۆژینەوەی ئەدەبیاتی نەریتیی ئینگلیزی داناوە، گەلێ کاریگەر بوونە. گرامشی وای بۆ دەچێ کە لە روانگەی مێژووییەوە، چینە دەسەڵاتدارەکان توانیویانە هەوساری رێبەرایەتی، نەك لە رێگەی زوڵم و زۆر و هەڕەشە و گوڕەشەی راستەوخۆ و راشکاوانەوە، بەڵکوو بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ و لە سۆنگەی ئەو شتەوەی کە ئەو پێی دەڵێ چەمکی هێژمۆنی، بگرنە دەست. ئەو کەسانەی کە دەکەونە ژێر رکێفی هێژمۆنیکەوە، چالاکانە لە رەوتی ملکەچ کردن و ژێردەست بوونی خۆیاندا، کە بە واتای درێژەدانە بە ژیانی گرووپە باڵادەست و زاڵەکان، بەشداری دەکەن: وەك ئەو مانایەی کە ئالتۆسێر لە "دامودەزگا ئایدۆلۆژیکەکانی حکوومەت" دەیخواست کە خەڵك تێیدا بۆ چەوساندنەوە و لارەمل بوونی خۆیان دەکەونە کار و دەبنە شەریکی شەڕ و پیلانی دژی خۆیان. گرامشی بە تایبەتی لەسەر دەوری گرینگی کولتوور لە مەسەلەی هێژمۆنیدا پێی دادەگرت، هەر بۆیە لە دەلاقەی دیدی ئەوەوە پێوەندی و راگەیاندنە جۆراوجۆرەکان هەر لە ئەدەبیاتەوە بیگرە تا دەگاتە میدیای جڤاتی، و کار و چالاکیی لە چەشنی چوونە سەیران و وەرزش کردن، هەر هەموویان کاریگەرێتی ئەم تاو و تەئسیرە فراوان دەکەن تا خەڵکان بە شێوازێك بە خۆیان و جیهانی خۆیان "مانا ببەخشن" کە ئەم چەشنە مانابەخشیە ببێتە هۆی بەهێز کردن و درێژخایەن کردنی پێوەندییە دەسەڵاتدارەکانی زاڵی کۆمەڵگا. ئەم چەشنە شێوە و فۆرمانەی مەعریفە و

زانیاری بەردەوام لە کۆمەڵگادا دەگەڕێن، بە جۆرێك کە خەڵکان لە ڕێگای جۆراوجۆر و کەمتر ئاشکراوە، پتر لەو شتەی باوەڕە باوەکانی سەبارەت بە ئایدۆلۆژی ڕێگامان پێ دەدەن، لە ئایدۆلۆژیدا نوقم دەبن. نموونەیەکی گرینگی بە کردەوە بۆ ئەم باسە، ئەو شێوە و فۆرمانەی مەعریفەیە کە بە ناوی "عورف" یان "عەقڵی باو" (common sense) شەرعییەتی پێ دەبەخشرێ و بە سروشتی لە قەڵەم دەدرێ. کارایی و بڕشتی "عەقڵی باو" وەك ڕوخسارێکی مەعریفە و فۆرمێکی زانیاری لەوەدایە کە ڕاستی و هەقیقەتی ئەو عەقڵە پێویستی بە هیچ چەشنە پاساوێکی ئەوتۆ نییە: "عەقڵی باو" وا خۆی دەنوێنێ کە بەڵگەنەویست و سروشتی‌یە و سنووری زەمان دەبەزێنێ و هەتا هەتاییی‌یە، بەڵام تا ئێستا لە قۆناغی جیاجیای مێژوودا، تێڕوانینگەلێکی تەواو دژواز لەسەر دەستی "عەقڵی باو" بەڕاست و مەنتقی لە قەڵەم دراون. گەر ئاوڕێك لە ئەرك و دەوری "عەقڵی باو" لە ڕۆمانی سەدەی نۆزدە بدەینەوە، دەبینین کۆمەڵێك کەسایەتیی لە چەشنی "جۆ گارگێری" (Joe Gargery) لە ڕۆمانی "ئاواتە مەزنەکان"، "گابریل ئۆك" (Gabriel Oak) لە ڕۆمانی "دوور لەو زەنا زەنایەی مرۆڤ شێت دەکات[8]" (١٨٧٤)، یان "کالێب گارت" (Caleb Garth) لە ڕۆمانی "میدل مارچ" (١٨٧١-٢)دا، هەر هەموویان دەکرێ بە نموونەی ئەو کەسانەیان بزانین کە وێدەچێ ئەو شتە دەکەن، کە بە پێی جۆرە مەعریفەیەکی دەروونی و حاشاهەڵنەگر، لە زاتی خۆیدا ڕاست و دروستە. ئەم کەسایەتییە لە ڕاستیدا نوێنەری ئەو بەها و بایخانەن کە پێگەی کۆمەڵایەتییان بەهێز ڕادەگرن و بەردەوامی سیستمێکی چینایەتیی دامەزراو لەسەر ئەسڵی نابەرامبەری دەستەبەر دەکەن. ڕیمۆند

8- Far from the madding crowd.



ویلیامز لە کتێبی "مارکسیزم و ئەدەبیات" (١٩٧٧)دا، هێژمۆنی بە واتای "داگیرکردنی سەرلەبەری پرۆسەی ژیان" لێکدەداتەوە. دیارە ڕوانگەی وی لەگەڵ مانای نەریتیی ئایدۆلۆژی جیاوازی هەیە کە لە چوارچێوەی بیرێکی تەسك و ڕواڵەتبینانەدا پێی وایە هێژمۆنی شایانی شوناس پێبەخشینە، بابەتێك کە بۆی هەیە ناوێکی بۆ دابنرێ. ویلیامز، هێژمۆنی بەم چەشنە پێناسە دەکات:

*سیستمی ژیاوی پێکهاتوو لە کۆمەڵێك مانا و بەها ـ بنەمایی و چارەنووسساز ـ کە چونکی وەك کردە و هەڵسوکەوت تەجرەبە دەکرێن، لە بەرامبەردا ڕەها و قەتعی دێنە بەرچاو. هەر بۆیە {هێژمۆنی} بۆ زۆربەی هەرە زۆری ئەندامانی کۆمەڵگا مانایەکی پێکهاتوو لە ڕاستەقینە و واقیع بەدی دێنێ، و جۆرە قەتعییەت و حەتمییەتێك دێنێتە ئاراوە، چونکی بۆ زۆرینەی ئەندامانی کۆمەڵگا ئەستەمە بتوانن لە زۆر بواری ژیانیاندا سنووری ئەم واقیعە تەجرەبەکراوە ببەزێنن. بە وتەیەکی تر، {هێژمۆنی} بەتایبەتیترین مانای خۆی یەك "کولتوور"ە، بەڵام کولتوورێك کە بریتیشە لە باڵادەستی و ژێردەستی چینەیلێکی کۆمەڵایەتی تایبەتیش.*

ڕەنگە یەکێك لە هۆیەکانی کاریگەریتێیی بەبڕشتی ڕۆمان، وەك شێوەیەکی ئایدۆلۆژی لە سەدەی نۆزدەهەمدا، بریتی بێ لەو کۆمەڵە ئەزموونەی کە بە دەستەوەی داوە، واتە ڕۆمان بە یارمەتی خواستن لە گوتارەیلێکی باوی چەشناوچەشن کە گەلێ جار تەواوکەر و پشتیوانی یەکترن کاریگەرێتییەکی فراوانی هەبووە، گەرچی زۆر جار گەیشتن بەم ئاستە بە مانای تێپەڕین بە ڕێگایەکی ڕژددا بووە. بەم چەشنە ڕێگا نەدەدرا کۆمەڵێك دژوازیی سەرئێشەهێن بێنە ئاراوە.

PDF 4 KURD

هێژمۆنی، وەکی ئایدۆلۆژی، چەمکێکی مشتومڕ هەڵگرە. دەکرێ شێوەگەلێکی دژی هێژمۆنی بێنە گۆڕێ و بەها باڵادەستەکان و سیستمی زانیاری و مەعریفە تووشی گۆڕانکاری بکەن. ئاشکرایە ئەدەبیات مەیدانێکە ڕێگای ئەوەی هەیە تێیدا باسوخواسی هێژمۆنیکی بێتە ئاراوە، و لە ڕۆمانێکی وەکوو "مرۆڤدۆستانی ڕەشوڕووت"[9] (١٩١٤) بەرهەمی ڕابێرت ترێسێڵدا (Robert Tressell) ڕێساکانی عەقڵی باو مشتومڕیان لەسەر دەکرێ و هەندێ ڕێوشوێنی هەڵبژاردەی تر بۆ تۆژینەوە لە پێوەندیی چینایەتی و کاری ئابووری لە بری ئەوان دێنە ئاراوە.

## گوتار[10]

زاراوەی "گوتار" تا ئەم شوێنەی کتێبەکەمان گەلێ جار بەکار هێنراوە و دەکرێ بە دوو واتای "زمان" یان "نڤیسان" لێکبدرێتەوە. بەڵام "گوتار" کۆمەڵێك مانای تایبەتی هەیە کە زۆر جار پێوەندییان بە نڤیسان یان زمانەوە نییە و بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە بۆ ئەم دوو واتا ئاماژە پێکراوە ڕێگا خۆش کردنێك بوو بۆ ئەم پاژەی کتێبەکەمان. زاراوەی "زمان" لەخۆگری ئەو بیر و بۆچوونانەیە سەبارەت بە جیهان و مانا، کە لەوانەیە بە دیاردەیەکی ئاسایی و باو بێنە ئەژمار، واتە ئێمە لەڕاستیدا هیچ کات لە پێوەندییەکانی نێوان زمان

9- The Ragged Trouserd philanthropists.

١٠- (Discourse): ئەم وشەیە چەندین مانای لێك نیزیکی هەیە، دەربڕینی سەرزارەکی لە شێوەی ئاخافتن یان نووسراوە، وتووێژ، مشتومڕ، و مانا کۆنەکەی پرۆسە یان وزەی لێکدانەوە. وێدەچێ "گوتار" هاوسەنگێکی گونجاو بێت بۆ ئەم زاراوە گرینگەی تیۆریی ئەدەبی.



و مانا و جیهان ناکۆڵینەوە یان گومانیان لێ ناکەین، چونکی بوونی ئەم پێوەندییانە بە گریمانەیەکی گومان هەڵنەگر لە قەڵەم دەدەین. هەر وا کە لە بەشی تەرخانکراو بۆ زماندا بینیمان، گەلێ جار وا بیر دەکرێتەوە کە زمان ئامرازێکی نەزۆك و بێهەڵوێست یان ڕوون و بێتەمومژە بۆ وێنا کردنی جیهان، و مانا نەك لە خودی زمان، بەڵکوو لە جیهانەوە سەرچاوە دەگرێ. زاراوەی "گوتار" نوێنەری ئەلترناتیڤێکی (هەڵبژاردەیەکی) بنەڕەتی و تیۆریك بۆ ئەم تێڕوانینەیە و پێی وایە مانا و ڕاڤە یان مەعریفە و زانیاری ئێمە لەمەڕ جیهان لە کانیی زمانەوە هەڵدەقوڵێن: کەواتە، زمان سەرچاوەی ڕاڤەی ئێمەیە بۆ واقیع و بەرپرسی بەرهەمهێنانی مانایە. پێشتر، سوسور ئەم تێڕوانینەی لە زەمینەیەکی زمانیدا بەم چەشنە باس کردبوو کە هیچ مەدلولێك بە بێ دال بوونی نییە و مانا یان دەلالەت ناتوانێ بە بێ‌نیشانە یان زمانێك کە دەریببڕێ و خۆیای بکات بەدی بێت. بەڵام دەلالەت و دەرکەوتەکانی ئەم تێڕوانینە لە گۆشەنیگای کۆمەڵایەتی و ئایدۆلۆژیکەوە گەلێ فراوانترن. لە تیۆرییەکانی دەیەی ١٩٦٠دا ئەم بۆچوونە هاتە ئاراوە کە زمان و ڕووداوە کۆمەڵایەتی و مێژووییەکان بە شێوەیەکی لێکدانەبڕاو پێکەوە پێوەندییان هەیە و هەندێ دۆخی تایبەت، کۆمەڵێك زمان بەرهەم دێنن کە ئەم زمانانەش لە شوێنی خۆیدا کۆمەڵێك ڕووداو بەدی دێنن و شێوەی تایبەتیان پێ دەبەخشن، زمان لەسەر دەستی کۆمەڵێك پێوەندیی کۆمەڵایەتیی تایبەت بەرهەم دێت کە لە کات و شوێنێکی دیاریکراودا وەدەستیان دێنێ. زمانێکی لەم چەشنە هیچ کات نەزۆك یان لەباری ئایدۆلۆژیکەوە بێلایەن نییە، بەڵکوو بۆ گوازتنەوە و گەیاندنی هەندێ شێوەی تایبەتی مەعریفە و زانیاری لەبەر چاو گیراوە تا کۆمەڵێك دەسکەوتی دیاریکراو، زۆرتر بۆ دەسەڵات و حکوومەت، دەستەبەر

بکرێ. ئەم تێڕوانینە کە زمان چەشنێك چاوەدێریکردنی سیاسی و کۆمەڵایەتییە کە تێیدا "هەقیقەت" بابەتێکی رەها و ئایدیال نییە، بەڵکوو رێژەیی و بەرژەوەندیخوازانەیە و تەنها لە بەستێنێکی مێژوویی تایبەتدا کاری خۆی دەباتە پێش، تێڕوانینێك بوو کە میشێل فۆکۆ[11]، فەیلەسووفی فەرەنسەیی، زۆر رێکوپێك و بەبڕشت پەرەی پێدا. فۆکۆ زۆر جار ئەم قسەیەی دووپات دەکردەوە کە تەنیا لە رێگای بەرهەمهێنانی هەقیقەتەوە دەتوانین هێزی خۆمان وەگەڕ بخەین:

*ناکرێ مێژووی رۆژاوا لە شێوازی بەرهەمهێنانی "هەقیقەت" و کاریگەرێتییەکانی جیا بکرێتەوە. ئێمە لە کۆمەڵگایەکدا ژیان بەسەر دەبەین کە تا رادە و رێژەیەکی زۆر هاوشان لەگەڵ هەقیقەت بەرەو پێشەوە دەڕوا. مەبەستم ئەوەیە بڵێم کە کۆمەڵگای ئێمە گوتارێك بەرهەم دێنێت و وەگەڕی دەخات کە خاوەن کارکردی هەقیقەتە، گوتارێك کە وەك هەقیقەت لە قەڵەم دەدرێت و خاوەن هێزێکی تایبەتییە.*[12]

دەکرێ جیهانی کۆمەڵایەتی پێکهاتوو لە کۆمەڵێك گوتار بزانین کە لە سۆنگەی کۆمەڵێك بنکە (institutaion)وە سەرهەڵدەدەن و هەر لە دەور و بەری ئەو بنکانە دەکەونە گەڕ کە خۆیان پاژێك لەوانن: بۆ وێنە، لە کۆمەڵگای هاوچەرخدا دەکرێ بە راشکاوی گوتارەیلێکی لە چەشنی سیستمی داد،

١١- Michel Foucault (1926-1984)، فۆکۆ هەوڵی دا ئەوەمان نیشان بدا کە ئەو باوەڕە سەرەکی و بنەڕەتییانەی خەڵکان بە شێوەیەکی ئاسایی بە هەقیقەتگەلێکی هەتاهەتایی لە قەڵەم دەدەن، سەبارەت بە سریشتی مرۆڤ و کۆمەڵگا، لە رەوتی مێژوودا گۆڕانیان بەسەردا دێ.

12- Michel Foucault, interview in the History of sexuality (London, Allen lane, 1979).



پزیشکی، یان فیزیکی ناوەکی بناسینەوە، گەرچی لەوانەیە هەموو کات لەو هێز و توانایییە ئاگادار نەبین کە ئەوان لە سەر ژیانی ئێمە وەگەڕی دەخەن. بەڵام گوتارەکان یان یەکگرتوو و پێکەوە یان دژی یەك و دوور لە یەك ئەرکی خۆیان بەڕێوە دەبەن. بۆ وێنە، لە سەدەی نۆزدەدا دوو گوتاری گشتیی ئایین و زانست بە شێوەگەلی جۆراوجۆر دژی یەکتر رادەوەستان، بەڵام هەوڵ و تەقالای یەکگرتنەوە و قەناعەت بە یەکتر هێنان یان دۆزینەوەی رێگا چارە بەردەوام بوو. گوتارگەلێکی تریش هەن کە تا ئەم رادەیە روون و رەسمی رەگیان دانەکوتاوە، بەڵام لەوانەشە کارایی و کاریگەرێتییان هەر لەم سۆنگەیەوە بێت. لە مێژووی رۆژاوادا، گوتارەکانی نێرمایی و رەگەز (race) هەندێ گۆڕانکارییان بەسەردا هاتووە، بە چەشنێك لە سۆنگەی ئەم گوتارانەوە، هەندێ دەستە و گرووپ زاڵ بوونە و ژێردەستی و ملکەچی ئەوانی تریش وەك بابەتێکی ئاسایی و سروشتی لە قەڵەم دراوە. ئەم خوو و خەسڵەتەی گوتارەیلی نێرمایی و رەگەز بۆ گەلێ گوتاری تریش چووە. گوتارەکان بۆیان هەیە تێکبتەنرێن، بە چەشنێك کە لە بنکەیەکی تایبەتدا کە گوتارێکی دیاریکراو بەڕێوە دەبات، لەوانەیە کۆمەڵێك گوتاری دیکە بکەونە کار کە پێکهاتەیەکی بەرفراوانتری هێزی کۆمەڵایەتی جێگیر دەکات. بۆ نموونە، تا ئەم دواییانەش لە گوتاری رەخنەی ئەدەبیدا گریمانەی سەرەکی ئەوە بوو کە سەرلەبەری خوێنەرانی ئەدەبی پیاون، لەبەر ئەوەی گەلێ جار کە ئاماژە بە خوێنەر کراوە جێناوی پیاو (he)یان بەکار هێناوە. ئەم نموونەیە پێمان نیشان دەدات کە نابەرامبەری جنسی چۆنچۆنی دەبێتە بابەتێکی سروشتی و ئاسایی.

ئەدەبیات دەکرێ خۆی وەك گوتارێك لەقەڵەم بدرێت کە بوارێکی تایبەت لەخۆ دەگرێ، گەرچی جێگە و پێگە و کار و ئەرکی تۆژینەوەی ئەدەبی، وەك

پێشتر باسم کرد، بە شێوەیەکی بەرچاو سەرلەنوێ پێناسە کراوەتەوە. وەك زانیمان، گوتاری ئەدەبی کۆمەڵێك تایبەتمەندیی زمانیی دیاریکراوی هەیە و شێوەگەلێکی تایبەتی "هەقیقەت و راستی" بەرهەم دێنێ. بەڵام دەقەیلی ئەدەبی گوتارەکانی تریش دەگرنە خۆ. ئەوەی راستی بێ لەوانەیە ئەدەبیات لە سۆنگەی ئەوەی لە نێوان گوتارە کۆمەڵایەتییەکاندا سەربارترینیانە بناسرێتەوە، واتە کۆمەڵێك گوتاری گەلێ جیاواز و جۆراوجۆر بە قەرز وەردەگرێ و ئاوێتەی یەکیان دەکات. رۆمانی سەدەی نۆزدە نموونەیەکی پڕ بەپێستی ئەم باسەیە، چونکی هەموو چەشنە گوتارێ، ئابووری و زانستی و ئایینی و بنەماڵەیی و ئەخلاقی و هتد، تێکەڵ بە یەك دەکات. لە زەمینەی کۆمەڵایەتی و دەقەیلی ئەدەبیدا، گوتارەکان زۆر جار لەسەر زنجیرە پێگە (هیرارکییەت)یەکدا جێگر دەبن کە تێیدا گوتارێکی زاڵ و باڵادەست، دەسەڵاتی خۆی بەسەر گوتارەکانی دەوروبەریدا دادەسەپێنێ. ئەم حاڵەتە لە رۆماندا هەم لەسەر دەستی گوتاری گێڕانەوەیی دێتە ئاراوە، کە تێیدا دەنگی وەگێڕ و دەسەڵاتی خۆی بەسەر ئەو رووداوانەدا دادەسەپێنێ کە باسیان دەکات، هەمیش لە رێگەی ئەو گوتارە رەگ داکوتاوە جۆراوجۆرانەی کە لە گێڕانەوەدا بوونیان هەیە. بۆ وێنە، لە رۆمانی "پارکی مەنسفیلد"دا گوتارگەلی خاوەندارێتی و چینی کۆمەڵایەتی و پێوەندیی بنەماڵەیی تێکەڵ دەبن تا هەندێ کەسایەتی و هەڵوێستی ناو رۆمانەکە بکەن بە ناوەندی سەرنج و دەسەڵاتیان پێ ببەخشن و ئەوانی تر بەرەو پەراوێز راماڵن و بەرەبەرە بیانسڕنەوە. رۆمانی نموونەیی (typical) سەدەی نۆزدە، بوارێکە بۆ وتووێژی نێوان گوتارە چەشناوچەشنەکان کە تێیدا هەندێ هەڵوێستی شایانی پەسند کردن بەرهەم دێت. نموونەی باشی ئەو شێوازەی کە تێیدا گوتارە نەیار یان دژ بە یەکەکان بۆیان هەیە یەك بگرنەوە، رۆمانی



"هاوسەران و کچان"[13] (٦-١٨٦٤)ی "ئیلیزابێت گاسکێل"[14]ە کە دژایەتی نێوان ئایین و زانستی سروشتی و هەروەتر دژوازیی نێوان چینی نێوەڕاستی تازە سەرهەڵداوی پیشەوەران و چینی بنج داکوتاوی خاوەن زەوی، بە کردەوە و بە شێوەی خوازەیی لە رێگەی ژیانی هاوبەشی و هاوسەرێتییەوە چاریان دێت.

گەر سەرەتا دەقێك لەبری ئەوەی بە پێوەری کۆمەڵێك بابەتی نەریتیی لە چەشنی کەسایەتی و پەیڕەنگ و ئەخلاق تاوتوێی بکەین، لە روانگەی گوتارەوە لێکی بدەینەوە،خوێندنەوە و مانای تەواو جیاواز بەرهەم دێن، واتە کۆمەڵێك پێوەندیی دەقیی نوێ دێنە ئاراوە کە تێیدا کار و کردەی مێژوویی و ئایدۆلۆژیکی لەبۆ تێگەیشتن ساناتر دەبنەوە. دەقەیلی ئەدەبی هەم دەسکردی مێژوون، هەمیش شایانی باسوخواسی مێژووین کە تێیدا، ململانێ و دژوازییەکانی سەردەمێك دەکەونە بەر باس و لێکۆڵینەوە، تا خواست و داگەرانە دژ بەیەکەکان هاوسەنگ ببنەوە یان بشاردرێنەوە، یان پێکهاتە باڵادەست و رەگ داکوتاوەکانی دەسەڵات بگۆڕدرێن.

## رەخنەی مارکسیستی

لەم قۆناغەدا، بەدەستەوەدانی چەند نموونەیەکی رەخنەی مارکسیست ـ تەوەر یارمەتیدەر و بەکەڵکە. بۆ ئەم مەبەستە، باسی چەند رەخنەگرێك دەکەین کە لە روانگەیەکی جیا لە روانگەی رەخنەگرانی هیومانیست (مرۆڤگەرا) لەمەڕ ئەدەبیاتیان کۆڵیوەتەوە. سەیر نییە گەر دەبینین کە سەرنجی سەرەکیی ئەم چەشنە رەخنەیە سەرەتا رووی لە رۆمان و، بەتایبەتی رۆمانی

13- Wives and Daughters.
14- Elizabeth Gaskell.

PDF 4 KURD

سەدەی نۆزدەهەم، بوو. مارکس لێکۆڵینەوەی ئابووری و کۆمەڵایەتیی خۆی بۆ ئەم سەردەمە تەرخان کردبوو و خۆیشی خوێنەرێکی تامەزرۆی ڕۆمانەکانی دیکێنز بوو. بە گشتی بابەتی نووسراوەکانی ڕەخنەگرانی مارکسیست پتر کۆمەڵایەتی بووە، نەك تاکەکەسی. ئەم نووسراوانە خۆیان بە لایەنی کۆمەڵناسانەی دەقی ئەدەبییەوە سەرقاڵ کردووە کە لە گەڵ دەروونشیکاری کەسایەتیگەلی تاك دژایەتی هەیە. لە شیکردنەوەی بارودۆخی کەسایەتییەکاندا، زۆر جار لە هۆگەلێکی کۆمەڵایەتی و مێژوویی بەربڵاو دەکۆڵدرێتەوە کە کەسایەتی وەك بەرهەم و دەسکەوتی ئەوان لە قەڵەم دەدرێن. لە دەیەکانی ١٩٢٠ و ١٩٣٠دا، کۆمەڵێك گۆڕانکاریی بەرچاو لە ڕەخنەی مارکسیستی هاتە ئاراوە کە پتر لە سەر بابەتی "ڕیالیزم" چەقی بەستبوو. بەناوبانگترین و ڕەنگە شوێندانەرترین ڕەخنەگری ئەم بوارە، جۆرج لۆکاچی مەجارستانییە کە کارەکانی پتر سەبارەت بە ڕۆمانی سەدەی نۆزدەهەم و پرسەیلی پێوەندیدار بە ڕیالیزم بوو. لۆکاچ وەك زۆربەی ڕەخنەگرانی مارکسیستی سەردەمی خۆی، پێی وایە ڕۆمان دەشێ لە ڕوانگەی توانایی و بڕشتییەوە بۆ نواندنی بارودۆخی مێژوویی و مادی کۆمەڵگا هەڵسەنگێندرێ و ئەمانە پێوانەی سەرەکیی دەسنیشان کردنی ڕیالیزم لە ڕۆماندان. تۆژینەوەکەی ڕالف فاکس (Ralph Fox) بە ناوی "ڕۆمان و خەڵکی" (١٩٣٧) نموونەیەکی پڕ بەپێستی کاری ڕەخنەگرێکی مارکسیستی ئینگلیزیی سەر بە هەمان قۆناغە کە چەشنە ڕوانینێکی هاوشێوەی هەیە. ڕیالیزم بریتی نییە لە تواناییی دەق بۆ نواندنی ڕەسەنایەتی یان نیشاندانی بە ڕواڵەت ڕێکوڕاستی دیاردەکان لە ڕێگای وەسف کردنی بابەتیانە و وردبینانەوە، بەڵکوو بریتییە لەوەی ئەو دەقە تا چەندە دەبێتە ئاوێنەی باڵانوێنی پێوەندیگەلی بنەڕەتیی مێژوویی، و "گشتێتی



چڕوپڕ"[15]ی بەرهەمێکی هونەری چۆنچۆنی لەگەڵ "گشتێتی بەربڵاو"[16]ی ڕوانگەی مارکسیستی بۆ مێژوو پێوەندی پێکدێنێ. ئەوەی ڕاستی بێ، تێڕوانینی لۆکاچ سەبارەت بە ئەدەبیات تەواو ئایدیالیستییە، با بە ڕواڵەت دژی میتافیزیکی بێت. لۆکاچ زۆر لەسەر ئەم بابەتە دەڕوات کە کەسایەتییەکان پاژێکن لە زەمینەیەکی گشتیی کۆمەڵایەتی و مێژوویی، گەرچی لەوانەیە سەرنجی وی دژی تاك خۆ بنوێنێ. لۆکاچ و مارکسیستەکانی تر سریشتی زەینگەرایانە و تاقیکارانەی زۆربەی شوێنەواری مۆدێرنیستی ڕەت دەکەنەوە، چونکی (بە ڕای ئەوان) ئەم ئاسەوارە لەرادە بەدەر خۆیان بە زەینییەتی تاکە کەسییەوە خەریك دەکەن و ڕوانگەی "بابەتی" (objective) وەپشت گوێ دەخەن. بەڵام لۆکاچ لە بەراورد کردنی دیمەنی پێشبڕکێی سوارکاریی "نانا" (١٨٨٠) بەرهەمی ئیمیل زولا و "ئاناکارنینا" (٦-١٨٧٤) بەرهەمی تۆلستۆی، بەرهەمی دووهەم بە سەرکەوتوو دەزانێ، چونکی کەسایەتییەکان لە دەروونەوە دەبینرێن و بێبەری لە خەسڵەتی مرۆڤانە و بێگیان نین. سەرباری ئەوە، ڕالف فاکس نوێنەری دژایەتیی ڕەخنەگرانی مارکسیستە لە بەرامبەر وەسف و تیۆریی پێوەندیدار بە شێوە تۆکمە و چڕوپڕەکانی تاکگەرایی:

*بێ گومان، دەروونشیکارانی سەردەمی نوێ تارادەیەکی فراوان زانیارییان بە خەزێنەی مەعریفەی ئێمە زیاد کردووە و ئیمرۆ گەر ڕۆماننووسێك هەڵکەوێت و بەشی ئەوان لەبەرچاو نەگرێ، ئەوە بە ئەندازەی بابایەکی بێ ئاگا لە دنیا نەزانە، بەڵام ئەم دەروونشیکارانە بە هیچ کلۆجێك نەیانتوانیوە تاك*

15- intensive totality.
16- extensive totality.

*وەك گشتێتی و وەك تاكێكی كۆمەڵایەتی چاو لێ بكەن. ئەوان بەردی بناغەی تێڕوانینێكی هەڵەیان سەبارەت بە ژیان دامەزراندووە و هەر ئەم تێڕوانینە بۆتە هۆی ئەوەی كە پرووست و جۆیس تاكە ئامانجی هونەر نەك لە خوڵقاندنی كەسایەتیدا، بەڵكوو لە لێكهەڵوەشانەوەی ئەودا ببینن.*

*دەروونشیكاری و زانستی هەڵكۆڵینی ناخ، سەرەڕای تۆژینەوەی زیرەكانە و ئازایانەی لەسەر قووڵاییی شاراوەی كەسایەتی، هەرگیز بەم هەقیقەتەی نەزانیوە كە تاك تەنیا لە گشتێتییەكی كۆمەڵایەتی و یاسا و ڕێساكانی ئەم گشتێتییە كە وەك ئەو كۆمەڵە تیشكەی كە لە بلوورێك تێدەپەڕێ و لە دەزگای دەروونیی هەر تاكێكدا لێكدەرەوێتەوە و دابەش دەبێ، سریشی هەر تاكێك دەگۆڕێ و دەیخاتە ژێر ركێفی خۆیەوە.*

هەڵبەت ڕەخنەگرانی ماركسیست، وا نییە بڵێین هەر هەموویان لە گەڵ تاقیكاری و داهێنان دژایەتییان كردبێت. لە سەردەمی شۆڕشی ڕووسیادا، بەر لە گەڕانەوە بۆ تیۆرییە نەریتیترەكانی ریالیزم لە ڕووسیا، وەك چۆن پێشتر باسمان كرد، تیۆری داڕێژانێكی رادیكاڵی لە چەشنی ویكتۆر شكلۆفسكی وایان لێكدەداوە كە ئەدەبیات دەشێ سەرسووڕهێن بێ، "ناسیاوی سڕینەوە"[17] بێنێتە ئاراوە و بۆچوونی ئێمە لە بابەتی باو بەراوەژوو بكاتەوە. دوو كەس لە ڕەخنەگرانی ماركسیستی دەیەی ١٩٣٠، كۆمەڵێك ڕێكاری تیۆریك و ڕەخنەگرانە و داهێنەرانەیان هێنایە ئاراوە كە لە چاو تێڕوانینی لۆكاچ، دەربارەی ئەدەبیات، بۆچوونێكی تەواو جیاوازە. بێرتۆلد برێشتی شانۆنامەنووس، لە ڕێگای تێكشكاندنی داب و نەریتە باوەكنی ریالیزم لە شانۆدا، پەرەی بە چەمكی ناسیاوی سڕینەوە دا. برێشت لەبری هەوڵدان بۆ

17- defamiliarize.



بەدیهێنانی وەهمی واقیع لە سەر سەكۆی شانۆ، میكانیزمی داهێنانی بۆچوونێكی ناڕاستی لەم چەشنەی بۆ شانۆ هێنایە بەر چاوان تا تماشاكەر لەسەر ئەو كردە داستانییەی كە پیشان دەدرێت، بە وردی بیر بكەنەوە و لە شێوەكانی بەرهەم هاتنی خورد ببنەوە و ئەلتەرناتیڤی مومكینی بۆ لەبەر چاو بگرن. ئەو زاراوەیەی كە برێشت بۆ ئەم تەكنیكە بەكاری دێنێ "تاو و تەئسیری نامۆیی"[18]یە. كارەكانی برێشت ئەوەمان پێ دەڵێن كە گەر شانۆ لەبری بەدەستەوەدانی "واقیعی" وەهمی، وەك بابەتێكی داهێنراو بنوێندرێ و شانۆنامەش تێڕامانێك بێت لەسەر كۆمەڵگا، ئەو كات كۆمەڵگاش خۆی وەك بابەتێكی داهێنراوی لێ دێت، داهێنراوێك كە بۆی هەیە گۆڕانكاری بەسەردا بێت. ئەدەبیات لەبری ئەوەی نوێنەرێكی خەسیو بێت و پەرە بە بەها و ڕێسا رەگ داكوتاوەكانی كۆمەڵگا بدات، دەتوانێ هۆكارێكی هەڵسووڕ یان كاتالیزۆرێك بۆ گۆڕانكاریی كۆمەڵایەتی بێت. لۆكاچ پێی وا بوو ریالیزم هەڵگر و خاوەنی جۆرە گشتێتییەكی یەكگرتوو یان ئۆرگانیكە، لە كاتێكدا شانۆی "حیماسە"[19]ی برێشت لەسەر بنەمای پارچە پارچە بوون و لێكدابڕاوی دەخولقێ. بەپێی پێوەرەكانی كلاسیك لەمەڕ یەكێتیی فۆرمی كە لە بیرۆكەكانی ئەرەستووەوە ئاو دەخۆنەوە، دەكرێ حەماسەی برێشتی لە گۆشەنیگای جوانیناسییەوە بە شانۆیەكی خراپی لە قەڵەم بدەین، بەڵام مەسەلەكە هەر ئەمەیە. برێشت نیشانی داین كە جوانیناسی و ئایدۆلۆژی بە شێوەیەكی لێكدانەبڕاو و پێكەوە پێوەندییان هەیە و بۆ گۆڕانی ئایدۆلۆژیی زاڵ

18- verfremdungs effect یان alienation effect.

19- epic.

و بالادەست، بنەماکانی جوانیناسیی زاڵ دەشێ تێکبڕمێنرێ و سەر لە نوێ چێ بکرێنەوە.

وێڕای تیۆری و شێوازی شانۆیی برێشت، لێکۆڵینەوەکانی ڕەخنەگری ئەڵمانی،والتر بنیامین‌یش خاوەنی گرینگایەتییەکی فراوانە. بنیامین لە وتارێکیدا بە ناوی "کاری هونەری لە سەردەمی بەرهەمهێنانەوەی میکانیکیدا"[٢٠] (١٩٣٣) وای لێکدایەوە کە شۆڕشی پیشەسازیی سەرەتاکانی سەدەی بیستەم لە بواری میدیا و بڵاو کردنەوەی فراوانی هەموو چەشنە دەقێك، بۆ ئەو کەسانەی کە تا ئەو کات نەیانهێشتبوو دەستیان بە شوێنەواری هونەری رابگات، بە شێوەیەکی هێزەکی هۆکارێکی سەربەستی هێن بوو: هەنووکە هەر کەس خۆی دەرەتانی ئەوەی هەبوو هونەرمەند بێت، چونکی ئامرازی دەربڕینی هزر و هەستیان خەریکبوو وەدەست دەکەوت. بە بڕوای بنیامین، هونەر زۆری پێوەندی بە پرسی مرخی تاکە کەسییەوە نییە، بەڵکوو دەگەڕێتەوە بۆ سەر گرفتی مادیی وەدەسهێنانی ئامرازی پێوەندی. سەرباری ئەمە، دوو میدیای نوێ، واتە فیلم و فۆتۆگرافی توانییان بۆچوونی نەریتگەرایانە بۆ هونەر وەك بابەتێکی دوورەدەست، بڕەوێننەوە: نەك هەر کامێرا کە هاسانتر وەدەست دەکەوێ، بەڵکوو سینەماش دەتوانێ نواندنەوەی نوێی واقیع و هەروەتر گۆڕان و حەرەکەتی خێرا کە بۆی هەیە ئەو جودایی و دابڕانەی کە برێشت لە داهێنانی شانۆییی خۆیدا خوازیاری بوو، خۆیا بکات. بنیامین لە وتارێکی دیکەیدا بە ناوی "نووسەر وەك بەرهەمهێنەر"[٢١] (١٩٣٤) کە ماوەیەك دواتر چاپ بوو، هونەرمەند وەك بەرهەمهێنەرێکی بێلایەنی واقیع

20- The works of Art in the Age of Mechanical Reproduction
21- The Author as producer



لە قەڵەم نادات، بەڵکوو هونەرمەند ڕاستەوخۆ تێکەڵ بە واقیع و وەك پاژێکی لێکدانەبڕاوی واقیع دێنێتە ئەژمار. ئالێرەدا بوو کە شێرازەی ئەو تێڕوانینە کلاسیکەی کە پێی وابوو هونەر ئاوێنەیەکە لە هەمبەر ژیان، لێك هەڵوەشایەوە.

گرووپێکی تری ڕەخنەگران و فەیلەسووفانی مارکسیست کە سەرجەم بە ناوی قوتابخانەی فرانکفۆرت ناسراون، بە توندی بەرپەرچی بۆچوونەکانی بنیامین سەبارەت بە بڵاو کردنەوەی فراوانی شوێنەواری هونەری، دەدەنەوە. ئەندامانی سەرەکیی ئەم گرووپە بریتی بوون لە تیۆدۆر ئادۆرنۆ و ماکس هۆرکهایمر و هێربێرت مارکوزێ کە "بنکەی تۆژینەوەی کۆمەڵایەتی"ی فرانکفۆرتیان دامەزراند. لێکۆڵەرانی ئەم بنکەیە ساڵی ١٩٣٣ لە ئەڵمان شاربەدەر کران، ڕوویان کردە ئەمریکا و لەوێ بنکەکەیان دامەزراندەوە و هەمیسان ساڵی ١٩٥٠ گەڕانەوە بۆ ئەڵمان. تێڕوانینی ئەم تاقمە لەگەڵ تێڕوانینی لۆکاچ و برێشت و بنیامین یەکناگرنەوە. ئەوان ریالیزمیان لە سۆنگەی ئەوەی پەرە بە شێوازە باوەکانی تێفکرین دەدات، ڕەت دەکردەوە و هەروەتر حاشایان لە شێوە عام پەسندەکانی کولتوور دەکرد کە پێیان وابوو شێوەیلێکی جاڕزکەرن. سەیر لەوەدایە کە ئەم ڕەخنەگرانە لە هەندێ شوێن لەگەڵ ئێف.ئار.لیویس (F.R.Leavis) یەکدەگرنەوە،لە کاتێکدا لە گۆشەنیگای سیاسییەوە دژ بە یەك ڕاوەستاون. ئەو ئەدەبیاتەی ئەوان پەسندیان دەکرد، ئەدەبیاتێکە کە لە واقیع جودا دەبێتەوە، هەروەتر پێیان وابوو زۆربەی بەرهەمە مۆدێرنیستییە ئەزموونگەراکان خاوەن ئەو تێبینی و تێڕوانینانەن کە ئاسەواری نەریتگەرا بە کەناریشیاندا تێناپەڕن. مانا و مەبەستی خوازراوی ئادۆرنۆ لە مەڕ هونەر، بەتایبەتی لەو سۆنگەیەوە نوخبەگەرایە کە ئەو دێت و لەسەر بەزاندنی سنووری

PDF 4 KURD

ئەو شتانەی کە بۆ خوێنەرانی رەشۆکی و عام جێی رەزامەندییە پێدادەگرێت، ئەو خوێنەرە رەشۆکییانەی کە دانی خێر بە هیچ بەرهەمێکی ئەزموونگەرایانەدا نانێن، چونکی بەرهەمی لەم چەشنە بۆچوونی باویان دەشلەژێنێ.

وەك چۆن لە سۆنگەی ئەم تێڕوانینە کەموزۆر سەرەتاییانەی مارکسیستییەوە دەزانین، هەڵەیە گەر بێت و پێمان وابێت تیۆری و رەخنەی مارکسیستی کۆمەڵێك بیر و بۆچوونی هاوشێوە و هاوچەشنن. لە شوێنەواری مارکسیستیی دوای دەیەی ١٩٦٠، بە دامەزران و سەقامگیر بوونی قوتابخانەیەکی تیۆریکی هەمە لایەن بە ناوی پێکهاتەخوازی (structuralism) و قوتابخانەکانی دوا بە دوای ئەو کە پتر بە ناوی پاش پێکهاتەخوازی (post-structuralism) و پێکهاتە هەڵوەشێنی (Deconstruction) ناسراون، ئەم بابەتە پتر وەڕاست دەگەڕێ. تیۆرییەکانی پێکهاتەخواز پتر بە چەشنێك لە زمان یان سیستمگەلی دەلالەتگەر دەڕوانن وەك بڵێی خاوەن گرینگایەتییەکی بنەڕەتی بۆ ژیانی مرۆڤن، لە کاتێکدا بە باوەڕی رەخنەگرانی نەریتگەرای مارکسیست، مێژوو و بارودۆخی مادی ژیان کە لە دەرەوەی زمانن، بەردی بناغەی ژیانی مرۆڤن. هەوڵێکی فراوان بۆ ئاوێتە کردنی ئەم تێڕوانینە بە رواڵەت دژوازانە، و دواجار بەرز کردنەوەی رۆڵی ئەدەبیات وەك ئەنجام، هاتۆتە ئاراوە. لوسین گۆڵدمەن[22]، تیۆریداڕێژی رۆمانیایی، لە کتێبی "خوای شاراوە"دا (١٩٦٤) وای لێکداوەتەوە کە ئەدەبیات پتر لە هەر بابەتێکی تر،توانایی دەربڕین و گوتنی ئەو شتەی هەیە

22- Lucien Goldman



کە ئەو پێی دەڵێ "دیدی جیهانی[23]" و مەبەستی "سەرلەبەری ئەو بیرۆکە و ئاوات و هەست و خوستانەیە کە ئەندامانی گرووپێکی کۆمەڵایەتی پێکەوە کۆ دەکاتەوە (گرووپێك کە زۆرتر وەك چینێکی کۆمەڵایەتی دێتە ئەژمار) و ئەوان لە بەرامبەر و دژ بە گرووپە کۆمەڵایەتییەکانی تر دادەنێ." بە پێچەوانەی زۆر یەك لە تێڕوانینەکانی پێکهاتەخوازان، گۆڵدمەن دەسنیشان کردنی جێگە و پێگەی دەقەیلی ئەدەبی لەو قۆناغ و سەردەمە مێژووییانەی کە تێیدا بەرهەم هاتوون بە پێویست دەزانێ، بەڵام بە پێچەوانەی زۆرینەی مارکسیستەکان پێوەندیی پێکهاتەیی و بنچینەیی نێوان سێ پانتایی تەواو جیاواز، واتە ئەدەبیات و مێژووی کۆمەڵایەتی و ئایین دەسنیشان دەکات. دوو تیۆری داڕێژ و رەخنەگری مارکسیستی فەرەنسەیی تریش، واتە لویی ئالتۆسێر ـ کە پێشتر لە بەشی ئایدۆلۆژیدا باسی بۆچوونەکانیمان کرد ـ و پییەر ماشێری[24] سەبارەت بە ئەرك و دەوری ئەدەبیات کۆمەڵێك باسوخواسیان هێناوەتە ئاراوە کە شوێن و دۆخێکی تایبەت بۆ ئەدەبیات قایل دەبن. ئالتۆسێر پێی وایە ئەدەبیات بە گشتی ئەرك و کارکردێکی تەمومژاوی و بەپێچوپەنای هەیە، بە واتای ئەوەی کە دەقی ئەدەبی وەك جۆرە ئایدۆلۆژییەك دەکەوێتە کار و هەر بۆیە خەڵك لە بارودۆخی راستەقینەی ژیانیان خافڵ دەکات. بەڵام ئالتۆسێر لەسەر ئەم باوەڕەشە کە ئەدەبیات دەتوانێ هەر لەو ئایدۆلۆژییەی کە تێیدا بەشدار و کاربەدەستە جیا ببێتەوە، لێرەوەیە کە دەقی ئەدەبی بۆی هەیە سەرنجی خوێنەری خۆی بۆ ئەو پێوەندییە خەیاڵکردەی کە وەسفی دەکات، رابکێشێ. ئەوەی راستی بێت، ئالتۆسێر دەخوازێ پێمان بڵێ کە ئەدەبیات هەیە بەها

23- world vision.
24- Pierr Macherey.

PDF 4 KURD

بالادەستەکان پڕ و پاراو دەکات، ئەدەبیاتیش هەیە گومان لەو بەهایانە دەکات، و ئەدەبیاتی واش هەیە هەر تك کار دەکات. ماشێری لە کتێبی "تیۆرییەك سەبارەت بە بەرهەمهێنانی ئەدەبی[25]"دا (١٩٦٦) لە روانگەیەکی تەواو جیاوازەوە دەگاتەوە بەردەمی هەمان دۆخی تەمومژاوی کە ئالتۆسێر پێی گەیشتبوو. ماشێری باسەکەی بەم چەشنە دێنێتە ئاراوە کە دەق لە دوو ئاستدا ئەرکی خۆی بەجێ دێنێ: یەکێکیان ئایدۆلۆژی دیارە کە ئێمە لەم ئایدۆلۆژییەدا لە پێوەندیە سروشتی و ئاشکراکانی رووداوگەل ئاگادارین، و ئەوی تریان ئایدۆلۆژیی نادیار یان ناخودئاگایە کە لەودا کەموکووڕییەکان دەر دەکەون و ئێمە بە ناتەواوی و نوقسانییەکانی یەکێتیی گریمانەیی دەق دەزانین. ئەم ساتەوەختە ناخودئاگایانە لەوانەیە بە شێوەی بێدەنگی یان غیاب (و ئامادە نەبوون) بن، واتە ئەو شتانەی کە ڕێگایان پێ نادرێت بێنە نێو پانتاییی گوتاری ئایدۆلۆژیکیی بالادەستەوە، یان بە شێوەی دژوازی و ناسازگاری لەگەڵ گوتاری بالادەست، خۆیا دەبن. با جارێکی تر، رۆمانی "پارکی مەنسفیلد" بە نموونە بێنینەوە، لەم دەقەدا دژوازییەك سەبارەت بە راستکاریی زاتیی "فەنی پرایس" و پێوەندیی سروشتیی ئەو لەگەڵ پیاوەماقوولانی گوند، کە لە ڕێگەی هەستی ئەوەوە سەبارەت بە ماڵی ناسراو بە "پارکی مەنسفیلد" وێنا دەکرێ، لە ئارادایە کە بە شاراوەیی دەمێنێتەوە، بەڵام بارهێنانی ئەو لە ماڵێکی شێواو و دەسکورتی بنەماڵەکەی لە پۆرسماوت شیکردنەوەیەك بۆ کەسایەتیی وی نییە.

ئەو دوو رەخنەگرەی کە لەوانەیە زیاترین بەشدارییان لە بەرهەمهێنانی تیۆریی مارکسیستی هاوچەرخدا هەبووبێت، لە بریتانیا ئیگلتۆن ( Terry Eaglton) و لە ئەمریکا فرێدریك جیمسۆنە (Fredric Jameson). ئەم

25- A Theory of Literary Production.



دوو رەخنەگرە کۆمەڵێك چەمکی جیا لە یەکیان لە تۆژینەوەی ئەدەبیدا هێنایە ئاراوە و ئەوەی راستی بێت رێکوپێکییەکیان بەم چەمکانە بەخشی. ئیگلتۆن لەسەر پێداویستیی تێڕوانینێکی تیۆریزەکراو بۆ ئەدەبیات پێدادەگرێ و لە راستیدا هێرشی کردۆتە سەر ریمۆند ویلیامز کە زۆر پابەندی تیۆریی مارکسیستییە، چونکی ئیگلتۆن پێی وایە کە ویلیامز بنەمای کاری خۆی زۆرتر لە سەر ئەسڵی ئەزموون دامەزراندووە. تێڕوانینی ئیگلتۆن خۆیشی لەگەڵ هەڵوێستی ئالتۆسێر و ئەو مارکسیستانەی تر کە ئەرکێکی تایبەت دەخەنە ئەستۆی ئەدەبیات تەواو جیاوازی هەیە، گەرچی وێدەچێ کە لە تێڕوانینی ئەودا بۆ نووسەرانێکی لە چەشنی بلێیك یان برێشت ئەو جیاوازییە زۆر بەرچاو نەبێت. ئیگلتۆن پتر لەو مارکسیستانەی تر کە خۆیان بە باسی ئایدۆلۆژییەوە سەرقاڵ کردووە، لە ئایدۆلۆژی وەك بابەتێکی پڕپێچوپەنا دەڕوانێ و پێی وایە کە ئەدەبیات بەرهەم هێنانەوە و سەر لە نوێ نووسینەوەی پڕپێچوپەنای ئایدۆلۆژییە. بۆ وێنە، ئیگلتۆن لە وتارێکیدا سەبارەت بە رۆمانی "مەئمووری نهێنی[26]" (١٩٠٧) بەرهەمی کۆنراد، دەقێك کە وەك رەخنەیەکی رادیکاڵ لەسەر سەرمایەداری لێی دەڕوانرێ، باسی ئەوە دەکات کە ئەم رۆمانە،لە ڕێگەی ستراتژییە پڕپێچوپەناکانییەوە، دواجار دەبێتە هۆی بەهێز بوون و گەشە سەندنی بارودۆخی بەردەست. ئیگلتۆن هەروەتر ئاشکراتر لە جاران، گوتاری رەخنەی ئەدەبی بە تۆژینەوەی ئەدەبیاتەوە دەلکێنێت و وای لێکدەداتەوە کە لە ڕێگەی گۆڕانی شێوازەکانی بەرهەمهێنانی ئەدەبیات بە واتای پێکهاتەیەك لە کولتوور و مەعریفە، دەکرێ تێڕوانینێکی دیکە بۆ ئەدەبیات دەستەبەر بکرێ.

26- The secret Agent.

ئیگلتۆن لەگەڵ قوتابخانەی رەخنەیی "پێکهاتە هەڵوەشێنی"[٢٧] کە لە فەرانسەوە سەرچاوەی گرتووە و لە ساتەوەختی ئێستادا تەواو ئەمریکاییە، دژایەتی دەکا و وای لێکدەداتەوە کە ئەم قوتابخانەیە حاشا لەهەر چەشنە مانایەکی نەگۆڕ لەمەڕ واقیع یان مەعریفە دەکات. قبووڵ کردنی ئەم بابەتە بۆ رەخنەگرێکی مارکسیست، ئەگەر نامومکینیش نەبێت، گەلێ ئەستەمە. فرێدریك جیمسۆن مارکسیزم بە تاکە دژەژار لە بەرامبەر پێشکەوتی ئەو سەرمایەدارییە دەزانێ کە پاوانی رۆژاوایە. جیمسۆن لە کتێبی "مارکسیزم و فۆرم[٢٨]" (١٩٧١)، و لە شیکردنەوەی بنەمای بیرۆکە و هزری رەخنەگرانەی مارکسیستی سەدەی بیستەمدا، شان بە شانی ئیگلتۆن لەسەر ئەرك و رۆڵی رەخنەی ئەدەبی پێدادەگرێ، و ئەو شتەی کە وەك "رەخنەی دیالێکتیکی" ناوێ دێنێ بە بابەتێکی پێویست لە قەڵەم دەدات و بانگەشەی بۆ دەکات. جیمسۆن بیر و باوەڕی خۆی بەم چەشنە دەردەبڕێ و دەڵێ: «هەڵسەنگاندنی ئێمە سەبارەت بە هەر بەرهەمێکی تاکی ئەدەبی، دواجار هەڵسەنگاندنێکی کۆمەڵایەتی و مێژووییە.» ئەو ئەدەبیات بە پاژێك لە پرۆسەیەکی بەردەوام لە حاڵی گۆڕاندا دەزانێت کە لە پلەی یەکەمدا پابەندی دۆخی رەخنەگر یان خوێنەرە. زەمینەی مێژوویی خوێندنەوە، لە بری زەمینەی نووسینی بەرهەم، کە لە پلەی دووهەمی گرینگی دایە و رەخنەگر دەیبووژێنێتەوە و سەرلەنوێ چێی دەکاتەوە، دەبێتە بواری داهێنانی مانا. جیمسۆن لە بەرهەمێکی نوێتردا بە ناوی "ناخودئاگای سیاسی[٢٩]" (١٩٨١) تیۆروانینێك دێنێتە ئاراوە کە

٢٧- ئەم بابەتە لە بەشی داهاتووی ئەم کتێبەدا بەسەر دەکەینەوە.

28- Marxism and form.

29- The Political Unconscious.



شێوەی روانگەی ماشێری دەدات و بە پێی ئەو تێڕوانینە ئەدەبیات وەك چەشنە گوتارێکی ئایدۆلۆژیکی دەکەوێتە کار کە هەقیقەتی مێژوویی سەرکوت دەکات، بەڵام بە گوێرەی شیکردنەوەی فرۆیدی، دەکرێ لە رێگەی ئەو بۆشایی و زمان گیران و بێدەنگییانەی کە هێمای سەرکوت بوونن پەی پێ ببەین. جیمسۆن ئەمە روون دەکاتەوە کە گشت شێوەکانی رەخنەی ئەدەبی یا ستراتیژییە راڤەییەکان سریشتێکی ئایدۆلۆژیکیان هەیە، واتە ئەوەی کە گشت گوتارەکان خۆیان وەك شێوەکانی "هەقیقەت" نیشان دەدەن یان چێ دەکەن، و نووسەران، و لە نێو ئەوانیشدا رەخنەگران، ناتوانن لە هاودەستی بۆ ئەم پرۆسەیە خۆیان دوور بخەنەوە. وەڵامی جیمسۆن ئەمەیە کە ئێمە دەشێ تا ئەو شوێنەی دەگونجێ ئاگاداری ئایدۆلۆژیی ئایدۆلۆژی بین. ئەم خودئاگاییە بە سەر ئەو گوتارانەدا کە سەرنجێکی ئەوتۆ نادەنە میکانیزمی بەرهەمهێنانی هەقیقەت سەرەتی هەیە.

ئەوەی تا ئێستا لێی دواین، تەنیا پوختەیەك بوو لە باسی رەخنەی مارکسیستی، بەڵام دیارە ئەم تێڕوانینە بوارێکی گرینگی لێکۆڵینەوەی تیۆریکە کە لەگەڵ بوارەیلی تیۆریك و رخنەگرانەتردا جیاوازی بەرچاوی هەیە. لەوانەیە باشتر وا بێت کە تیۆریی مارکسیستی هێندە لە سەر دەستی ئەم رەخنەگر یا ئەو رەخنەگری مارکسیست، بەو جۆرەی لە لاپەڕەکانی پێشوودا کردمان، شی نەکەینەوە، بەڵکوو پتر وەك مەعریفە یان گوتارێکی بەردەست لێی بکۆڵینەوە بە گشت ململانێ و دژوازی و نموونە گێڕانەوەییەکانی خۆیەوە، بەڵام لە بیرمان بێت کە ئەم تێڕوانینە (واتە رەخنەی مارکسیستی) لەسەر بنەمای کۆمەڵێك رێسای تایبەتی سەبارەت بە سریشت و جەوهەری کۆمەڵگا و مێژوو دامەزراوە.

### ٢- جنسییەت[٣٠] (نێرمایی):

ئەم بەشە لە کتێبەکەمان پتر سەبارەت بە پێشکەوتەکانی رەخنە و تیۆریی رەخنەگرانەی فێمینیستی و ئەو تێڕوانینانەیە کە سەرنج دەدەنە پرسی نێرمایی و جێگە و پێگەی ژن لە ئەدەبیاتدا. هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ سەر ئەوەی کە لە کۆمەڵگا و کولتووری رۆژاواییدا، پیاو پێودانگ و ناوەندی سەرەکی لە قەڵەم دەدرێ و ژن وەك لادانێك لەم رێسایە دێتە ئەژمار، هەر بەو چەشنەی سیمۆن دوبوار[٣١] (Simon de Beauvoir) لە کتێبی "جنسی دووهەم"دا باسی دەکات:

***کە واتە مرۆڤایەتی لە جنسی نێرە، و پیاو نەك بە پێی ئەو شتەی خودی ژنە، ژن دەناسێنێ، بەڵکوو ژن بە گوێرەی ویستی گونجاوی خۆی پێناسە دەکات، ژن بوونەوەرێکی سەربەخۆ نایەتە ئەژمار... ژن بە لەبەرچاو گرتنی پیاو پێناسە دەکرێ و جیا دەبێتەوە، کەچی بۆ ناساندنی پیاو ژن لەبەر چاو ناگیرێ، ژن بێبەرییە لە زات و پیاو خاوەنی زاتە. پیاو "سوژە"یە، پیاو بوونی "رەها"یە، و ژن "ئەویتر"ە.***

ئەم بابەتە لە هیچ شوێنێك پتر لە زمان، جا چ ئەدەبی بێ و چ غەیری ئەدەبی، خۆی دەرناخات. لە زۆربەی هەرە زۆری گوتارەکاندا، پلە و پایەکانی هێز و دەسەڵات بە راشکاوی پیاوانە دێنە ئەژمار، وەك وشەی (chairman)

30- Gender.

٣١- سیمۆن دوبوار (١٩٨٦-١٩٠٨) ژنەرۆماننووس و وتارنووسی فەرەنسەیی کە وەك تیۆریستێکی ناسراوی فێمینیست لە قەڵەم دەدرێ. کتێبی "جنسی دووهەم" لێکۆڵینەوەیەکی ئیگزیستانسیالیستیی دۆخی ژنانی جیهانە.



(بە واتای سەرۆك)، یان ئەو کاتەی کە بە گشتی باسی خەڵك دەکەین، وەك "خوێنەر" لە رەخنەی ئەدەبیدا. ئەم ناوانە ناڕاستەوخۆ ئاماژەیەکن بۆ پیاو.

جیاوازییە جنسییەکانیش، هەر وەك سیستمی چینایەتی، لە نوختە نیگای کۆمەڵایەتییەوە بە شێوەیەك دەقیان گرتووە کە گەلێ جار سروشتی دەنوێنن. دەشێ لە نێوان "جنس" (sex) و "جنسییەت" (gender)دا جیاوازی دابنرێ. "جنس" زاراوەیەکە بۆ دەسنیشان کردنی جیاوازیگەلی ژینناسانە (بایۆلۆژیکال)ـی نێوان ژن و پیاو بە کار دێت، بەڵام "جنسییەت" دەلالەت دەکات بۆ ئەو جیاوازییە کۆمەڵایەتییانەی کە لە زۆربەی کۆمەڵگاکاندا هەستی پێدەکرێ و دەبنە هۆی هاتنە ئارای هەمەجۆر نابەرامبەری و زوڵم و زۆر و چەوسانەوەی نێوان جنسەکان. ژنێتی (feminity) و پیاوەتی (masculinity) دوو چەمکی بەرهەمهاتووی کۆمەڵایەتین و خاوەنی ئەو تایبەتمەندی و بەها و وێنا و گێڕانەوەن کە بەردەوام لە کۆمەڵگادا وەگەڕ دەکەون و لەسەر تێڕوانین و ژیانی خەڵکان شوێن دادەنێن و تەنانەت دەسنیشانیان دەکەن. رێکلامی بازرگانی نموونەی بەرچاوی ئەم پرۆسانەیە، و جان بێرگر (John Berger) لە کتێبی "شێوەکانی دیتن"[٣٢] (١٩٧٢)دا ئەو شێوازانە شی دەکاتەوە کە رێکلامی بازرگانی و هەروەتر شێوەکاری بە رەنگی رۆن، لە دۆخ و پێگەی جنسی پیاو و ملکەچیی ژن کەڵك وەردەگرن. گومان هەڵناگرێ، ئەدەبیات شان بە شانی گوتاری رەخنەی ئەدەبی و لە راستیدا گوتارەیلی تیۆریی ئەدەبی و تیۆریی رەخنەگرانە وەك یەکێك لە شێوازە سەرەکییەکانی پەیوەندی، دەورێکی هەرە گرینگ لەم بارەیەوە دەگێڕێ. ئەم

32- Ways of seeing.

گوتارانە بۆیان هەیە هەم وەك هۆكاری بەهێز كردن، هەمیش وەك هۆكاری تێكدان و تێكرووخانی شێوەگەلی بەرهەمهێنانی جنسییەت وەكار بكەون.

وەك بەشی پێشووی كتێبەكەمان، ئەم بەشەش تەنیا پێشەكی و پێناسەیەكی پوختە لەسەر پێشینە و هەندێ لەو بابەت و تیۆرییە گرینگانەی كە پێوەندییان بە نقیسانی ژن و رەخنەی فێمینیستییەوە هەیە، بەڵام سەرچاوە پێشنیار كراوەكان بۆ خوێندنەوەی پتر، كۆمەڵێك نووسراوەی جۆراوجۆری رەخنەگرانە و تیۆریك لە شوێنەواری سەرەتاییەوە تا هەندێ بەرهەمی پوختتر و كامڵتر دەناسێنێ كە لەوانەیە خوێنەری هۆگر بەم باسانە پێی خۆش بێت بگەڕێتەوە سەریان. بۆ خوێندنەوە و ناسیاریی وردتری ئەم باسە، كتێبی "تۆژینەوەی نقیسانی ژنان"[٣٣] (١٩٨٨) بەرهەمی روت شێری ( Ruth Sherry) گەلێ بەكەڵك دەبێت.

## ژن و ئەدەبیات

لە سەدەی بیستەمدا، پتر ژنە نووسەرانی وەكوو ویرجینیا ئۆلف[٣٤] و دواتر كۆمەڵێك ژنە رەخنەگری ئەدەبی، ئاوڕیان لە هەندێ بابەتی پێوەندیدار بە نواندنەوەی ژن (representation of women) لە ئەدەبیاتدا دایەوە. دیارە مەبەستمان ئەوە نییە بڵێین بەر لەم نووسەر و رەخنەگرانە لە ئەدەبیاتدا هیچ هەوڵێك بۆ گومان كردن لە پێگەی ژن نەدرابوو. "مێری ئۆلتسۆن كرافت"

33- Studying women's Writing.

٣٤- Virginia Woolf (1882-1941)، رەخنەگر و رۆماننووسی بریتانی كە تەكنیكی شەپۆلی زەین و شێوازی شاعیرانەی رۆمانەكانی لە رۆمانی مۆدێرندا خاوەن گرینگایەتییەكی بەرچاوە.



(Mary Wollstonecraft) لە كتێبی "پاراستنی مافی ژن" (١٧٦٢)دا لەسەر پێداویستی بەرز كرنەوەی ئاستی خوێنەواریی ژنان پێی داگرت و ژنە رۆماننووسانی سەدەی نۆزدەهەم،لە چەشنی جۆرج ئیلیۆت لە بریتانیا و ژۆرژ ساند (Georges Sand) لە فەرەنسە، بە توندی رەخنەیان گرت لەو تێڕوانینە نەگۆڕە كۆمەڵایەتییانەی كە سەبارەت بە ژنان لەئارادا بوون، گەرچی وەك هەندێ لە میراتگرانی سەدەی بیستەم بە شێوەیەكی بنەڕەتی رەخنەیان نەگرت. هەنووكە پرسی سەرەكی كە پتر لە جاران گرینگ دەنوێنێ ئەمەیە كە ئەزموون و دەنگی ژن تا چ رادە و رێژەیەك لە ئەدەبیاتدا، رەنگی داوەتەوە و نوێندراوە؟ لەم بارەیەوە، چەند بابەتێكی تریش لە چوارچێوەی باسەكەدان. ئایا نووسەرێكی پیاو بە ئەندازەی پێویست دەتوانێ كەسایەتی ژن و ئەزموونی ژنانەمان نیشان بدات؟ لەلایەكی ترەوە، ئەگەر زمان بە گشتی و سیستمی ئەدەبیات (بەتایبەتی) پیاوسالار و نێرینە تەوەرن، لەم كەشوهەوایەدا ئایا نووسەرێكی ژن بۆی هەیە رێسای ئەم پاوانانە پێشێل بكات و بەم جۆرە خودئاگاییەكی سەروەر ژنانە بەرهەم بێنێت؟ هەندێ رەخنەگری فێمینیست سەبارەت بە خاڵی دووهەمی ئاماژە پێكراو گەلێ مشتومڕیان كردووە و پێیان وایە كە دیاری كردنی شێوە و فۆرمێكی تایبەت بۆ "ئەزموونی ژنانە"، بۆ وێنە بەو چەشنەی كە ئێلاین شوالتێر (Elaine Showalter) لە كتێبی "ئەدەبیاتێك ئی خۆیان"[٣٥]دا ئەم كارەی كردووە، بەڵام پەرە بەم باوەڕە (ناڕاستە) دەدات كە ژن سەر لەبەریان چەند شكڵ و شێوەیەكی وێكچوویان بۆ ئەزموون هەیە.

گەر لە گۆشەنیگای مێژووییەوە بڕوانین، دەبینین ئەدەبیاتیش وەكوو چینی كۆمەڵایەتی، و رەگەز و نیژاد، بە دڵنیاییەوە، بایخی ئەوتۆی بۆ پێگەی ژن بە

35- A Literature of Their Own.

ڕەوا نەزانیوە یان دۆخی ژنی خستۆتە پەراوێزەوە. ئەم دیاردەیە بە چەندین شێوە رووی داوە. لە دەقەیلی ئەدەبیدا، ژنان کەموزۆر لە چاو پیاوان دەوری کەم بایەختر دەگێڕن. دیارە لە شوێنەواری نووسەرانی ژن و پیاودا هەندێ ئاوارتەش (exceptions) بەدی دەکرێ، بەڵام ڕەخنەگرانی ئەدەبی لە سەردەمی ویرجینیا ئۆلفەوە ئەم باسەیان هێناوەتە ئاراوە کە ئەزموونی زاڵ یان نۆرمی بنچینەیی ئەدەبیات بریتی بووە لە ئەزموونێکی پیاوانە. ئەم ڕاستییە نەك هەر لەم سۆنگەیەوە کە زۆربەی کەسایەتییەکانی ئاسەواری ئەدەبی پیاون، بەڵکوو بەو هۆیەشەوەیە کە جۆری ئەو بابەتانەی کە لەم بەرهەمانەدا شایانی لێکۆڵینەوەن، پەیوەندییان بە جیهانی پیاوانەوە هەیە، تەنانەت تا ئەم دواییانەش، ژمارەیەکی زۆر کەمی ئاسەواری ئەدەبی باسی گیروگرفتی زگ کردنی ژنان و بارهێنانی منداڵیان دەکرد، لە کاتێکدا ئەم مەسەلانە بەشێکی گرینگی ئەزموونی خەڵکانێکی فراوانی ئەو وڵاتانە پێکدێنێت کە خاوەنی کولتوورێکی ئەدەبین. کەواتە، لە بنکەی کولتووریی ئەدەبیاتدا کە لە بەرنامەی فێرکاریی زانکۆییدا لێی دەکۆڵدرێتەوە، و هەروەتر لەو کۆمەڵە بەرهەمەدا کە وەك "بەرهەمی ڕەسەن" لەقەڵەم دەدرێن، نووسەرانی پیاو و تێڕوانینی پیاوانە زاڵ و باڵادەستە. ڕەخنەگرانی فێمینیست وای لێکدەدەنەوە کە بەرهەمی ڕەسەن نیشاندەری دەسەڵاتی گرووپی خاوەن هێزی کۆمەڵگایە، کە یان پیاون، یان سەر بە چینی نێونجی و باڵان، یان سپی پێستن. دەقی نووسراوی ئەو ژنانەی کە دەکەونە نێو ئەو بەناو بەرهەمە ڕەسەنانەوە، وەك ئاسەواری "پیاوانی شایانی شانازی" لە قەڵەم دەدرێن کە بە گوێرەی تێڕوانینی پیاوانە بۆ واقیع هەڵسوکەوت دەکەن، یان لە بەدەستەوەدانی کەسایەتی و ئەزموونە کلێشەییەکانی ژنانەدا، دیدگا و گۆشەنیگای پیاوانە دەربارەی ژنان دێننە



ئاراوە. لەم دواییانەدا هەندێ هەوڵ دراوە ئەم ناهاوسەنگییە لەناو بچێ، ئەویش لە ڕێگای کۆمەڵێك دامودەزگای دامەزراوی ئەدەبیاتەوە، بە جۆرێك کە هەندێ لە دەزگاکانی چاپەمەنی و بڵاوکردنەوە تەنیا ئەو کتێبانە دێننە وەشاندن کە ژن نووسیبێتیان. هەروەتر لقی ئەدەبیات لە زانکۆکاندا پتر لە جاران وانەی سەبارەت بە شوێنەواری ژنان یان ڕەخنەی فێمینیستی، لە بەرنامەکانی خۆیدا گونجاندووە. دێل سپێندر (Dale Spender) لە کتێبی "دایکانی ڕۆمان[36]"دا (١٩٨٦) نیشانی داوین کە لە بەرابەر ئەو تێڕوانینە تەواو پیاوسالارانەیەدا کە پێی وایە ڕۆماننووسی کارێکی پتر پیاوانەیە، و نموونەی ئەم تێڕوانینەش کتێبی "سەرهەڵدانی ڕۆمان" (١٩٥٧)ی "ئیان وات"ـە، دەکرێ ئاماژە بە نەریتێکی تر بکەین کە بریتییە لە نووسین و بەرهەمهێنانی ڕۆمان لە سەر دەستی ژنان.

ڕەخنەی ئەدەبی مەیدانێکی تر بووە کە تیۆریی فێمینیستی تێیدا مشتومڕی کردووە، لەو سەرەوە کە زۆربەی شێوەکانی ڕەخنە ئەو بەهایانە بە ڕاست دادەنێن و ئەو پێوەرانە پەسند دەکەن کە جارێکی تر دید و ئەزموونی پیاوانە دەکەن بە ناوەند و دیدگای ژنانەش بەرەو پەراوێز ڕادەماڵن. تەنانەت گەر بێت و ژنە خوێندکارێك، ڕۆمانی ژنە ڕۆماننووسێك سەبارەت بە کۆمەڵێك کەسایەتیی ژن بخوێنێتەوە، تێڕوانینی ڕەخنەگرانەی ئەو بۆ ئەو دەقە تێڕوانینێکی پیاوانەیە. ئانێت کۆلۆدنی (Annete Kolodny) ڕەخنەگری فێمینیستی ئەمریکایی بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە سیستمی پەروەردە و پرۆسەی ڕەخنەی ئەدەبی وا فێری خوێنەر دەکات و لە شوێنێکی وای دادەنێ کە بە شێوەگەلێکی تایبەت و ڕێگا پێدراو لە دەق بکۆڵێتەوە و "تێی بگات". کۆلۆدی لە سەری دەڕوا و دەڵێ،

36- Mothers of the Novel.

خوێندنەوە شێوەیەکە بۆ خەریك بوون بە "نموونەکانەوە" (paradigms)، نەك "دەقەکان"، واتە "ئێمە بە پێی ئەو شتەی پێویستیمان پێیەتی (یان دەیخوازین)، یان بە وتەیەکی تر، بە پێی ئەو پێش گریمانە یان داگەڕانە رەخنەگرانەیەی (خودئاگا یان ناخودئاگا) کە بەسەر دەقیدا دەسەپێنین، مانایەکی لێ هەڵدەکرێنین". خوێندنەوە چالاکییەکی بە کۆمەڵایەتی کراو (socialized) یان وەرگێراوە، و هەڵسوکەوت و خوو و خدەی ئێمە لە خوێندنەوەدا لەسەر بنەمای پێش گریمانە و داب و دەستووره باوەکان و هەر بۆیە شێوەی پیاوانە بیچم دەگرێ. کۆلۆدی باسی ئەزموونی خۆی لەمەڕ خوێندنەوە و چێژ وەرگرتن لە شێعری "بەهەشتی ونبوو"ی (١٦٦٧) میلتۆن دەکات، و دەڵێ ئەم شێعرە دژ بە باوەڕەکانی خۆی، وەك ژنە جوویەکی فێمینیست، دەبینێ، چونکی ناتوانێ "باوەڕ و شێوەی بەها دانانی جنسیی ئەو بەرهەمە قبووڵ بکات". کۆلۆدی قسەی خۆی بەم شێوەیە روون دەکاتەوە و دەڵێ، ئەو وا فێر بووە کە لە رێگای بەکارهێنانی هەندێ ستراتیژیی رەخنەگرانەوە، وەك "مۆدێلی راڤەیی"، لەم شێعرە بگات، بەڵام لە روانگەی هەندێ دابی جنسییەتی و دینی کە ئەو باوەڕی پێیان نییە. لە سۆنگەی "فێربوونی رەوشتی راست و دروستی خوێندنەوە"وە، هەر چەشنە راڤەی دژ بە راڤەی باو یان نەگونجاو لەگەڵ راڤەی باو رێك وەك شوناسی تاکە کەسیی ئەو سڕدرابۆوە.

## تیۆری و رەخنەی فێمینیستی

"ژوورێکی خۆت"[37] (١٩٢٨) بەرهەمی ویرجینیا ئۆلف، گەرچی بە مانای باوی خۆی بەرهەمێکی تیۆریك نییە، بەڵام خاڵی دەسپێکی تۆژینەوەی ئەدەبیاتی ژنان و سەرەتای رەخنەی فێمینیستییە. لەم چوارچێوەیەدا، ئەو

37- A Room of one's Own.



شتەی شایانی ئاماژە پێکردنە ئەوەیە کە هەندێ رەخنەگری فێمینیست، لە گوتاری تیۆریی ئەدەبی وەك پەرەپێدانی پتری گوتاری پیاوانە و هەر بویە دەسەڵات پەیدا کردنی ئەو گوتارە پیاوانەیە بەسەر مەیدانی تۆژینەوەی ئەدەبی نارِوانن و حاشایان لێ کردووە. گومانی تێدا نییە توانایی و لەوانەیە تایبەتمەندیگەلی زمانیی زۆربەی شوێنەواری تیۆریك، راستی و دروستی ئەم تێڕوانینە بسەلمێنن. لەم سۆنگەیەوە، ناشێ تیۆریی فێمینیستی وەك یەکە گوتار چاوی لێبکەین: زۆربەی نووسراوە فێمینیستییەکان بە پێی سریشتی خۆیان، لە هێنانە ئارای تێڕوانینێکی تاك و ناوەندگەرا خۆ دەبوێرن و خاوەن دیدێکی چەند لایەنە و دژە ناوەندن. وا باشترە لە دۆخێکی لەم چەشنەدا باسی چەندان جۆری تیۆرییەکانی فێمینیزم بکرێت.

ویرجینیا ئۆلف هەروەتر سەر بەو بزاڤە گەورەترەی ژنە نووسەرانێکی لە چەشنی کاترین مەنسفیلد (Katherine Mansfield) و رێبێکا وێست (Rebecca West) و دۆرۆتی ریچاردسۆن (Dorothy Richardson) بوو کە لە سەرەتای سەدەی بیستەم تێڕوانینێکی ژنانەیان رەچاو کردبوو. وەك چۆن بۆ مارکسیزم ئەم قسەیە راستە، شوێنەواری فێمینیزمیش ناشێ بە پێی ئەم یان ئەو تیۆریستە تایبەتە باسی لێ بکرێ، بەڵکوو وا باشترە ئاسەواری ویرجینیا ئۆلف وەك پاژێك بزانین لە بزاڤێکی بەربڵاوتر یان بە گوتارێکی نوێی لە قەڵەم بدەین کە گومانی لە راستی و دروستی گوتارە باڵادەستەکانی لەمەڕ جنسییەت (نێرمایی) کرد. شوێنەوار و بەرهەمەکانی ئۆلف هەروەها هەولێکن بۆ دۆزینەوە و تاوتوێ کردنی ئەو خاڵانەی کۆمەڵێك ژنە نووسەر باسی کردبوون، بەڵام تا سەردەمی ئۆلف کپ و بێدەنگ راگیرابوون و وەپشت گوێ خرابوون. ئەو هۆکارە سەرەکییەی کە ویرجینیا ئۆلف سەبارەت بە کەمی ژمارەی ژنە

نووسەران ئاماژەی پێدەكات، دۆخی مادیی ژیانی ژنانە. ژنان لەباری ماڵییەوە سەربەخۆ نین و كەموزۆر چاوەڕوانییان لێ دەكرێ كە (تەنیا) پێداویستی و نیازەكانی پیاو دابین بكەن. پرسەكە ئەمە نییە كە ژنان توانایی نووسینیان نەبوو. ئۆلف بۆ سەلماندنی ئەم بابەتە، ئەفرا بێن (Aphra Behn) وەك نموونە دێنێتەوە كە پاش مردنی هاوسەرەكەی ناچار دەبێت بۆ باری ژیان و گوزەرانی خۆی روو بێنێتە كاری نووسین، و پاشان باسی ژمارەی روو لە زیاد بووی ژنە نووسەرانی سەدەیلی هەژدە و نۆزدە دەكات. بەڵام زۆربەی ئەم ژنانە وەك پیشە بە كاری نووسینەوە سەرقاڵ نەبوون، بەڵكە نووسین زۆرتر وەك جۆرە خۆخافڵاندن و سەرگەرمییەك بووە بۆ ئەوان. (جیا لەمە) بنكە ئەدەبییەكانیش وەكوو ژیانی بنەماڵەیی، پتر لە ژێر دەسەڵاتی پیاواندا بوون. ویرجینیا ئۆلف ئاماژە بە خوشكی گریمانەیی شێكسپیر دەكات و دەڵێ، ئەگەر شێكسپیر بەڕاستی خوشكێكی وا خاوەن مرخ و بەتوانای وەك خۆی هەبوایە، لەو سەروبەندەدا ئەم مرخ و تواناییە هیچ كات دەرەتانی بەرگرتن و خۆیا بوونی نەدەبوو، چونكی خوشكی شێكسپیر ناچار دەبوو كاروباری نێو ماڵ و ئەركی دایكایەتی، كە بەسەر ژناندا دەسەپێندرێن، وەئەستۆ بگرێت. ئۆلف لە گەڵ قسەی ئەو قەشەیە یەكدەگرێتەوە كە گریمان دەڵێ، مەحاڵە ژنێك هەبێت خاوەن مرخ و توانایی شێكسپیر، بەڵام نەك لەبەر ئەوەی ژن خاوەن ئەم مرخ و تواناییە نەبێت، بەڵكوو لەو رووەوە كە ژن ناتوانێ لە كۆمەڵگایەكی پیاوسالاری لەو چەشنەدا خۆ بنوێنێ و قسەی خۆی بكات.

یەكێك لە گرینگترین پشكدارییەكانی ویرجینیا ئۆلف لە رەخنەی فێمینیستیدا، باسوخواسە لەسەر زمان كە لە باری زەمانەوە دەكەوێتە پێش لێكۆڵینەوە تازەترەكان. تێڕوانینی ئەو بۆ زمان لەسەر بنەمای تیۆری



دانەمەزراوە، بەو شێوەیە كە هاتووە باسی رستەی "پیاوانە" و "ژنانە" دەكات، بەڵام لە تایبەتمەندییەكانی ئەم دوو جۆر رستەیەی بە وردی نەكۆڵیوەتەوە، وەلێ ئەركی ئایدۆلۆژیكیی زمان بۆ بیچم پێدان بە نێرمانیی (جنسییەت)، دیاری دەكات. دوای ئۆلف كۆمەڵێك رەخنەگری فێمینیست پەرەیان بەم باسە دا و تیۆرییان بۆ دارشت. بۆ وێنە، دیل سپێندر لە كتێبی "زمان دەسكردی پیاوە[38]"دا (١٩٨٠) بەم چەشنە دەدوێت:

***دەكری ئەو رێسا ماناییەی كە هۆكاری سەرهەڵدانی جیاوازیی جنسی لە نێو زماندایە، بە هاسانی لە دوو توێی ئەم چەند رستەیەدا بیڵێین: دوو لایەنی بنچینەیی لە ئارادان، پیاوانە و ناپیاوانە. هەر شتێكی پێوەندی بە پیاوەوە هەیە، مانای ئیجابی و شایانی پەسند كردنی هەیە، و ئەو شتەی ناپیاوانە لە قەڵەم دەدرێ، بێبەرییە لەو خەسڵەتانە... پێكهاتەی ماناییی زمانی ئینگلیزی تا رادەیەكی زۆر پیشانمان دەدا كە لە نیزامێكی پیاوسالاردا ژن بوون هەڵگری چ واتایەكە...***

وەك باسمان كرد، زمان بەدیهێنەری مەعریفەیە وەكوو زمان، و سەرەتی و زاڵێتیی پێگەی پیاو و سیستمی پیاوسالاری دەشێ لە روانگەیەكی گشتیی پێوەندیدار بە مێژوو و گوتار و هەروەتر زمانی رۆژانە یان ئەدەبییەوە لێی بروانرێ. دیل سپێندر لە كتێبی "ژنانی نادیار"دا (١٩٨٢) وای لێكدەداتەوەكە مەعریفە جیا لە مرۆڤەكان نایەتە ئاراوە و "چاوەڕێیی پیاوانی هەڵكەوتە ناكات تا بیدۆزنەوە و كۆمەڵێك راپۆرتی بێلایەنانە و بێبەری لە بۆچوون و بیر و باوەڕی تاكە كەسیی خۆیان ئامادە بكەن"، "بەڵكوو لەسەر بنەمای بەها و باوەڕە سەرەتاییەكانی ئەوان" بیچم دەگرن. كەواتە، فەلسەفە و زانست و ئەوەی

38- Man made language.

راستی بێت هەموو چەشنەکانی مەعریفە کە لە گۆشەنیگایەکی پتر پیاوانەوە، لەم زمانەدا بەرهەم دێن کە خۆی تێڕوانینێکی لەم چەشنە بەهێز دەکات، پیاوـتەوەرن و دژ بە ژنان فەرق و جودایەتی قایل دەبن. سپێندر لە سەر لێکدانەوەی خۆی بەردەوام دەبێت و دەڵێ، لە چوارچێوەی دەسەڵاتدا، ململانێ کردن لەگەڵ بنچینە و بنەمای ئەو گرووپە کۆمەڵایەتییانەی کە وەك گرووپگەلێکی نەزۆك و سووکوچرووکتر پێناسە دەکرێن، بە قازانجی گرووپی دەسەڵاتدار نییە.

ڕەخنەی ئەدەبی وەك چەشنێك گوتار و مەعریفە، بە شێوەیلی جۆراوجۆر یارمەتی سیستمی پیاوسالاری داوە و بە هێزی کردووە. وەك باسمان کرد، داهێنانی "شوێنەواری ڕەسەن"ی پیاوسالارانە یەکێکە لە دەرکەوتەکانی ئەم پشتیوانییە، بەڵام تێڕوانینە فێمینیستییەکان لەسەر کۆمەڵێك لایەنی تری ئەم پشتیوانییە مشتومڕیان کردووە یان لێیان لە هەرا داون. ئەم باوەڕە هەڵەیە کە پێی وایە ئەدەبیات نواندنەوەی ڕێك و وردی واقیعە، باوەڕێك کە ڕەگوریشەی دەچێتەوە سەر "بیرۆکەی لاسایی کردنەوە"[39]، یەکێکە لە باسوخواسەکانی تیۆریی فێمینیستی. ئەم باوەڕە لە ڕەخنەی هیومانیستیدا حوکمی بەردی بناغەی هەیە و لە نێوان تێڕوانینە تیۆریکەکان بە تیۆریی پێشەنگ لە قەڵەم دەدرێ و هێشتاش گرینگایەتی خۆی هەر ماوە. ڕۆمانی سەدەی نۆزدە ژانرێکە کە تەکنیکەکانی ریالیزمی کلاسیکی تێدا بەکار دێنن و ژنە نووسەرانێکی لە چەشنی شارلۆت برۆنتێ یان جۆرج ئیلیۆت، بۆ نووسین لەسەر ژنان لەم ژانرە کەڵکیان وەرگرت. ئەو شتەی ریالیستەکان لە بەر چاوی ناگرن ئەمەیە کە وەك "کۆرا کاپلن" (Cora Kaplan) لە کتێبی "گۆڕانکارییە چارەنووسسازەکان:

39- The idia of mimesis.



کولتوور و فێمینیزم"[40] (١٩٨٦)دا لێکی دەداتەوە و دەڵێ، دەقەیلی ئەدەبی لە ناخی ئایدۆلۆژییەوە سەر هەڵدەدەن و ئەو ڕاستییەی کە دەری دەبڕن، پابەندی ئەو کولتوورە مێژووییەیە کە ئەو دەقانەی لە خۆ گرتووە. ئەو شتەش کە ڕەخنەی ئەدەبی سەبارەت بە ڕاستی و دروستی ئەو دەقانە دەیلێ بە سەنگی مەحەکی ئەو کولتوورەی کە لێوەی سەرچاوە دەگرن، سەنگوسووك دەکرێ. کاپلن جنسییەت بە چینی کۆمەڵایەتی و زەینییەتەوە گرێ دەداتەوە و دەڵێ، ژنە نووسەران لە بەکار هێنانی گوتاری ئەدەبیی ریالیزم بۆ نواندنەوەی بە ڕواڵەت ریالیستییانەی ژنان، و ڕەخنەی فێمینیستی بۆ ڕێز گرتن لەم نووسەرانە، سەرەڕای ئەوەی کە بە گشتی گومان لە سیستمی پیاوسالار دەکا، لە پێکەوە سازانێکی بەدزیدا ناهێڵن ئەو ژنانەی کە لە دەرەوەی سنوورەکانی ریالیزمن خۆیان بنوێنن:

***لایەنی کەم بەو هۆیەی کە ئەدەبیات یەکێکە لەو گوتارە دەگمەنە گشتییانەی کە ژن تێیدا ڕێگایان پێ دەدرێ قسەی خۆیان بکەن و هەروەتر ئەدەبیات ئەو شوێنەیە کە چیتر ژن لەوێدا وێنەی دەسکردی پیاو نین، حاشا کردنی تەواوەتی لە ریالیزمی دەقی بۆ بزاڤی فێمینیزم کارێکی ئەستەمە. سەرەڕای ئەمانە، زەینییەتی ژنی سەر بە چین و ڕەگەزی دیکە و خاوەن هەڵوێستی جنسیی جیاواز هیچ کات ناتوانێ "بە شێوەیەکی بەرهەست" یان "بە دروستی" لە دەقەیلی ئەدەبیی بەرهەمهاتووی ژنە نووسەری سپی پێست و ناهاوجنس خواز و سەر بە چینی نێوەڕاستی کۆمەڵگادا ڕەنگ بداتەوە، هەرچەند نووسەرێکی لەم چەشنە بێت و بە شێوەیەکی دڵسۆزانە و هاودڵانەش ژن لە گێڕانەوەی خۆیدا بخولقێنێ یان وێنای بکات.***

40- Sea changes: Culture and Feminism.

ئەم چەشنە باسوخواسانە لەنێو بازنەی تێڕوانینەکانی فێمینیستیدا ناشێ وەك خاڵی لاوازی هەڵوێستی فێمینیستی چاویان لێ بکرێ. ئەوەی راستی بێت وەك چۆن تۆریل مۆی (Toril Moi) لە کتێبی "سیاسەتەیلی جنسی/ دەقی: تیۆریی ئەدەبیی فێمینیستی[٤١]" (١٩٨٥)دا ئاماژەی پێدەکات و دەڵێ، ئەو قسەیە کە تیۆریی فێمینیستی زانستێکی پێکهاتوو لە کۆمەڵێك تاك دەنگە ناڕاستە و بۆ بزاڤی فێمینیزم زیانهێنە. تۆریل مۆی دوو نەریتی فیکریی سەر بە بزاڤی تیۆریی فێمینیستی دەستنیشان دەکات: نەریتی ئینگلیزی- ئەمریکایی و نەریتی فەرانسەیی. بە بۆچوونی مۆی، نەریتی یەکەم پتر بۆ ململانێ کردن لە گەڵ جۆرەکانی دەسەڵاتی پیاوانە بەسەر بنکەیلی ئەدەبیات و تۆژینەوەی ئەدەبی، بەتایبەتی "شوێنەواری رەسەنی" ئەدەبی، گەلاڵەی هەڵوێستێکی سیاسی دادەڕێژێ. تیۆریدارێژان و رەخنەگرانێکی فێمینیستی لە چەشنی ئیلاین شوالتێر (Elain Showalter) و ئێلێن مۆرس (Ellen Moers)، لە ڕێگای خوێندنەوەی شوێنەواری رۆماننووسانێکی وەك شارلۆت پێرکینز گیلمەن (Charlotee Perkins Gilman) یان کێیت شۆپن (Kate Chopin)ەوە هەوڵێکی زۆریان داوە نەریتێکی ئەلترناتیڤی (یان جێگرەوەی) ژنانی نووسەر دامەزرێنن، بەڵام مۆی وای لێکدەداتەوە کە ئەوان شوێنەواری رەسەنی ژنانەیان جێنشینی شوێنەواری رەسەنی پیاوانە کردووە، بێ ئەوەی گومان بکەن لە چەمکی هیرارکییەت (زنجیرە پێگە) و دەسەڵاتی دەق کە وەك شێوازێك بۆ گواستنەوەی ئەزموونی جیهانشمولی مرۆڤ لە قەڵەم دەدرێ: «خوێنەری فێمینیست ڕێگای پێنادرێ هەستێتە سەر پا و گومان لەم دەنگە ژنانەیە بکات

41- Sexual/ Textual Politics: Feminist Literary Theory.



و هەڵیسەنگێنێ. دەقی ژنانەش وەك دەقی پیاوانەی پێشوو دەسەڵاتگەرە[٤٢]». مۆی پێی وایە سریشتی رادیکاڵی رەخنە و تیۆریی ئەدەبیی فێمینیستی ئینگلیزی ـ ئەمریکایی خاوەن ئاراستەیەکی سیاسییە، بەڵام باوەڕی وایە کە ئەم تیۆرییە کەوتۆتە داوی تێڕوانینگەلی باوی هیومانیستیی روو لە دەق کە لە سۆنگەیەوە پێوەندیی نووسەر ـ خوێنەر دەبێتە پێوەندییەکی بێگرێ و کێشە و "ئەزموون"ی رەسەنی نێو دەق بۆ متمانە پێدان بە روانگەیەکی تایبەتی سەبارەت بە ژنان بە کار دەبرێ کە وەك روانگەیەکی جیهانشموول دێتە هەژمار. لە هەمبەر نەریتی ئاماژە پێکراودا، مۆی ئاوڕ لە نەریتی فێمینیستی فەرانسەیی دەداتەوە کەو ەك تایبەتمەندیی خۆی، سەرنجی پتر بە دەق دەدات و گرینگایەتییەکی زۆر بۆ تیۆریی دەروونشیکارانە قایلە و لە ژنە نووسەران ناچارەکی وەك داهێنەرانی دەنگی ژنان ناڕوانێ و لە بنەڕەتەوە حاشا لە نووسراوەی پیاوانە ناکات. تیۆریی فەرەنسەیی کۆمەڵێك ژێدەری هزریی جۆراوجۆرتری هەیە و بە پێچەوانەی هەندێ فێمینیستی ئینگلیزی ـ ئەمریکایی هەڵوێستەیلێکی تەواو ناوەند خواز رەچاو ناکات. یەکێك لەو رەخنانەی کە لە ژولیا کریستیوا (Julia Kristeva) یان هێلێن سیکسۆ (Helen Cixous) دەگیرێ ئەمەیە کە لە نووسراوەکانیاندا هەڵوێستگەلێکی دژواز یان ئاژاوەگێڕانە بەدەستەوە دەدەن، بەڵام سەرووتر لەو تێڕوانینانەی کە لەسەر دەستی گوتاری باوی (پیاوانە) سەبارەت بە نڤیسین و خوێندنەوە دێتە ئاراوە، یەکێك لە تایبەتمەندییە زمانییەکانی ئەوان ئەمەیە کە سەرەتا وا دەنوێنن بۆ تێگەیشتن خۆ بە دەستەوە نادەن و ئەو کاتە دەکرێ بە سانایی فام بکرێن کە لە هەمبەر گوتاری رادیکاڵی نەریتی ئینگلیزی ـ ئەمریکایی

٤٢- هەمان سەرچاوە، ل ٧٨.

دابنرێن. پێداگریی رخنەگرانی فێمینیستی لەسەر دەقیش پتر پێداگرتنە لەسەر "نڤیسان" و هەروەتر چێژی زایای[٤٣] نڤیسان و خوێندنەوە کە بۆی هەیە ببێتە هۆی پێداگری لەسەر شێوەگەلی جۆراوجۆر و فراوانی زەینییەت، ئەو شێوانەی کە لە تێڕوانینی ئینگلیزی ـ ئەمریکاییدا ئاوڕیان لێ نادرێتەوە. بەم چەشنە، بنەمای گوتاری پیاوسالارانە، نەك لە رێگەی رووبەڕوو بوونەوە و حاشا لێکردنی، بەڵکوو لە رێگەی "گەمە پێکردنییەوە" سست و بێهێز دەبێ. بە پێی تێڕوانینی فێمینیستیی فەرەنسەیی، بە مانایەك لە ماناکان پێویست ناکات ئاسەواری رەسەن یان بابەتە جۆراوجۆرەکانی ئەدەبیات کە تایبەتمەندیی بەرچاوی کولتووری رۆژاوا و تۆژینەوەی ئەدەبی بوون، لەئارادا بن.

### ٣- زەینییەت:

لەم بەشەی کتێبەکەماندا تا ئێستا لە قاڵبی کۆمەڵێك گرووپی کۆمەڵایەتیدا باسی خەڵکانمان کردووە. مارکسیزم وەکوو فەلسەفە لەسەر دەسەڵات و سەرەتیی چینی کۆمەڵایەتی لە نێو کۆمەڵگادا پێدادەگرێ و زۆربەی روانگە فێمینیستییەکانیش ئەزموونی بە کۆمەڵی ژنان بە گرینگ لە قەڵەم دەدەن. بەم حاڵەشەوە رووبەڕوو بوونەوەی ئێمە لەگەڵ ئەدەبیات ئەزموونێکی تاکەکەسییە. ئێمە بە تەنیا خۆمان دەق دەخوێنینەوە: خوێندنەوە کردەیەکی تاکە کەسییە و زۆرینەی دەقەیلی ئەدەبی، جا چ غەزەلێکی شێکسپیر بێت و چ رۆمانێکی سەدەی نۆزدە، باسی بابەتێك دەکات کە وێدەچێ ئەزموونێکی زۆر شەخسی و تاکە کەسی بێت. زۆربەی دەقەکان، لەو خەڵکە

٤٣- زایا: ئاوەڵناوێکە لە چەشنی ئاوەڵناوگەلێکی وەك: «بینا، ژنەوا، گۆیا» لە چاوگی «زاوزێ کردن»ـەوە وەرگیراوە. مانای دژی «نەزۆك»ی هەیە.



خاوەن کەسایەتییانە پێکهاتووە کە ئێمەی خوێنەر هەوڵ دەدەین شوناسی خۆمان لە شوناسی ئەواندا بدۆزینەوە، گەرچی بە دڵنیاییەوە دیارە رێژەی ئەم کردەیەی خوێنەران لە گەڵ کەسایەتییە جۆراوجۆرەکان، یەکسان نییە. ئەدەبیات وەك گوتار وێدەچێ تاکەکەسێتی و لە راستیدا تاقانەیی و سەربەخۆیی ئێمە لە نێو جیهان و لە هەمبەر مرۆڤانی دەور بەرمان دەسەلمێنێ. لە هەمان کاتدا خوێندنەوەی ئەدەبیات ئەم هەستەمان تێدا بەدی دێنێ کە دەتوانین شوناسی خۆمان لە شوناسی کەس یان کەسانێکی تردا بدۆزینەوە، واتە کەسایەتییەکان کۆمەڵێك ئەزموونی هاوشێوەی ئێمەیان هەیە و بە پێچەوانە، نەریت یان ئایدۆلۆژیی هیومانیستی، بەتایبەت لە قۆناغی رێنیسانس بە دواوە، گرینگایەتییەکی تایبەت بۆ تاکە کەس قایلە. لە هەندێ شوێنی مێژووی ئەدەبیاتدا، تاکە کەس تەژی لە تایبەتمەندیی باڵادەستانە و سەیر و سەمەرەیە، وەك لە شێعری رۆمانتیکی کۆلریج، یان لە چیرۆکە پڕ لە بەسەرهاتەکانی "جان بوکن"دا.

لە تێڕوانینگەلی هیومانیستیدا "مرۆڤ" ناوەندی جیهان، و تاکە کەس ژێدەر و دوامەبەست و غایەتی هزر و کردە و واتایە. بە وتەیەکی تر هیومانیزم هەر لە بنەڕەتەوە جیهان لە روانگەی تاکە کەسەوە شیدەکاتەوە. لە چوارچێوەی ئەم نەریتەدا، فەلسەفە و ئەدەبیات ئاوڕیان لە تاقانەیی و سەربەخۆیی تاکە کەس داوەتەوە و لەسەر ئازادیی هەڵبژاردن و وزەی خەیاڵ و کردەی تاکە کەسی پێیان داگرتووە. گێڕانەوە مێژوویییەکان بە گشتی لە سۆنگەی پێداگرتنی بەردەوامیان لەسەر کەسانی هەڵبژاردە و ئاوارتە لەبری گرووپە دەستەجەمعییەکان، دەبنە هۆی بەهێز کردن و گەشەسەندنی ئەم باوەڕە و سەرهەڵدانی {ژانری} ژیاننامەنووسی و خۆژیاننامەنووسی لە سەدەی نۆزدەهەمدا و سنووری گرینگی

پێدان بە تاکە کەس بەرفراوان دەکەن. شوێنەوارێکی ئەدەبیی لە چەشنی "ژێرمینالّ" (Germinal) بەرهەمی ئێمیل زۆلا و "مرۆڤدۆستانی رەشوڕووت" بەرهەمی ترێسێل، کە گومانیان لە بەهای تاکە کەسێتی دەکرد و دەیانخواست ئاستی ئینسانیی کەسایەتییەکان دابەزێنن یان قارەمانەکان وەلانێن، زۆر بە دەگمەن هەڵدەکەون و گەلێ جار وەك شوێنەواری گەورەی ئەدەبی چاویان لێ ناکرێ، چونکی نەیانتوانیوە راستەقینە و واقیع لە چوارچێوەی وشیاری و خودئاگاییی تەواو خۆیا بووی کەسەکاندا بنوێننەوە. خەڵکان لە هەمان کاتدا کە تایبەتمەندیی تایبەت بە خۆیان هەبوو، بە خاوەن سریشت یان ئەسڵێکی هاوبەشیش لە قەڵەم دەدران. ئەم تایبەتمەندییە هاوبەشە، سەنگی مەحەکێکی سەرەکییە کە کۆمەڵێك ناو و نازناوی جۆراوجۆری بۆ بەکار براوە، وەك: رۆح، شەرافەتی گشتی[44]، تێگەیشتنی هاوبەش[45] و هتد. ئەم تایبەتمەندییە هاوبەشە بۆی هەیە سنووری جیاوازییە تاکە کەسییەکان ببەزێنێ، و لە حوکمی هۆکارێکی رێکوپێکی بەخش دایە کە کەسانی جۆراوجۆر، سەرەڕای تاکە کەسێتییان، وێك دەخا و بە یەکەوەیان گرێ دەدات. بەڵام ئەم تایبەتمەندییانە هەر وا لە سریشتی تاکەکەسدا بوون، نەك لە شێوە کۆمەڵایەتی و دەستەجەمعیتری مەعریفە یان سیستمی رێکخستن (organization).

هەندێ تیۆری کە لە لایەنی مێژووییەوە، نەك لە سۆنگەی هاوشێوەیی و هاوچەشنییان، بە نازناوی گشتیی "پاش پێکهاتەخوازی[46]" ناسراون، گومانیان لە چەمکی تاکە کەس کردووە. لەم تیۆرییانەدا، سەرەتا دەستەواژەی

44- Basic common deceny.
45- common sense.
46- post- structuralism.



"سووژە[47]" جێگای بە "تاکەکەس" چۆڵ کردووە تا ئەم راستییە روون بێتەوە کە تێڕوانین و بۆچوونێکی جیاواز بۆ ئەم چەمکە هاتۆتە ئاراوە، وەك چۆن "گوتار[48]" لە بری "زمان" بەکار دەبرێ، یان "ئاکام[49]"، وەك پێداچوونەوەیەك، لە جیاتی کۆتایی (ending) یان گرێ کردنەوەی (چیرۆك) بەکار هاتووە. دەستەواژەی سووژە ئاماژە بۆ دوو مانا دەکات: یەکەم، مەبەست لە سووژە بکەری رێزمانیی‌یە، بە واتای ئەو تاکە کەسێتییەی کە زمان دەیخاتە بەر دەستمان تا بۆمان هەبێ بڵێین "من" و خۆمان لە خەڵکانی تری دەوروبەرمان جیا بکەینەوە. جگە لەمە، واتای بەربڵاوتری سووژەی تاك هەر ئەو واتا وێنا کراوە دەگەیەنێ کە فەلسەفەی هیومانیزم و ئایدیالیزم بە دەستەوەی دەدەن، زەینی تاکێك کە جێگە و پێگەی وشیاری و ناخودئاگایی و مانا، و جیا لە جیهانی دەوروبەری خۆیەتی. مانایەکی زۆر جیاوازی ئەم دەستەواژەیە، تاك لە روانگەی سیاسی‌یە، وەك سووژەی یاسا یان سووژەی حکوومەتێکی سیاسی. ئەم شتە دەربڕی ئەو راستییەیە کە تاك لە دیاریکردنی {چارەنووسی} ژیانی خۆیدا سەربەست نییە، بەڵکوو چاو لەدەستی ئەو هێزە کۆنترۆڵکەرانەیە کە لە کۆمەڵگادا دەکەونە گەڕ. ئەم تێڕوانینە ئەو پرۆسانە پووچەڵ دەکاتەوە یان پێکهاتەکانیان هەڵدەوەشێنێتەوە کە تێیاندا تاك بە شێوەیەکی نەریتی بە ناوکی جیهانی بوون و جیهانی واقیع هاتوونەتە ئەژمار یان وێنا کراون. لەم تێڕوانینەدا مرۆڤەکان خاوەن ئازادیی تاکەکەسی و وشیاری و خودئاگاییەکی تاقانە و یەکگرتوو نین، بەڵکوو کۆمەڵێك سووژەن کە لە گۆشەنیگای کۆمەڵایەتییەوە لەسەر دەستی زمان یان گوتار و بنکەیلی

47- subject.
48- discourse.
49- closure.

جۆراوجۆر و کۆمەڵێك پێوەندیی هەمەچەشن بیچمیان گرتووە کە بەرەو بە شوناسی تاکەکەسی دەدەن یان گەشە و نەشەی پێدەبەخشن. هەروەتر تاك چیتر بوونەوەرێکی تاك شێوە و یەکانگیر و سەربەخۆ لە قەڵەم نادرێ، بەڵکوو لێکهەڵوەشاوەتەوە و بۆتە مەیدانی ململانێیەك کە تێیدا هێزە جۆراوجۆرەکان جێگە و پێگەی ئەو تاکە بە شێوەگەلی جیاواز و جاروبار دژواز دیاری دەکەن.

## زەینییەت و کەسایەتی

زەینییەت لە دەقەیلی ئەدەبیدا پتر لەسەر بنەمای هۆکاری "کەسایەتی" دادەمەزرێت. ئەمە راستییەکی روون و ئاسایی دەنوێنێ، چونکی ئێمە کەسایەتی وەك کەرەسە و تەمهیدێکی دەقی بۆ هێنانە ئارای کۆمەڵێك رێگا و رەوشتی بینین و شەرح و شیکردنەوەی رووداوەکان دێنینە ئەژمار، و لە راستیشدا هەر لەم سۆنگەیەوەیە کە کەسایەتی وەك تەمهید یان تەکنیك لە دەقەیلی ئەدەبیدا تا ئەم رادەیە سروشتی و بەبڕشتن. کەسایەتی لە دەقە ئەدەبییەکاندا لەگەڵ بۆچوونی ئێمە لەمەڕ تاکەکەسێتی لە گوتارەیلی تردا هاوشێوە و یەکسانە. یەکەم هەنگاو بۆ ناسینەوەی دەق یان "ئاشنایەتی" لە تەك دەقدا ئەو کاتەیە کە تایبەتمەندییەکانی یەکێك لە کەسایەتییەکان دەناسینەوە. وەك لویی ئالتوسێر باسی کردووە، "ئاشکرا و ئاسایی بوون[50]" کاریگەرترین شێواز بۆ ئەو راستییەیە کە وا لە خەڵکان بکەین کە شتێك بە راستەقینە یان سروشتی لە قەڵەم بدەن:

*ئاشکرا و ئاسایی بوون... کاریگەرێتیی سەرەتایی ئایدۆلۆژیکییە... وەك هەموو شتێکی ئاشکرا و ئاسایی، لەوانە ئەوەی دەبنە هۆی ئەم راستییە کە*

50- obviousness.



*وشە "ناوی شتێك بێت" یان "هەڵگری مانایەك بێت" (کەواتە، ئاشکرا و ئاسایی بوون شەفافییەت و روونیی زمانیش لەخۆ دەگرێ)، ئەم شتە ئاشکرا و ئاساییە کە من و ئێوە سووژەین ـ و ئەم بابەتەش هیچ گرفتێك ناهێنێتە سەر رێ ـ کاریگەرێتییەکی ئایدۆلۆژیکییە، کاریگەرێتیی سەرەتایی ئایدۆلۆژیکی.*[51]

بەشێکی زۆری شێوەگەلی رەخنەی ئەدەبیی پێشوو، لەم بابەتە ئاشکرا و ئاساییەدا یەکدەگرنەوە کە دەقەیلی ئەدەبی هەر لە بنەڕەتەوە سەبارەت بەو کەسانەن کە گەرچی زیاتر بە دەسکردی خەیاڵ دێنە ئەژمار، بەڵام وەك ئێمە ژیان دەبەنە سەر و بە پێی تایبەتمەندی و تەکوزیی واقیع نوێنیان هەڵدەسەنگێندرێن. تاوتوێ کردن و تۆژینەوە لەسەر کەسایەتی، باس و بابەتی زاڵی رەخنەی ئەدەبی بوو. ئەوەی راستی بێت، هێشتاش بە دڵنیاییەوە لە زۆربەی هەرە زۆری زانکۆکاندا هەر وایە و لە تاقیکارییەکاندا بەردەوام ئەو پرسیارانە دێنە ئاراوە کە لەسەر تەوەری کەسایەتی لەنگەر دەگرن و ئاوڕدانەوەی سەرەتایی بۆ دەقێك، زۆر جار و بە بێ‌ڕەچاو کردنی هەڵوێستێکی رەخنەگرانە، لە رێگای کەسایەتییەوەیە کە ئاشکرا و ئاساییترین یان سروشتیترین دەلاقەیە بۆ دەستڕاگەیشتن بە دەق. پێش سەرهەڵدانی تیۆریی ئەدەبی لە بریتانیا، ئێل.سی. نایتس (L.C.Kinghts)ـی رەخنەگر، لە وتارێکدا بە ناوی "خاتوو مەکبێس چەند منداڵی هەبوو؟" (١٩٣٣) باسی هەڵەکاریی (fallacy) بە راستەقینە لە قەڵەم دانی کەسایەتییەکانی کرد و رەخنەی لەو رەخنەگرە ئەدەبییانە گرت کە هەر وەك هەمیشە سەرقاڵی

51- Louis Althusser, "Ideology and Idiological state Apparatuses", in "Lenin and philosophy and other Essays (New York/ London, Montly Review press (1971)pp.171-2

تۆژینەوە لەسەر کەسایەتین و لەو لایەنانەی کە ئەو ناوی دەنان لایەنە شێعرییەکانی دەق ناکۆڵنەوە. دیارە تێڕوانینی ئەم ڕەخنەگرانە تیۆریی لۆکاچ و ئەوانیتری سەبارەت بە سریشتی ئایدۆلۆژیکیی ئەدەبیات، بەتایبەتی ڕۆمان، سەلماند، ئەو سریشتە ئایدۆلۆژیکییەی کە لە نوختەنیگای کولتوورییەوە لە ڕەوتی بیچم گرتنی بۆچوونی ئێمە لەمەڕ زەینییەت گەلێ گرینگە و لەسەر دەستی ڕاڤەی کەسایەتی ـ تەوەرەوە بەهێز دەبێت.

تیۆریی ئەدەبی و ڕەخنەگرانە و بە شێوەیەکی گشتیتر تیۆریگەلی ئایدۆلۆژی، تێڕوانینی ئێمەیان سەبارەت بە کەسایەتی لە نێو دەقی ئەدەبیدا گەلێ گۆڕیوە. ئالتوسێر و هەندێ تیۆریداڕێژی تر، زەینییەتی تاك، لە گۆشەنیگای کۆمەڵایەتییەوە، بە دەسکردی زمان و پرۆسە کۆمەڵایەتییەکانی تر دەزانن. ئەدەبیات لەسەر دەستی کۆمەڵێك تەکنیك و تەمهید، لە ڕێگای بەرهەمهێنانی سووژە {یان جۆرە زەینییەتێکەوە}،هەم لە خوێنەر، کە زەینییەتی بە دەستی دەق دیاری دەکرێ، هەمیش، لە ئاستی دووهەمدا، لە هەناوی دەقدا، جۆرە زەینییەتێك بەرهەم دێنێ، ئەوەش لە ڕێگای خولقاندنی کۆمەڵێك کەسایەتی یان سووژەی خەیاڵکردی زیاترەوە. سووژەی سەرەکی لە پرۆسەی خوێندنەوەدا خوێنەرە و زۆر جار بە شێوەیەك ڕوو لە خوێنەر دەکرێت کە دەق لەسەر بنەمای زەینییەتی ئەو بیچم دەگرێ و تەکووزی پێ دەبەخشرێ. تەمهیدی لە چەشنی گۆشەنیگا و گێڕانەوە دەبنە هۆی ئەوەی ڕووداوەکان بە شێوەیەکی تایبەتی ببیندرێن و ڕاڤە بکرێن. هەڵبەت هەندێ دەق هەن بارودۆخی خوێنەر وەك سووژە تێکدەڕمێنن. نموونە دیارەکانی، ڕۆمانی "ئەگەر مسافیرێك لە شەوێکی زستاندا[52]"ی ئیتالۆ کالوینۆ (Italo Calvino)یە و

52- If on a winter's Night a Traveller.



زۆر پێش ئەویش، "تریسترام شەندی"ی بەرهەمی لارێنس ئێسترنە، بەڵام ئەم دوو ڕۆمانە دەکرێ وەك ئاوارتە و بەدەر لە ڕێسا حیسێبیان بۆ بکرێ. ئەو پرۆسەیەی کە تێیدا خوێنەر لە مانای دەقێك دەگات، پتر بە سووژە بوونی وی سەرەتی دەبەخشێ، خۆ دۆزینەوە و خۆناسینەوە لە نێو کەسایەتیی سەرەکی یان گێڕەرەوەشدا هەمان تاو و تەئسیری هەیە. ستراتیژیی تۆلستۆی لە ڕۆمانی "ئاناکارنینا"دا ئەمەیە کە خوێنەر دەخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە تا ڕووداوەکان بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، لە گۆشەنیگای کەسایەتیی سەرەکییەوە، واتە لێوین، تەجرەبە بکات. دۆخی خوێنەر بە چەشنێکە کە بیر و بۆچوون و تێڕوانینی تاکەکەسی، و گەلێ جار تەواو زەینیی لێوین، بە شێوەی زاڵ و سروشتیی ڕاڤەی ڕووداوە نوێندراوەکانی دەق بیچم دەبەخشێ. لە دۆخەیلی تردا، ئەم ڕووداوانە لە ڕێگای ئەزموونی زەینیی کەسایەتییە تاکەکانی ترەوە دەردەبڕدرێن. وەك چۆن ڕابین ئوود (Robin wood) لە وتارێکیدا بە ناوی "لێوین و قەرەباڵغی" (١٩٧٩) لەسەر ڕۆمانی ئاناکارنینا پێمان دەڵێ، تۆلستۆی بۆ نیشاندانی "ئەزموونی بە تاکەکەسێتی کراو[53]"، ڕیالیزم دەگەیەنێتە دوا سنوورەکانی خۆی: کەسایەتیی لێوین لە نوختەنیگای دەروونشیکارییەوە جێی باوەڕ پێکردنە و یەکانگیرە، «بەڵام ئەمە سریشتی ستراتیژیی "ڕیالیستی"یە، واتە داسەپاندنی ئایدۆلۆژییەکی گشتی لە ڕێگای پاساو هەڵگر بوونی دەروونشیکارانەی بابەتێکی تایبەت.» ئالتوسێر پرۆسەی ناسینەوە و خۆدۆزینەوە لە کەسایەتیدا ناو دەنێ «وەڵامخوازی» (interpellation) کە لە ڕێگەی ئەم پرۆسەیەوە، خوێنەر بەو چەشنە دەبنە بەردەنگ و ڕوویان تێدەکرێ کە دەسنیشانکەری دۆخ و پێگەی ئەوانە. خوێنەر

53- individualized experience.

بەرەو {تیڕوانینی} لیۆین هان دەدریۆ و بیر و باوەڕی ئۆرگانیك و زیندووی رۆمان لە رێگای ئەم کەسایەتییەوە پێی دەگات. تەنیا بەو مەرجە دەکرێ خۆمان لەم پروسەیە بپارێزین کە بە شێوەیەکی دیکە دەق بخوێنینەوە و دژ بەم دەسنیشانکردنە رابوەستین، دەنا خۆدەرباز کردنی لێی کارێکی ئەستەمە. ئەم بابەتە بەتایبەت سەبارەت بە ئەدەبیاتی ریالیستیی کلاسیك وەڕاست دەگەڕێ کە ئێمە وەك خوێنەر لە بیر و باوەڕی کەسایەتییە سەرەکییەکان یان گێڕەرەوەدا شەریك و برابەشین، کەواتە تێگەیشتنی ئێمە وەك سووژەی خوێندنەوەی دەق، بەو چەشنە رەنگدەداتەوە کە کەسایەتی یان/ و گێڕەرەوەکان بە مانای ئەو رووداوانەی کە "تەجرەبەی دەکەن" پەی دەبەن. لە رۆمانی "ئاواتە مەزنەکان"دا، ئەو کاتەی پیپ پتر لە پێشوو لە دۆخ و جێگە و پێگەی خۆی دەگات و باوەڕێکی ئەخلاقیی تایبەت وەدەست دێنیۆ، یان لە رۆمانی "پارکی مەنسفیلد"دا، ئەو سەروبەندەی "فەنی" کۆمەڵێك بڕیار دەدات کە گێڕەرەوە پەسندیان دەکات و دەیانسەلمێنیۆ، خوێنەر وا هەست دەکات کە ئەوە خۆی خەریکە بە چەشنێك لە زانیاری و مەعریفە دەگات، بەڵام وێدەچیۆ بە شێوەیەکی سەربەخۆ و جیا لە دەق. ئەوەی راستی بێت، ستراتیژییەکانی دەق گەلیۆ جار ئەم راستییە دەستەبەر دەکەن کە مەعریفەیەکی لەم چەشنە ناچارەکی دەشیۆ وەدەست بێت، مەگین ئەوەی خوێندنەوەی ئێمە بە ئەنقەست دژ بە حاڵەتی باو بێت. کەواتە، خوێنەر سەرەتی پێدەبەخشریۆ و جێگەیەکی شایانی پێدەدریۆ، یان بە زمانی تیۆری "جۆرە ئاوێنەیەکی وردبینی باڵادەست[54]»ـە کە لە سۆنگەی ئەوەی سووژەیە، دەتوانیۆ لە کەسایەتی و رووداوەکانی رۆمان بکۆڵێتەوە و سەنگوسووکیان بکات. ئەم بابەتە، وەهمی

54- dominant specularity.



هزری سەربەخۆ دێنێتە ئاراوە و پشتیوانی دەکات لە کۆمەڵێك بیر و باوەڕی بیۆبنەمای لەمەڕ تاکەکەسێتی و وزە و توانایی ئەم تاکەکەسێتییە کە لە دەرەوەی دەق دەکەوێتە گەڕ. زۆرینەی دەقی ئەدەبی، جا چ شێعر بن، چ شانۆنامە یان ئەدەبیاتی داستانی، پێگەیەك بۆ سووژە تەرخان دەکەن کە پتر لە قەوارەی کەسایەتییەکدا خۆیا دەبێت کە کردەی داستانی یان ئەزمونی گێڕدراوە لە روانگەی ئەوەوە دەبینرێت و ناکریۆ هەروا سووك و سانا دژایەتی لەگەڵ ئەم پێگەیە بکرێت.

پێداگریی زۆربەی تیۆرییە ئەدەبییەکان لەسەر ئەم خاڵە بووە کە دەق بە چەشنێك لێیان بکۆڵدرێتەوە کە شێوازەیلی کەسایەتی تەوەر هەمیشە لە پێشەوە نەبن و هەموو تۆژینەوەیەك هەر بەوان دەسپێنەکەین، یان کە باسی کەسایەتی دەکەین، کەسایەتی وەك تەکنیکێکی دەقی و بە گشتی وەك بەشێك لە قەراردادەکانی گوتاری ئەدەبی بێنینە ئەژمار. لە نەریتی لیبراڵ ـ هیومانیستی نقیسان و رەخنەدا کە بابەتە سەرەکییەکانی بریتی بوون لە شوناس یان سریشتی راستەقینەی تاك، گەشەی ئەخلاقی، گۆڕان بەسەردا هاتن و هتد، سەرنجڕاکێشیی کەسایەتی پتر لە جاران قوڵاییی بە چەمکەیلی زەینییەت بەخشی چونکی لە ناخ و ناوەرۆك و راز و رەمزی خودئاگاییی کەسایەتییەکان دەکۆڵدرایەوە. سنوورەکانی ئەم بابەتە لە ئاخر و ئۆخری سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا شانبەشانی تەشەنە سەندنی زانستی دەروونشیکاری کە دواجار بوو بە گوتارێکی گەلیۆ کاریگەر و بەبڕشت، بەرفراوان بۆوە. بە باوەڕی فرۆید و پەیڕەوانی، واقیع لە هەر لایەنێکەوە لێی بڕوانی رەگی لە تاکەکەسدا داکوتاوە، بەڵام لەو پاژانەی شاراوەی دەروونی تاکەکەسدا کە ئاشکرا کردنی ئەستەمە. لە گۆشەنیگای ئالتوسێرییەوە، ئەم

تیڕوانینانە لە ڕێگەی بەهێز کردنی بۆچوونی نادروستی تاکەکەس خوازییەوە، دەبنە هۆی بەهێز کردنی پتر ئایدۆلۆژیی سووژە. ئەم خاڵە لەوانەیە بۆمان روون بکاتەوە کە بۆچی تیۆرییەکانی فرۆید لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا، لە چاو تیۆرییەکانی مارکس پتر پەسند دەکران و زۆر خێراتر لە تیۆریگەلی مارکسیستی، کە نەیانتوانی بە هاسانی ببنە ئایدۆلۆژیی زاڵ و ئوستوورەکانی خۆیانی تێدا بتوێنەوە، جێی خۆیان کردەوە و رەگیان داکوتا.

## تیڕوانینگەلی دەروونشیکارانە

لە نوختەنیگای کولتوورییەوە کاریگەرێتیی تیۆریی فرۆید و تیۆرییەکانی پشت ئەستوور بەو، گەلێ فراوان بووە، نەك هەر لە باری شێوەوە، بەڵکوو لەو لایەنەشەوە کە گوتاری دەروونشیکاری تا رادەیەك بەرەو زۆربەی زانست و شێوەکانی تێفکرین ڕێگەی خۆی بڕیوە و وەك فۆرمێکی باوی تێگەیشتی زەین لە قەڵەم دەدرێت. لە تیۆریی ئەدەبیدا کە دیارە لە سەردەمێکی پاش فرۆیدیدا سەری هەڵدا، ناکرێ لە خۆ سەرقاڵ کردن بەم تیۆرییانە خۆ ببوێرین، تەنانەت گەر ئەم سەرقاڵییە ببێتە هۆی حاشا کردن لەم تیۆرییانە. فرۆید خۆیشی، وەکوو مارکس، بە مەبەستی شیکردنەوە و شەنوکەو کردنی هەندێ لە تیۆرییەکانی ئاوڕی لە ئەدەبیات دایەوە. «گرێی ئۆدیپ» یەکێکە لەو نموونە هەرە باشە ناسراوانەی کە لە زەینی زۆربەی خەڵکدا جێی گرتووە. مۆدێلی فرۆید بۆ دەروونی تاك، کە لە سێ پاژ یان توێژی «خودئاگا[55]، نیوەئاگا یان پێشئاگا[56] و ناخودئاگا[57]» پێکهاتووە، گەلێ کاریگەر و شوێندانەر بووە،

55- conscious.
56- subconscious or preconscious.
57- unconscious.



بەتایبەت لەو سۆنگەیەوە کە مۆدێلی فرۆید دەڵێ، هەرێمێکی نوێی هەڵسوکەوتی مرۆڤی دۆزیوەتەوە کە ئەگەرچی لە ژیانی ئاساییدا ئاگامان لێی نییە، بەڵام هەڵگری چەشنە هەقیقەتێکی غایەتمەندە: ئەم هەرێمەی دەروون بریتییە لە ناخودئاگا کە قووڵترین مەیل و خواست و ترس و سامی خۆمانی تێدا دەشارینەوە یان سەرکوتی دەکەین، ئەو هەرێمەی کە تەنیا بە شێوەگەلی (سەمبۆلیك و) هێمایی خەون دێتن، یان زمان گیران یان وەك دەڵێن زمان گیرانی فرۆیدی، و یان بە درێژاییی پرۆسەی درێژخایەنی دەروونشیکاری بۆی هەیە خۆیا ببێت و خۆ بنوێنێت. بە پێی تیۆریی فرۆید، ژیان لە ئاستی خودی بەئاگادا، جۆرە سەرپۆش یان رواڵەتی جیهانی بوونە کە هێزەکانی هەناوی ناخودئاگا چاوەدێریی دەکەن. لەم روانگەیەوە فرۆیدیزم لەوانەیە لەگەڵ چەمکی مارکسیستیی ئایدۆلۆژی خاڵی هاوبەشی زۆری هەیە. ئەم دوو تیۆری یان فەلسەفەیە، زۆر جار لە گەلێ لایەنەوە دژی یەکتر دێنە ئەژمار، بەڵام لە هەندێ تیۆریی ئەدەبیی نوێدا، هەندێ لایەنی ئەم دوو تیۆرییە تێکەڵ بوون. بۆ وێنە، فریدریك جیمسۆن، ئایدۆلۆژیی دەقەیلی ئەدەبی، بە شکڵێکی «ناخوئاگای سیاسی» لەقەڵەم دەدات. مۆدێلی دوایی فرۆید بۆ کەسایەتیی مرۆڤ بریتییە لە "کەڵەخود[58]" و "خود[59]" و "ناخود[60]" هاوڕێ لەگەڵ "ئەسڵی چێژ" یان بزوێنەری سێکسیی "ئێرۆس" (eros) کە وەك هۆکاری سەرەکیی دەسنیشانکردنی گەلێ لە کردە و هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ وەکوو نووسین و خوێندنەوە، لەسەر ئەو چەمکە بەر سەرنجانەی رەخنەگران و نووسەران لەمەڕ کەسایەتی تاو و تەئسیرێکی فراوان و بەرچاوی بووە. هەڵبەت دەشێ

58- superego.
59- ego.
60- id.

ئاگامان لەوە بێت کە بیر و بۆچوونەکانی فرۆید گەلێ گۆڕانکارییان بەسەردا هات و نووسەران و رەخنەگران زۆرتر بە شێوەیەکی گولبژێرانە کەڵکیان لێ وەرگرت. هەنووکە چەندان فرۆید لە ئارادان و تیۆریی فرۆیدیش وەکی مارکسیزم، هێشتاش هەروا لە بەرفراوان کردنی سنوورەکانی خۆیدایە.

تیۆرییەکانی فرۆید بەتایبەتی لە رەخنەی ئەدەبیدا شوێندانەر و بە چەند هۆیەك لە پەرەسەندنی هەندێ هەرێمی تیۆریی ئەدەبیشدا رێشاندەر بووە. یەکەم بەو هۆیە کە تیۆریی فرۆید دەخوازێ بۆ ئەو بزوێنەر و پاڵنەرانەی کە بنەمای شێوەی هەڵسوکەوت و رەفتاری مرۆڤ پێکدێنن، مۆدێل و لێکدانەوەی جیهانشموول بەدەستەوە بدات. چەمکەیلێکی لە چەشنی "مەیل[٦١]" و "چێژ[٦٢]" لەم ساڵانەی دواییدا بە شێوەیەکی بەربڵاو لەسەر بابەتی نووسین و خوێندنەوە و لە قەوارەی کۆمەڵێك تیۆریدا دابەزێندراون. ئەم بابەتە لەگەڵ تیۆریی فرۆید دەربارەی گەشە کردنی دەروونیی تاك و قۆناغە جۆراوجۆرەکانی ورووژان و ئاگایی کە دەیانبڕێ، پێوەندییەکی زۆر نیزیکیان هەیە. خاڵی دووهەم ئەوەیە کە فرۆید بۆ راڤە کردنی چۆنێتیی دەرکەوتنی مەیل و چێژ و لایەنەکانی تری دەروون، هەندێ رێگا و رەوشتمان ئاراستە دەکات، بەتایبەت ئەو رەوشتانەی کە تێیاندا فرۆید بۆ راڤە کردنی خەون و زیندەخەون لەسەر سەمبۆلیزم و دوو دیاردەی پێوەندیدار بەم باسە واتە "جێگۆڕکێ[٦٣]"و "تێکەڵکاری[٦٤]" پێدادەگرێ. ئەم چەمکانە تاو و تەئسیرێکی تایبەتیان لەسەر شوێنەواری مۆدێرنیستی سەرەتاکانی سەدەی بیستەم هەبوو و دواتر برەویان بەو

61- desire.
62- pleasure.
63- displacement.
64- condensation.



رێگا و رەوشتانەی خوێندنەوە دا کە لەو دیوی رواڵەت یان روخساری وشەکانەوە بە دوای مانادا دەگەڕان. بە واتایەك، فرۆید لە رێگای باوەڕمەندی بەخشین بەو راڤانەی کە لە رابوردوودا لە گۆڕێدا نەبوون، پتر لە پێشوو ئیمکان و ئەگەری ئازادی و سەربەخۆییی هەڵسوکەوت و داهێنانی بە رەخنەگران بەخشی. بۆ وێنە، هەندێ بەشی رۆمانی پارکی مەنسفیلد لە ژێر تیشکی تیۆریی فرۆیددا مانای تازەیان دەبێ و هەر بۆیە ئەو دیمەنەی کە تێیدا "فەنی" دەخوازێ بە دەروازەی ئاسنیندا تێنەپەڕێ و نەکەوێتە بیابان، بۆی هەیە زیاتر لە جاران بە شێوەیەکی تایبەت هەڵگری دەلالەتێکی جنسی (واتە سەرکوتکردن و چەپاندنی مەیلێك) بێت. لێکدانەوەی ویلیام ئێمپسن لەسەر کۆمەڵێك دیمەنی "بەسەرهاتەکانی ئالیس لە ولاتی شتە سەیرە و سەمەرەکاندا[٦٥]" (١٨٦٥) لە کتێبی "چەند گێڕانەوەیەکی شوانکارەیی[٦٦]"دا (١٩٣٥)، نموونەیەکی هەرە دیاری رەخنەیەکی تەواو فرۆیدییە:

*بۆ فرۆیدی نواندنی ئەو حیکایەتە خەونئامێزەی کە ولاتی شتە سەیر و سەمەرەکان بە پێی ئەو حیکایەتە شیکراوەتەوە و پەرەی پێدراوە، هەر ئەوەندە بەستە ئەم چیرۆکە بگێڕینەوە. کەوتنە خوارەوە لەنێو بیرێکی قووڵ بۆ هەناوی راز و رەمزەکانی دایکی خاك، رۆحێکی بە پەرژینکراوی دیکە دەخولقێنێ کە خۆی ناناسێ، و بە جێگەی خۆی لە جیهاندا نازانێ و بەڵەدی رێگای چوونە دەرەوە لەو شوێنە نییە... ناوەرۆکی مۆتەکەئاسای لەدایکبوون وەك خەسارێکی دەروونی و ئەوەی ئالیس هێندە گەورە دەبێتەوە کە ژوورەکە بۆی چکۆلەیە و فشاری بۆ*

65- Alice's Adventures in Wonderland
66- some version of pastoral.

***دێنیٚ... ئەو کاتەی ئالیس بە وردی لەنێو بیرەکەوە لە باغ دەڕوانیٚ، لەوانەیە مەیلی گەڕانەوە بۆ پڕدانی دایك و راکردنی لەو بیرە هەبێت...***[٦٧]

بڵاو بوونەوەی رۆمانی "دڵی تاریکی" بەرهەمی جۆزێف کۆنراد هاوکات بوو لەگەڵ برەو سەندنی تیۆرییەکانی فرۆید سەبارەت بە خەون کە لە کتێبێکدا بە ناوی "راڤەی خەون[٦٨]" (١٩٠٠) بڵاو بۆوە. سەمبۆلیزم و تەمومژی پڕپێچوپەنا و گەلاڵەی (بەڕواڵەت) شێواوی رۆمانی "دڵی تاریکی"، زۆر لە خەون دەچیٚ ـ کە فرۆید باسی سریشت و کار و ئەرکی کردووە ـ و دەقی گۆڕین بە هاسانی بۆ راڤەی دەروونشیکارانە خۆی بە دەستەوە دەدات. مەبەستی فرۆید لە "تێکەڵکاری"ی نێو خەون ئەو شێوانەیە کە وێنە یان وشەیەك بۆی هەیە چەند مانای هەبێت، بە چەشنێك کە چەند چەمك و واتا لە رێگەی هێنانەوەیان بۆ بەرچاو لە یەك نیشانە یان وێنەدا کورت دەکەینەوە کە لەوانەیە تێگەیشتن لە ماناکەی ئەستەم بێت. نموونەیەك بۆ ئەم حاڵەتە لە دەقی ئەدەبیدا، دەسپێکی رۆمانی "دڵی تاریکی"یە کە تێیدا وەگێڕێکی نەناسراو سەبارەت بە تاقمێك لەو کەسانە قسان دەکات کە لە نێو گەمییەك دانیشتوون و دۆمینە دەکەن، وەك بڵێی "ئەندازیارانە بە ئێسکەکان کایەی خانوو دروست کردن دەکەن". وشەی "ئێسکەکان" لەم قۆناغەی رۆمانەکەدا، تا رادەیەك نائاسایی دێتە بەرچاو، بەڵام دواتر دەزانین کە چەندین شت دێنێتەوە بەرچاو کە بە درێژاییی گێڕانەوەی چیرۆکەکە یەکدەگرنەوە. مۆرەکانی دۆمینە لە جنسی عاج دروست کرابوون کە هێمای سەرچاوەی سەروەت و سامانێکن کە پارێزەر و ژمێریار کە وا بیٚئاگا لە هەموو شت خەریکی کایە کردن بەو مۆرە

67- William Empson, some version of pastoral (London, chatto and windas, 1986) p.271. originally published in 1935.
68- The interpretation of Dream.



داتاشراوانەن دواتر تێر و تەسەل دەکەن. بەڵام ئەم ئیماژە و وێنانە بە ئیماژی ئێسك و پرووسك و شین بوونی گژوگیا لەنێو ئەو ئێسك و پرووسکانە کە خۆی ئیماژی شارێکی گەورە و شین بوونی گژوگیا لەنێوان شەقام و کۆڵانە زیخڕێژەکانی بەدوادا دێت، دەلکێنەوە. ئەم کۆمەڵە ئیماژە مانا و واتاگەلێکی پڕپێچوپەنا بەرهەم دێنن کە روونکردنەوە و شیکردنەوەیان بە شێوەیەکی مەنتقی یان ئاگادارانە کارێکی ئەستەمە. بێگومان، پێکەوە لکانی ئەم چەمك و واتایانە ئاماژەیەکە بۆ تەرمی سەرمایەداری، بەڵام بە چەشنێك کە کەسایەتییەکان لێی بیٚئاگان و خوێنەر دەشیٚ لە رێگەی کۆمەڵێك پێوەندیی شاراوەوە پێی بزانیٚ. پێکەوە لکان یان تێکەڵاویی ئیماژەکان کە وەك خەون وان، ئەم تاو و تەئسیرە بەرهەم دێنێت. ئەوەی راستی بێت مارلۆ کە وەگێڕی چیرۆکی خۆیەتی، گێڕانەوەکەی رادەگریٚ تا لەم بارەیەوە رابمێنیٚ و بیر بکاتەوە، و پاشان دەبێژیٚ:

***ئەوە وەکوو ئەوە وایە هەوڵ دەدەم خەونێکتان بۆ بگێڕمەوە، هەوڵێکی لە خۆڕاییی‌یە، چونکی قەت گێڕانەوەی خەونێك ناتوانیٚ جێگای بینینی ئەو خەونە بگرێتەوە، خەون، ئەو ئاوێتەیە لە بیٚمانایی و سەرسووڕمان و سەر لێشێواوی لەنێو لەرز و تای هەڵچوونێکی پڕ شەڕ و شۆڕدا، ئەو وێنایە لە داماوی لە نێو سەرسووڕماندا کە سریشت و جەوهەری خەونە....***[٦٩]

بە پێی روونکردنەوەکانی فرۆید لەمەڕ خەون، "جێگۆڕکیٚ" دەتوانیٚ شانبەشانی "تێکەڵکاری" ئەرکی خۆی بەڕێوە بەرێت. جێگۆڕکێش مانای شاراوە یان چێندراو لە ژێر توێژی سەرەوە یان دیاری گێڕانەوەی خەون ئاشکرا

69- Joseph Conrad, Heart of Darkness (Harmondsowrth, Penguin, 1983) p.57. originally published in 1899.

دەکات. لە جێگۆڕکێدا وێنە یان واتایەك دەگۆڕێت و دەبێتە ئیماژێکی بە ڕوالّەت ناپێوەندیدار و هەلی خۆیا بوونی پاژێکی راڤە هەلّنەگر یان چەپێندراو و سەرکوتکراوی دیکە بە چەشنێکی گۆڕان بەسەردا هاتوو دەردەخسێنێ. بە وتەیەکی تر، دەکرێ وەك نوێنەر و نیشاندەری لایەنەکانی ناخودئاگای زەینی ئەو کەسەی کە خەون دەبینێ بێنینە ئەژمار، هەلّبەت بە چەشنێکی ناڕاستەوخۆ و چاوەدێریکراو. دەکرێ لەسەر دەستی ئەم چەمکانە دەقەیلی ئەدەبی بخوێنینەوە. لە "مەسخ[70]"ی کافکادا، گۆڕانی "گریگۆر سامسا" و بوونی بە جروجانەوەر بە چەند شێوە راڤە دەکرێ کە لە ڕێگای ئەم خوازە سەرەکی و بەربلاّوەوە دەردەبڕدرێ. تێکەلّکاری و جێگۆڕکێ، بە ریز لەگەلّ دوو لایەنی زمانیی خوازە و مەجاز کە یاکوبسن باسیان دەکات، پێوەندییان هەیە. خوازە لە ڕێگای هاوشێوەیی و وێکچوونەوە کاری خۆی دەکات، و مەجاز لە ڕێگای هاوسێیەتی و بە یەکەوە بوونەوە. ئەم تێڕوانینە لەسەر دەقەیلی ئەدەبی وەك جۆرە ڕەمز و دەربڕینی ئەو شتەی گوتارەکانی تر توانایی و بڕشت یان ئیمکان و ئەگەری دەربڕینی ئەو شتەیان نییە، لە تیۆری و ڕەخنەی ئەدەبیدا گەلێ کاریگەر و شوێندانەر بووە. هەروەتر لە ڕێگاکانی ترەوە، ئەو هەلّوێست و جێگە و پێگە بەرزەی کە ئەدەبیات خاوەنێتی یان خۆی دەلێ خاوەنێتی، بەرزتر و بەهێزتر دەکات. دەروونشیکاری شێوەیەکی گەلێ بەتاو و تەئسیری زانستە کە بۆی هەیە لە «ڕوونکردنەوە»ی دەقی ئەدەبیدا بە کار ببرێ و لە ڕاستیدا دەبێتە هۆی ئەوەی کە خوێنەر ببێتە دەروونشیکار، و دەق ببێتە بابەتی دەروونشیکاری یان ئەو نەخۆشەی کە لێکۆلّینەوەی دەروونشیکارانەی لەسەر دەکرێ، و بەم چەشنە گوتاری دەروونشیکاری بەسەر گوتاری ئەدەبیدا

70- Metamorphosis.



زالّ دەکات و شان و شوێنێکی بالاّتر بە خوێنەر دەبەخشێ. بەم حالّەشەوە، ڕاستی و دروستی ئەم پێوەندییە گومان هەلّدەگرێ و بۆی هەیە بگۆڕدرێت، و ئەم شتەش دەمانگەڕێنێتەوە بۆ سەر ئەرك و دەوری خوێنەر.

وەك بینیمان، لە تیۆریی ئەدەبیدا کردەی خوێندنەوە جێگە و پێگەیەکی گەلێ گرینگی وەدەسهێناوە، و ئەگەر شان و شوێنی خوێنەر وەك شان و شوێنی دەروونشیکار بزانین، لەم حالّەدا ئەو مەترسییەی کە دەشێ پێی بزانین و ئاگادری بین، لە بابەتێکدایە کە فرۆید پێی دەلێ «گواستنەوە[71]» و «دژی گواستنەوە[72]». مەبەستی فرۆید لە گواستنەوە، قایل بوونی ناخودئاگایانەی کۆمەلّێك سیفەت، جا باش یان خراپ، بۆ کەسانە، و ئەوەی کە ئاگادار بوونی کەسی گۆڕین لەو گواستنەوەیە بۆی هەیە ببێتە هۆی سەرهەلّدانی دژکردەوە یان دژی گواستنەوە. لە پێوەندیی نێوان نەخۆش و دەروونشیکاریشدا دیسان گواستنەوە و دژی گواستنەوە دێتە ئاراوە و هەر بۆیە دەروونشیکاری پتر وەك پرۆسەیەکی دوو لایەنە یان دیالێکتیکی لە قەلّەم دەدرێت کە تێیدا، تەنیا دەروونی نەخۆش شی ناکرێتەوە، بەلّکوو دەروونشیکاریش لە ڕێگای پێوەندییەکەوە کە پێویستی بە پشت ئەستوورییەکی فراوان بە نەخۆشە، ناڕاستەوخۆ دەروونی شی دەکرێتەوە. ئەم ڕاستییە سەلمێندراوە کە ئەو نەخۆشەی کاری دەروونشیکاری لەسەر دەکرێت، لەوانەیە بە تایبەتی کۆمەلّێك خەون و خولیا بۆ دەروونشیکار بەرهەم بێنێ کە ناچارەکی ببێتە هۆی ئەوەی مەیل و خواستەکانی کەسی دەروونشیکار لە زمان نەخۆشەوە دەربڕدرێ. بە هەمان شێوە، کردەی خوێندنەوەش دەشێ وەك پرۆسەیەکی دوو لایەنە یان

71- transference.
72- counter transference.

دامەزراو لەسەر بنەمای دیالۆگ چاوی لێ بکردرێ کە لە سۆنگەیەوە هەم دەق، هەمیش خوێنەر دەخوێندرێتەوە. کە واتە مانا تەنیا لە دەق یان خوێنەر سەر هەڵنادەن، بەڵکوو بەرهەمی کارلێك و هاوکاری ئەو دوو لایەنەیە. بە وتەیەکی تر، دوو لایەنی ئەم پێوەندییە تەواو پشت ئەستوورن بە یەکتر. پێویستە کەڵك وەرگرتن لە خواست و دەسەڵات، و هەوڵدان بۆ وەدەسهێنانیان کە هەم لە دەقەیلی ئەدەبی، هەمیش لە پرۆسەی خوێندنەوەیاندا دەردەکەوێ، لەبەرچاو بگرین. بە تەعبیرێکی تر، خوێندنەوە ئاشکرا کردنی زاتی ئاگا و ناخودئاگای ئێمە و دەقیشە. ناسینەوەی شێوەکانی خۆڕاگری و دۆزینەوەی ئەو شوێنانەی کە ئەم خۆڕاگرییانە بۆیان هەیە لایەنێکی تری ئەم تاو و تەئسیرەی نێوان دەروونشیکاری و ئەدەبیات، لە بەر چاو گرتنی مافی ئەدەبیات بۆ شەنوکەو کردنی دەروونشیکارییە. دەروونشیکاری و ئەدەبیاتیش وەك شێوەکانی تری مەعریفە، کۆمەڵێك سیستمی زمانی یان گوتارگەلێکن کە خاوەن پێکهاتەی گێڕانەوەیی و بەلاغی (ڕەوانبێژی) خۆیانن. ئەدەبیات و دەروونشیکاری کۆمەڵێك جیاوازی بەرچاویان هەیە و هەر بۆیە پێوەندیی نێوانیان و جۆری ئەو دەسەڵاتانەی وەگەڕی دەخەن جۆراوجۆرە، و پێگەی ئێمە وەك خوێنەر یان سووژەی تاك، تێکەڵاوێك لەوان و پێوەندییە هەمە چەشنەکانێتی کە ئیمکان و ئەگەری گۆڕان و پێناسە کردنەوەیان لە ئارادایە، یان دەشێ ببێ. خوێندنەوە فۆرم و شێوەیەکی گرینگی «پێناسە کردنی خود»ە و کارلێك و دانوستانی گوتارەیلی ئەدەبی و دەروونشیکارانە لە دەستی دێت بۆ تێگەیشتن لەم پرۆسەیە یارمەتیدەر بێت.

پێناسەی فرۆید بۆ "چێژ" وەك هانە و ئەنگیزەیەکی گرینگ لە هەڵسوکەوتی مرۆڤدا، وێڕای چەمکی "مەیل"، لە تیۆری ئەدەبیی زمانی و



تیۆریی دەروونشیکارانەدا تەشەنەی کردووە و پەرەی سەندووە. ئەم تیۆرییانە بە پێچوپەناتر لەوەن کە بکرێ لێرە بە تێروتەسەلی باسیان بکەین، بەڵام وەك پێشەکی، گەر بێت و ئاماژەیەك بە مانا و کاربردیان بکەین بەکەڵکن. فرۆید چێژ یان "ئەسڵی چێژ"[73] بۆ گەشەی مرۆڤ بە ئەسڵێکی هەرە گرینگ دەهێنایە ئەژمار. مەیل بۆ دامرکاندنی چێژی جەستەیی یان جنسی و پاشان کۆنتڕۆڵ یان سەرکوت کردنی ئەم مەیلانەی ئەو قۆناغەی منداڵ بە "ئەسڵی هەقیقەت"[74] دەزانێ، کە لە بیچم گرتنی دەروونی مرۆڤ لە چوارچێوەی مۆدێلی "ناخود/ خود/ کەڵەخود»دا خاوەنی گرینگایەتییە، ئەو مۆدێلەی کە لە سۆنگەیەوە هاندەرە غەریزی و زاتییەکان تا رادەیەکی زۆر بە درێژایی پرۆسەی بە کۆمەڵایەتی بوون چاوەدێری و کۆنتڕۆڵ دەکرێن. ناسینی جنسییەتیش کە لە سۆنگەیەوە کوڕ بە بوونی "زەکەر"ی خۆی دەزانێ و کچ بە نەبوونیی، هەر پێوەندی بەم مۆدێلەوە هەیە. تیۆرییەکانی فرۆید دەربارەی جنسییەت، دیارە کلیشەسازیی پیاوانە و ژنانەی بەهێز کردووە و بەتایبەتی لە لایەن تیۆریستانی فێمینیستەوە رەخنەی لێ گیراوە، هەڵبەت وەك چۆن دواتر باسی دەکەین، تیۆریی فێمینستی هەروەتر سنوورەکانی بیرۆکەگەلی فرۆیدی بەربلاوتر کردۆتەوە. فرۆید گرێی ئۆدیپ، کە لەودا مەیلی جنسی کوڕ بۆ دایکی، لەبەر ترسی یەختە بوون بە دەستی باوکی، سەرکوت دەکرێ، وەك کلیلی دەرگای چوونە ژوورەوەی کوڕ بۆ نێو جیهانی گەورە بوون و بالَق بوونی واقیع دێنێتە ئەژمار. لەم قۆناغەدا، کوڕ بە جنسییەتی خۆی پەی دەبات و لەگەڵ ئەو کۆمەڵە ئەرکە پیاوانەیە ئاشنا دەبێت کە ئەو شتەی پێی دەگوترێ سیستمی

73- pleasure principle.
74- reality principle.

PDF 4 KURD

پیاوسالاری بەهێز دەکات. لە لایەکی ترەوە، کچ دەبێ پێملی پیاو نەبوونی خۆی بێت و مەیل و خواستی دەست تێکەڵ کردن لەگەڵ باوکی سەرکوت بکات و بچەپێنێ. بە باوەڕی فرۆید، خۆدۆزینەوەی کچ لەنێو کەسایەتیی دایکدا و جێنشین کردنی زارۆك لەبری زەکەری پیاو، هاوتا ژنانەکانی ئەزموونی پیاوانەی گرێی ئۆدیپن. هەنووکە لەوانەیە لە لایەنێکەوە گومان لە "راستی و دروستیی" تیۆرییەکانی فرۆید بکرێ: چۆن چۆنی دەکرێ ئەم کۆمەڵە گریمانەیە لە بۆتەی تاقیکاریدا قاڵ بکەینەوە؟ چ شتێك زاتی ناخودئاگامان بۆ دەسەلمێنێ؟ بەڵام لە لایەنەکەی ترەوە، ئەم گریمانانە هەر وەك زمان و گێڕانەوەی باوی نێو کۆمەڵگا، لە راستیدا "دروست" دەنوێنن. ئەم گریمانانە لە بوارە جۆراوجۆرەکانی زەینییەتی گشتی خەڵکدا ریشەی داکوتاوە و ناچارەکی کۆمەڵێك تاو و تەئسیریان بە دوادا دێت. ئەم پرسیارە کە ئایا فرۆید بە بوونی زاتی ناخودئاگای زانیوە یان ئەم شتەی داهێناوە، ئەوەی راستی بێت پرسیارێکی زیادییە: تیۆریی فرۆیدی وەك گوتارێك، ناچارەکی و بۆ هەتا هەتا ئەم راستییە تۆمار دەکات.

دەسەڵات و کاریگەرێتیی زمانی فرۆیدی وەك گوتار، شوێنێکی گونجاوە بۆ باس کردنی یەکێك لە سەرەکیترین گۆڕانکارییەکانی تیۆریگەلی فرۆید. ژاك لاکان (Jacques Lacan) تیۆریدارێژی فەرەنسەیی، زمان بە هۆکاری سەرەکی و بنەڕەتیی بیچم گرتنی شوناسی مرۆڤ لە قەڵەم دەدات: تاك لە سۆنگەی زمانەوە جێگە و پێگەی خۆی وەك سووژە وەدەست دێنێ. زمان کۆمەڵێك جێگە و پێگەی رێژەیی ئاراستە دەکات کە سووژەی ئینسانی یان تاك بەرەو لای پەلکێش دەکرێ. تەسلیم بوون و خۆدانەدەست زمان، بە واتای خۆ دانە دەست دەسەڵاتی پیاوسالارانەشە و لەگەڵ ئەمەدا ئاگاداری لە خود وە



دەست دێت کە لە هەمبەر ئەو دۆخە نادیار و پێش زمانی و ناخودئاگایەدا رادەوەستێ کە منداڵ ئەزموونی دەکات. ئەم بیرۆکەیە، شکڵ و شێوەی پاڵاوتەی ئەو چەمکە بەر باسەی فرۆیدە لەمەڕ گۆڕانکاری لە "ئەسڵی چێژ"ەوە بەرەو "ئەسڵی واقیع". لاکان تیۆریی فرۆید تێکەڵ بە تیۆریی زمانناسانەی سوسور دەکات. تیۆرییەکانی لاکان خۆی سەبارەت بە ناخودئاگا و زمان، پرپێچوپەنا و ئەستەمن و لێرەدا تەنیا دەکرێ باسی پوختەیەکی سەرە بابەتەکانی بکەین. لاکان پێی وایە ئەوە زمانە پێکهاتەی ناخودئاگا بەدی دێنێ، هەڵبەت زمان هەر لە ئاستی "دال"ـ دا، نەك "مەدلوول". لەم رووەوە، ناخودئاگا هەل و دەرەتانی سەربەخۆیانەی زمان دەرەخسێنێ، پێش ئەوەی لە رێگای پرۆسەگەلی خودئاگاوە ببێتە مانا یان مەدلوولگەلێکی دیاریکراو و نەگۆڕ. مۆدێلی بەرباسی لاکان لەمەڕ بیچم گرتنی سووژەی تاك لە تافی منداڵیدا کە بە دوو قۆناغی گرینگ و بنەڕەتیدا تێدەپەڕێ، پێوەندی بەم تێڕوانینەوە هەیە. سەرەتا و لە دەوروبەری شەش مانگەیی منداڵدا، "قۆناغی ئاوێنەیی" دێتە ئاراوە و ئەمە ئەو کاتەیە کە منداڵ پەی بە وێنەی خۆی لە ئاوێنەدا دەبات. لاکان وای لێکدەداتەوە کە ئەم قۆناغە، تایبەتە بۆ ئەو مرۆڤانەی کە شێت و شەیدای وێنەی خۆیان دەبن و بە شتێکی دەزانن کە وەك وێنەی خودێکی یەکانگیر بە دوایدا دەگەڕێن، خودێك کە لە دەرەوە دەبینرێت و شوناسێکی جیاوازی لە نێو دنیای دەوروبەری خۆیدا هەیە. قۆناغی دووهەم کەموزۆر ساڵێك دواتر دەبێتە ئاراوە و ئەو قۆناغەش سەروبەندی چوونی منداڵە بۆ نێو کۆمەڵگا و بە پێچەوانەکەشی دزە کردنی زمانی کۆمەڵگایە بۆ نێو ژیانی منداڵ، لاکان ئەم قۆناغە ناو دەنێ: "نەزمی سەمبۆلیك[٧٥]". ئەم قۆناغە

75- symbolic order.

دۆخی دوو لایەنەی قۆناغی ئاوێنەیی بەهێز دەکات، لەم رووەوە کە منداڵ دەبێ زمانێکی دەرەوەی بوونی خۆی وەربگرێ، و ئیماژ و وێنەی ئەو بە کەڵك وەرگرتن لە زمانێك کە لە دەرەوەی بوونی ئەو دایە، وەدەست دێت. لە رێگای بەکار هێنانی وشەیلێکی لە چەشنی "من"، "بۆ من" یان "خۆم"، بە مەبەستی بەدیهێنانی هەستی شوناسی تاکەکەسی کەڵك لە زمانی کۆمەڵگا وەردەگیرێت. خاڵی شایانی سەرنج پێدان لێرەدا ئەوەیە کە زمان وەك سیستمێکی چاوەدێریکەر و کۆنترۆڵکەر کار دەکات کە لە هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتیی ئاساییدا ناتوانرێ خۆڕاگری لە بەرامبەریدا بکرێت. زۆربەی هەرە زۆری گوتارەیلی ریشە داکوتاو ئەو رێگا و رەوشتانە بەهێز دەکەن کە دەبنە لەمپەڕ لە سەر رێگای کایەی ئازادانە یان دابەزینی مانا یان شوناس. ئەو کاتەی ئاماژەم بە منداڵ کرد، بە ئەنقەست راناوی (it)ـم بەکار هێنا تا پێتان بڵێم کە منداڵ بوونەوەرێکە خاوەنی جنسییەت نییە، بەڵام وەك پێشتریش باسمان کرد، زمان لە هەمبەر جنسییەتدا نەزۆك و بێلایەن نییە و زۆرتر سەرەتی و دەسەڵات بە جێگە و پێگەی کۆمەڵایەتیی پیاو دەبەخشێ. لاکانیش وەکوو فرۆید لەسەر ئەم باوەڕەیە کە "سیرەت[76]" هێمای سیستمی پیاوسالارە و زمان "سیرەت‌تەوەر[77]"ە، یان لەسەر بنەمای ناوەندی چاوەدێریکەری سیرەتی سەمبۆلیك پێکدێت. بە باوەڕی لاکان، منداڵ لە هەناوی نەزمی سەمبۆلیکەوە شوناسێك وەدەست دێنێت کە یان پیاوانەیە یان ژنانە. شوناسی پیاوانە بە شێوەیەکی ئەرێنی (positive) و وەك نۆرم یان بابەتی باو دەق دەگرێ، لە کاتێکدا شوناسی ژنانە بە شێوەیەکی نەرێنی (negative) و وەك

76- phaluss.
77- phallocentric.



"ئەویتر"،یان بە وتەیەکی تر بە پێداگرتن لەسەر نەبوونی سیرەت و دوا بەدوای ئەو لە روانگەی نەرێنییەوە خۆی جیا دەکاتەوە.

دەلالەت و کاربردەکانی ئەم تێڕوانینە بۆ ئەدەبیات و رەخنەی ئەدەبی لەوەدایە کە دەروون و شوناسی مرۆڤ لە روانگەی پێکهاتەی زمانییەوە، ئەوەی راستی بێت لە لایەنی دەقییەوە لێیان دەکۆڵدرێتەوە. بە دڵنیاییەوە دەکرێ بڵێین تێڕوانینی ئالتوسێر لەمەڕ سووژەی تاك کە کۆمەڵێك پرۆسەی ئایدۆلۆژیکیی ناڕاستەوخۆ و وەهمی ئەم سووژەیە دیاری دەکەن و شوێن و پێگەی پێ دەبەخشن،سەرەڕای ئەوەی دەسکەوتی تیۆرییەکی جیاوازە، بەڵام لە پێکەوەرانانی لە هەمبەر تێڕوانینی لاکان لە فرۆیدی وەرگرتووە و بە پێی ئەم تیۆرییە تاك دوای تێکەڵاویی و توانەوەی لەنێو کۆمەڵگادا دەکەوێتە ژێر دەسەڵات، هەندێ لایەنی هاوبەشیان تێدا بەدی دەکرێ. دەتوانین بڵێین دەقەیلی ئەدەبی لەسەر ئەم پرۆسانە شوێن دادەنێن یان رەنگدانەوەی ئەم پرۆسانەن: گومانی تێدا نییە لە زۆربەی هەرە زۆری رۆمانەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا ئەرك و کارکردی کەسایەتی لەوەدایە کە شوناسێکی شایانی پەسند کردن بە سووژەیلی ئینسانی ببەخشن. دیسان "ئاواتە مەزنەکان" {ی چارلز دیکێنز} نموونەیەکی پڕ بەپێستە،لەم رووەوە کە "پیپ" فێری ئەو زمانە ئەخلاقییە دەبێت کە دەتوانێ خۆی لەگەڵ پرۆسە ئابوورییەکانی کۆمەڵگادا بگونجێنێ. بەم چەشنە، سووژەی تاك بەرهەمی گوتارە، بە وتەیەکی تر، سووژە بە ئاوایەکی زمانی بەرهەم دێت و جێگە و پێگەیەکی دیاریکراو دەدۆزێتەوە. هەڵبەت هەندێ دەقیش هەن کە گومان لەم شوناسە پێکهاتووە تاکەکەسییە دەکەن، یان ئەم شوناسە دەشێوێنن. "دەنگی ناخۆشی ناقووس[78]" (١٩٦٣) بەرهەمی

78- The bell Jar.

PDF 4 KURD

"سیلڤیا پلات"[٧٩] نموونەیەکی باشی ئەو شێوازانەیە کە تێیدا سووژەی ژن، واتە ئیستێر (Esther)، بەردەوام لە ژێر ئەو گوشار و زەبر و زەنگانەدایە کە تا رادە و رێژەیەکی زۆر لە رێگای زمانەوە وەکار دەکەون تا ئەو سووژەیە بە شێوەیەکی تایبەت هەڵسوکەوت بکات و بە پێی جنسییەت و پێگە چینایەتییەکەی شوناسێکی تایبەت وەخۆ بگرێ. خۆڕاگری و تاقەتهێنانی ئەو لە هەمبەر ئەم کێشەیە بە نەخۆشیی دەروونی دێننە ئەژمار، واتە ئەوانەی خاوەن دەسەڵاتن ئەم شێوەیە حاشا کردنە لە بابەتە باو و نۆرمەکانی کۆمەڵایەتی، وەك رەفتار و هەڵسوکەوتێکی لادەرانە و ناسروشتی لە قەڵەم دەدەن.

تیۆریی دەروونشیکاری بۆی هەیە سنوورەکانی تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەی کەسایەتی ببەزێنێ و هەندێ شێوازی کامڵتر بۆ خوێندنەوەی سەرلەبەری دەقەکان و تێگەیشتن لە پێکهاتەی فۆرمی ئەوان پێشنیار بکات. دەقی ئەدەبی دەکرێ وەك جۆرێك مۆدێلی دەروون چاوی لێبکرێ کە هەندێ سیستمی چاوەدێریکەری تایبەتی تێدایە، بە کۆمەڵێك توێژی ئاگایی یان مانایی جیاوازەوە. ئەدەبیات بۆی هەیە وەك چەشنێك "کەڵەخود"، یان بە شێوە دەربڕینێکی خواست و مەیل و ویستە چەپێندراو و سەرکوتکراوەکانی زاتی ناخودئاگای بزانین. هەندێ دەق، بەتایبەت ئەوانەی بە دەقی مۆدێرنیستی لە قەڵەم دەدرێن، بۆیان هەیە سەربەخۆیانەتر بخوێندرێنەوە و پێویست ناکات لە تاقە سیستمێکی مانایی نەگۆڕدا بمێننەوە. داڵەکانی دەق، بەتایبەت ئەگەر

٧٩- سیلڤیا پلات (١٩٦٣-١٩٣٢) ژنەشاعیری ئەمریکایی کە لە جیهانی شێعریی خۆیدا پیشاندەری کۆمەڵێك ئیماژی ئاڵۆزی ئەو ژنەیە کە لەسەر وێران کردنی خودی مرۆڤانە کار دەکات.



دەقێك خاوەنی گوتارێکی گێڕانەوەییی چاوەدێریکەری ناوەندی نەبێت، دەکرێ وەك خەون ببنە هۆی کایە و گەمەی سەربەستانەی مانا. مەسخ (دۆنادۆن)ی کافکا بە تاقە یەك شێواز یان بە شێوەیەکی باو راڤە ناکرێ. ئەوەی راستی بێت وێدەچێ لەم بەرهەمەدا، مانا بێبڕانەوە و بەردەوام دوا دەکەوێ: هیچ چەشنە شیکردنەوەیەکی پڕ بەپێست و قەناعەتپێهێنەر بۆ گۆڕان و مەسخی گریگۆر سامسا و بوونی بە جڕوجانەوەر، و رووداوەکانی دواتری داستانەکە لە ئارادا نییە. لە راستیدا، دەکرێ ئەم دەقە وەك مەرگخوازیی زاتی ناخودئاگا لێکی بدەینەوە. فرۆید لە کتێبی "ئەودیوی سنووری ئەسڵی چێژ"[٨٠]دا (١٩٢٠) ئەم تێڕوانینەی خۆی کە دەیگوت هانە و دنەدەری سەرەکیی هەڵسوکەوتی مرۆڤ مەیلی جنسییە، هێور و سازگار کردەوە. فرۆید لەم کتێبەیدا "مەرگخوازی"[٨١] یان ئاوات و ئارەزوو بۆ مەرگ بە دوا مەیلی مرۆڤ دەزانێ، چونکی لەم دۆخە کۆتاییەی نەبووندا، هەرچی کێشە و ململانێی نێو دەروونی مرۆڤە کۆتاییان پێدێت. خۆشحاڵیی گریگۆر، هاوکات لەگەڵ نیزیکتر بوونەوەی لە مەرگ، وێدەچێ پتر دەبێ، و لە دوابەشی دەقەکە و لە نەبوونی ئەودا، جۆرە هەستێکی بەختەوەری و خۆشی بەدی دەکرێ کە لە سۆنگەیەوە دوایین دواکەوتنی مانا یان کۆتاییی چیرۆکەکە بەرهەم دێت.

بێگومان دەقەیلی ئەدەبی بۆیان هەیە لە دیدگای شێوازی گێڕانەوە، و دڕاشتنی کەسایەتی، و دیاریکردنی پێگەی کەسایەتی و رێکوپێك کردنی ئەو گوتارە جۆراوجۆرانەی کە زۆر جار بە دەستەوەی دەدەن، بە کۆمەڵێك سیستمی چاوەدێریکەر و کۆنترۆڵکەر لە قەڵەمیان بدەین. بە پەراوێز کردن یان کپ کردنی

80- Beyond the pleasure principle
81- thanatos

PDF 4 KURD

هەندێ دەنگی تایبەت (بۆ وێنە لە رۆمانی "جین ئایر" (١٨٤٧)دا سەبارەت بە ژنی یەکەمی رۆچستێر (Rochester) کە بە "شێت"ی دەزانـن، ئـەم قـسەیە وەڕاست دەگەڕێ، یان لە رۆمانی "سەردەمانی تفتوتاڵ[٨٢]" بەرهەمی دیکێنزدا وێنـا کردنـی سیاسـەتی خەباتخوازانـە و کرێکـاری لـە سەروسـیمای سـەیر و سەمەرەی "سلاك بریج[٨٣]"دا، هەمان خـاڵ دەپێکـێ) بـە ئاشـکرایی نیـشانمان دەدات کـە دەقـی ئـەدەبی چـۆن بیـچم دەگـرن و چـۆنچـۆنی ئـەو گوتـارە مێژوویییانەی کە بە کاری دێنن، رێکوپێك دەکەن یان هەڵیدەسەنگێنن.

82- hard Times
83- Slackbridge

تا ئێستا باسی زنجیرەیەك تێڕوانینی تیۆریکمان سەبارەت بە دەق و رەخنەی ئەدەبی کردووە. هەندێ لەم تێڕوانینانە لە چاو ئەو تێڕوانینە نەریتییانەی کە زۆر کەم تیۆریزە کراون، شێوازگەلێکی زۆر جیاواز و جۆراوجۆر بۆ خوێندنەوە و تۆژینەوەی ئەدەبیات بە دەستەوە دەدەن. ناشێ چاوەڕێ بین کە تیۆریی ئەدەبی بریتی بێت لە کۆمەڵەیەکی یەکانگیری مەعریفە و زانیاری. ئەم چاوەڕوانییە بە مانای هەوڵدانە بۆ یەکخستن و یەکپارچە کردن و هارمۆنیزە کردنی ئەو جیاوازییە جۆراوجۆرانەی کە تێڕوانینە تیۆریکەکان وەك بەردی بناغەی سەرلەبەری داب و دەستووری ئەدەبیات و تۆژینەوەی ئەدەبی ئاشکرایان دەکەن و نیشانیان دەدەن. بەو حاڵەشەوە، ناشێ تیۆری وەك کۆمەڵێك تێڕوانینی جیا لەیەك یان دژ بە یەك چاو لێبکەین. وەك بینیمان، سەرچاوەی هاوبەشی تێڕوانینە جۆراوجۆرەکانی رەخنەی ئەدەبی و تیۆریی زمانناسانە، بەتایبەت تیۆریی سوسورە سەبارەت بە نیشانە (sign)، و وێدەچێ بۆچوونە جۆراوجۆرەکانی سەبارەت بە تاك و کۆمەڵگا کە لە تیۆرییەکانی فرۆید و مارکسەوە وەرگیراون کۆمەڵێك تایبەتمەندیی هاوبەشیان هەبێت. لایەنی هاوبەشی تری ئەم تیۆرییانە دەربڕینی ئەم راستییەیە کە دەق تاقە یەك مانای نییە، بە وتەیەکی تر، پێویست ناکات تەنیا یەك شێوە خوێندنەوەی پەسند کراو و باو لە ئارادا بێت. دەق بە پێی ئەو دۆخ و زەمینەیەی کە تێیدا دەخوێندرێتەوە یان کەڵکی لێوەر دەگیرێ، کۆمەڵێك مانای جۆراوجۆ هەڵدەگرێ. دەقی شانۆیی "هەملێت" دەقێکە کە بەردەوام راڤەی تازەی لێ بە دەستەوە دەدرێ: ماناکانی هەملێت سنووریان بۆ دیاری ناکرێ، چونکی ئەو زەمینە و کەشوهەوایەی کە ئەم دەقەی تێدا دەخوێندرێتەوە، یان نمایش دەدرێ، یان وتاری رەخنەگرانەی لەسەر دەنووسرێ بەردەوام لە گۆڕاندایە. لەم رووەوە، فراوانیی مانا و راڤە جۆراوجۆرە بەردەستەکان دەبێ دەستەبەرکەری بەردەوامیی تۆژینەوە و رەخنەی



ئەدەبی بن، نەك لە بەر ئەم هۆیە کە دەقەیلی ئەدەبی هەڵگری کۆمەڵێك هەقیقەتی هەتا هەتایی و جیهانشموولن، بەڵکوو لەبەر ئەوەی کە سەرنجی ئێمە بۆ لای سریشتی بگۆڕی مانا و ئەو بارودۆخەی کە دەبنە هۆی بەرهەمهاتنی ئەم مانایانە، رادەکێشن. مادام پێمان وابێ مێژوو و پرۆسە کۆمەڵایەتییەکان بەردەوام لە بەردەم گۆڕانکاری و بە جیاواز بووندان، راڤەی ئەدەبی سەرقاڵی ئەم پرۆسانە دەبێت و خۆیشی دەبێتە بابەتێکی مشتومڕ هەڵگر و بگۆڕ: پێشتر باسی گرینگایەتیی بەرهەمی ئەدەبیمان وەك دەق هێنایە ئاراوە. ئەم تێڕوانینە بۆ دەق لە چاو هەندێ شێوازگەلی رەخنەی ئەدەبیی نەریتی پتر سەرنجمان بۆلای زمان و پێکهاتە و هەروەتر دەوری خوێنەر وەك هۆکارێکی چالاك و هەڵسووڕی پرۆسەی خوێندنەوە رادەکێشێ. لە دوابەشی ئەم کتێبەدا دەخوازم باسی هەندێ لە تیۆرییەکانی دەقێتی (texuality) بێنمە گۆڕێ و پاشان لە هەندێ شێواز بکۆڵمەوە کە تێیاندا، دەق لە کۆمەڵێك تۆڕی بەربڵاوتری راڤەدا جێگیر دەبن.

## تیۆرییەکانی دەقێتی

پێشتر باسی چەمکی دەقی ئەدەبی لە وتارەکانی "مەرگی نووسەر" و "لە بەرهەمەوە بۆ دەق"ی رۆلان بارت هاتە گۆڕێ. بیر و بۆچوونەکانی بارت بەشێکن لە پێناسەی سەر لەنوێ و بەربڵاوتری چەمکی ئەدەبی، هەڵبەت ئەم تێڕوانینانە پتر پێوەندییان بەو شتەوە هەیە کە پێی دەڵێن "نووسراوەی ئەدەبی". لە نیشانەناسی، کە بریتییە لە تۆژینەوەی نیشانەکان و هەڵکڕاندنی مانا لێیان، یان لە زماننناسیدا، دەق پێکهاتووە لە کۆمەڵێك نیشانە کە پەیامێك بەدیدێنن، پەیامێك کە "بوونێکی" سەربەخۆی هەیە و خۆی لە نووسەر یان بنێر و خوێنەر یان وەرگر جیا کردۆتەوە. مەبەستمان لە "بوون" لایەنی بەرهەستی دەقە. وەك پێشتر لە کاتی ئاماژە کردن بە خاڵە لاوازەکانی روانگەیلی فۆرمالیستیدا بینیمان، هیچ دەلیل و

PDF 4 KURD

هۆیەك لە ئارادا نییە کە دەق مانای خۆی جیا لە خوێندنەوە یان تێگەیشتنی خوێنەر بە دەستەوە بدات. بارت پێی وایە دەقی ئەدەبی لە کۆمەڵێك "نووسراوەی فراوان" پێکهاتووە کە لە سەرچاوەگەلی جۆراوجۆرەوە وەدەست دێن و بوونیان لەسەر بنەمای "ناکۆکی و دەمەقرە" دامەزراوە و ناگۆڕدرێنە سەر گشتێکی یەکدەست و یەکانگیر. روانگەی بارت لەو بۆچوونەی کە باوەڕی بە ئۆرگانیك بوونی شوێنەواری ئەدەبی هەیە، زۆر دوور دەکەوێتەوە و هەڵگری ئەم دەلالەتەیە کە دەق یەکەیەکی پڕ لە ناکۆکی و ناتەباییی کۆمەڵێك رەگەزی جۆراوجۆرە کە بە شێوەگەلی جۆراوجۆر و لەوانەشە پێشبینی هەڵنەگر کار دەکەنە سەر یەکتر و شوێن لەسەر یەك دادەنێن. بارت لە کتێبی (1970) S/Zدا، دەقی ئەدەبی بە سەر دوو دەستەدا دابەش دەکا: "دەقی خوێنەرانە[1]" و "دەقی نووسەرانە[2]".

دەقی خوێنەرانە دەقێکە کە خوێنەر وەك بەرخۆرێکی نەزۆك حسێب دەکات و خاوەنی ئەو شتەیە کە بارت ناوی دەنێ "بەهای نەرێنی و پەرچەکردار هەڵگر[3]": «ئەو شتەی دەتوانرێ بخوێندرێتەوە، بەڵام ناتوانرێ بنووسرێت.» دەقێکی لەم چەشنە کە ئەو بە "دەقی کلاسیك" ناوی دەزرێنێ، خوێنەر دەخاتە نێو دۆخێکی دەستەوەستاوی و خەسیوانەوە. لە بەرامبەردا، دەقی نووسەرانە، «ئیتر خوێنەر ناکاتە بەرخۆر، بەڵکوو دەیکاتە بەرهەمهێنەر و خوڵقێنەری دەق». بە وتەیەکی تر، خوێنەر دەبێتە خوێنەرێکی هەڵسووڕ و ئەوەی راستی بێت دەبێتە نووسەری دەقیش. ئومبێرتۆ ئیکۆ (Umberto Eco) تیۆریدارێژی ئیتالیایی پۆلێن کردنێکی هاوشێوەی ئەم چەشنەی هەیە و دەق بەسەر دوو دەستەی "کراوە" و "داخراو"دا دابەش دەکات. دەستەواژەی دووهەم پیشاندەری دەقێکە کە تێیدا

1- readerly text.
2- Writerly text.
3- negative, reactive value.



ئەزموونی خوێندنەوە ئەزموونێکی بەرتەسك و سنووردارە، لە کاتێکدا دەقی کراوە، دەرەتانی کۆمەڵێك راڤەی جۆراوجۆر دەڕەخسێنێ. بارت هەروەتر پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە دەق "فرە لایەنە" (plural)، واتە ناکرێ دەق کورت بێتەوە بۆ سەر تاقە یەك مانا. دەق قابیلی کورت کردنەوە نییە. لێرەدا بارت هیچ جیاوازییەك لەنێوان "دەقی نووسەرانە" و "دەقی خوێنەرانە"دا قایل نابێت. لە راستیدا، بارت لە نووسراوەیەکی خۆیدا بۆ ئەم باسەی نموونە دێنێتەوە: ئەو لە کتێبی S/Zدا لە کورتە چیرۆکی "سارازین" (Sarrasine)ـی بالزاك دەکۆڵێتەوە، کە نموونەی دەقێکی کلاسیك یان خوێنەرانەیە. بەڵام خوێندنەوەی بارت بۆ ئەم چیرۆکە هێندە بە پیت و پێزە کە تەنانەت دەقێکی لەم دەستە، کە وێدەچی هەڵگری خوێندنەوەی فرە لایەن یان سەربەست نەبێت، کۆمەڵێك مانای پڕپێچوپەنا و فرە رەهەند بە دەستەوە دەدات. بارت دەق هەم لە لایەن پێکهاتە دەروونییەکان و هەمیش چۆنێتیی تێکەڵاو بوونی لەگەڵ پێکهاتە دەرەوەییەکان کە تێیاندا هەڵکەوتووە، بە "تۆڕ" (network) لە قەڵەم دەدات. بارت هاوئاراستە لەگەڵ تیۆریی رێژەییی ئەنشتێین (Einstein)، مۆدێلێك بۆ راڤە پێشکەش دەکات، تا «رێژەی پێوەرەکانی هەڵسەنگاندنی ناوەرۆکی بابەتی بەرباس و تۆژینەوەش لە خۆ بگرێ.» هەنووکە تێدەگەین کە ئەو بارودۆخەی کە دەق بە سەرنجدان بەو دەخوێندرێتەوە، ماناکانی ئەو دەقە دەسنیشان دەکات. بارت ئەو کاتەی باسی پێکهاتەی دەق دەکات، بەردەوام خوازەیلێکی لە چەشنی «چنین»، «تەون»، «تانوپۆ»، «هەودا» و «پێوەندیی تۆکمە» بەکار دێنێ. ئەو حاشا لەو تێڕوانینە نەریتییە دەکات کە دەق بە «چارشێو»ێك دەزانێ کە لە پشتەوەی مانایەکی تایبەت و دیاریکراو خۆی حەشار داوە و چاوەڕێیە بدۆزرێتەوە. بارت پێی وایە دەق رووبەرێکە کە خوێنەر بۆی هەیە لەو ئاراستە جۆراوجۆرانەی کە دەق رێگای پێدەدا، تێیدا بگەڕێت. لەسەر دەستی ئەم روانگەیە، بارت ئەو باوەڕە وەلا دەنێ کە دەق بە

PDF 4 KURD

خاوەن «ڕازێکی غایەتمەند و مانای دوایین» دەزانێ. مۆدێلی نەریتیی «قووڵایی بین» کە دەشێ بە پێی مانا بدۆزرێتەوە، جێ بۆ مودێلی «ڕووبەر بین» چۆڵ دەکات: «نابێ لە فەزای نووسراوەدا کون و کەلەبەر بپشکنین، بەڵکوو دەبێ تێیدا بگەڕێین.» بارت ئەم شێوە بۆچوونە بە گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی دەزانێ، چونکی «چالاکییەکی دژی غایەتخوازی»یە. بە وتەیەکی تر، ئەم ستراتیژییە راڤەییانە، مانایەکی نەگۆڕ بۆ دەق قایل نابن و هەر بۆیە سەربەستی بە دەق دەبەخشن. هەڵبەت وەك چۆن بارت دەیسەلمێنێ، ئەم چەشنە خوێندنەوانە پابەندی دەق و تانوپۆ یان پێکهاتەیەکە کە دەق تێیدا دەخوێندرێتەوە. بارت و تیۆریداڕێژانێکی تر سەبارەت بەم پرۆسەیە تیۆرییان داڕشتووە و دەستەواژەیەك کە بەردەوام بۆ ئەم پرۆسەیە بە کار دەبرێ دەستەواژەی «نێوان دەقێتی[4]»یە.

## نێوان دەقێتی

باسی چەمکی نێوان دەقێتی، لە ئاخر و ئۆخری دەیەی ١٩٦٠ لە فەرەنسە هاتە ئاراوە و وەکوو شێوازێك بۆ لێکۆڵینەوە لە چۆنییێتی پێکهاتنی دەقی ئەدەبی و دۆزینەوەی مانا، بە چەشنێکی بەرچاو و جار لەگەڵ جار زیاتر کاریگەر و شوێندانەر بووە. تێڕوانینی بارت بۆ دەق وەك «تۆڕ»، تا رادەیەك یارمەتیمان دەدات مانای ئەم دەستەواژەیە روون بکەینەوە. لە باسوخواسەیلی پێشوومان‌دا زانیمان کە نووسەر چیتر تەوەری پێکهاتەی دەق یان مانا نییە، بەڵکوو لە پرۆسەی راڤەدا دەکەوێتە پەراوێزەوە. ئەوەی راستی بێت،دەق پێکهاتوو لە کۆمەڵێك نووسراوە و هەڵێنجراو لە کۆمەڵێك گوتاری جۆراوجۆرە کە بە شێوەیەکی تایبەت لەگەڕدا بوونە. هەر چۆنێك بێت، نووسەر بەدیهێنەری مەزن و هەڵکەوتەیەکی خولقێنەر نییە، بەڵکوو کەسێکی ئاوێتەکارە: ئەو کەسەی کە کەرەسە و ماکە خاوەکانی زمان کۆ دەکاتەوە و ئاوێتەیان دەکات. لەم گۆشەنیگایەوە، ئەدەبیات تا

4- Intertextuality.



رادەیەك دەبێتە جۆرە دووپات بوونەوەیەك. نموونەی ئەم دووپات بوونەوەیە لە هەندێ گێڕانەوەدا دەبیندرێ، بەتایبەت ئەوانەی پێیان دەڵێین ئوستوورە کەلە دوو تویی کۆمەڵێك شکڵ و شێوەی گۆڕاودا دووپات دەبنەوە. چیرۆکی ئۆدیپ سەلمێنەری ئەم راستییەیە، چونکی شێوە جۆراوجۆرەکانی ئەم چیرۆکە لە مێژووی ئەدەبیاتدا هێشتاش هەر دووپات دەبێتەوە. بەکار هێنانی بەردەوام و پەیتا پەیتای «جامی مەسیح» یان ناوەرۆك و بابەتی دووپاتبۆوەی «خواست» لە نێو دەقی ئەفسانەیلی شوالیەگەری (جەنگاوەری) و ئارتۆریدا لە مالۆری (Malory) یەوە تا تی. ئێچ. وایت (T.H.White) و جۆرەکانی تری لە گێڕانەوەکانی تردا وەك «کانزاکانی سلێمان پاشا[5]» (١٨٨٦) بەرهەمی رایدر هاگارد (Rider Haggard)، «دڵی تاریکی» بەرهەمی جۆزێف کۆنراد و فیلمی «ئێستاش ئەوە ئاخر زەمان[6]» (١٩٧٩) بەرهەمی فرانسیس فۆرد کاپۆلا (Fransis Ford Cappola)، یان «وێرانە خاك» بەرهەمی تی.ئێس. ئیلیۆت پیشاندەری ئەو شکڵ و شێوانەن کە چیرۆکێك یان ئوستوورەیەکی تایبەت بە چەشنەیلی جۆراوجۆرەوە دووپات دەبنەوە. نموونەگەلی دیارتری ئەم حاڵەتە،سەر لەنوێ نووسینەوەی رۆمانی «جین ئایر» (Jane Eyre)ـە لە کتێبی «ڕێبێکا[7]» (١٩٣٦) بەرهەمی دافنێ دۆموریە (Daphne Du Maurier) و گێڕانەوەی دووبارە و زۆر وشیارانە و خودئاگایانەی ئەو رۆمانە لە گۆشەنیگای یەکەم هاوسەری ئاغای راچستر لە کتێبی «زەریای بەرینی سارگاسۆ[8]» (١٩٦٦) بەرهەمی جین ریس (Jean Rhys). لەم نموونەی دواییدا، دەق خاوەن تایبەتمەندیگەلێکی ئەوتۆیە وەك بلێی پرۆسەی دووپات بوونەوە کە لە چەشنەکانی تری داهێنانی ئەدەبیدا شاراوەترە، ئاشکرا دەکات، وەك

5- King's Solomon's Mines.
6- Apocalypse Now.
7- Rebecca.
8- Wide Sorgasso Sea.

PDF 4 KURD

«ڕۆزێنرکرانتز و گیلدێنستێرن مردوون[٩]» (١٩٦٧) بەرهەمی تام ستۆپارد (Tom Stoppard) کە سەبارەت بە «هەملێت»ـە و هەڵبەت بە شێوەیەکی بەرچاو گۆڕانی بەسەردا هاتووە. «ژنی ئەفسەری فەرەنسەیی[١٠]» (١٩٦٩) بەرهەمی جان فاولز (John Fowles) گەلێ باس و بابەتی لە دەقەیلی مێژوویی و کۆمەڵناسی و ژینناسی و جوگرافی و ئەدەبی وەرگرتووە و هەروەتر هەندێ تەمسیلی ناڕاستەوخۆتری داب و نەریتە داستانییەکانی سەدەکانی نۆزدە و بیست، بە شێوەیەکی وشیارانە و خودئاگا لە گێڕانەوەی ئەم ڕۆمانەدا قاڵ بۆتەوە. ئەم بەرهەمە ئەدەبییانەی سەرەوە بە قەڵەمی جین ریس و تام ستۆپارد و جان فاولز نموونەگەلێکی سەر لەنوێ نووسراوە یان لاسایی کەرەوەی وشیارانەی دەقەیلێکی کۆنترن کە بە گشتی نیشانمان دەدەن گێڕانەوە و گوتارەکان لە دەقەیلی ئەدەبیدا بە قەرز وەردەگیرێن، دەستاو دەستیان پێدەکرێ و سەر لەنوێ بەکار دەبرێنەوە. تامس هاردی (Thomas Hardy)، کە وەك ڕۆماننووسێکی ئەزموونگەرا نایەتە ئەژمار، ئەم پرۆسەیە دەسەلمێنێ:

***ئەو شتانەی نووسراون ون نابن و بێسەر و شوێن ناکەون. هەر شێوازێکی نوێی ڕۆمان، دەشێ بریتی بێت لە شێوازی کۆن لەگەڵ هەندێ تێبینی زیادکراو بەو شێوازە، نەك لەبەر چاو نەگرتن و حاشا کردن لە شێوازی پێشوو. سەبارەت بە دین و گەلێ چشتی تریش ئەم قسەیە وەڕاست دەگەڕێ.[١١]***

هەڵبەت چیرۆکەکانی هاردی لە چەند لایەنەوە زۆر دووپاتبۆوەن و دوایین ڕۆمانیشی بە ناوی "the well-beloved" بۆی هەیە وەك سەلماندنی خودئاگایانە و وشیارانەی سەر لەنوێ نووسینەوەی هاردی لەمەڕ گێڕانەوە

9- Rosencyrantz and Guildensern are Dead.
10- The French lieutenant's woman.
11- Florance Emily Hardy, The life of Thomas Hardy 1840-1928 (London, Macmillian, 1962) p.218.



هاوشێوەکان و هەروەتر مۆدێلی گشتیی دووپاتبوونەوە لە هونەری سەردەمانی جۆراوجۆری مێژوودا، لە قەڵەم بدرێ. ئەو خوازە گونجاوەی کە هاردی لە نووسراوە جۆراوجۆرەکاندا بە کاری دێنێ، «دەسنووسی کۆن[١٢]»ـە، واتە ڕووبەرێك بۆ نووسین، وەك سواڵەتێکی مۆمی کە ئەو شتەی سەرەتا و کۆن لە سەری نووسراوە تا ڕادەیەك یان سەرلەبەر پاك بۆتەوە و دیسان شتی لەسەر نووسراوەتەوە. بارت باسی ئەم بابەتەی لە وتارێکی خۆیدا بە ناوی «تیۆریی دەق» هێناوەتە ئاراوە:

***هەر دەقێك تانوپۆیەکی نوێی قسە و نووسراوەکانی پێشووە. ڕەمزەکان، ڕێسا و مۆدێلە ئاهەنگینەکان، هەندێ پاژی زمانە کۆمەڵایەتییەکان و هتد بە نێو دەقدا تێدەپەڕن و بە نێو دەمارەکانیدا بڵاو دەبنەوە، چونکی زمان هەمیشە پێش دەق دەکەوێ و دەورەی داوە.[١٣]***

کە واتە دەقێتیی ئەدەبی بۆی هەیە وەك چەشنێك «سووڕی ئیستدلالی[١٤]» بێتە ئەژمار. گەرچی ئەو پێوەندییە نوێیانەی کە لە نێوان گوتارەیلی تەرخانکراو و بەکاربراو لە هەناوی ئەدەبیاتدا بەدی دێن، دەستەبەری ئەم ڕاستییە دەکەن کە نووسراوەی ئەدەبی هەرگیز هاوشێوە و سەرومڕ دووپاتبۆوە نین. شێعری «وێرانە خاك»ی تی.ئێس. ئیلیۆت یان ڕۆمانی «ئولیس» بەرهەمی جیمز جۆیس، نموونەی پڕ بەپێستی دەقەیلێکن کە خودئاگایانە کۆمەڵێك دەنگ و ڕەنگی جۆراوجۆر و جیاوازی گوتاری ئەدەبی و گوتارگەلی باوی تر سەر لەنوێ دەنووسنەوە. دەکرێ ئەم گوتارانە کەموزۆر بە هاسانی بناسرێنەوە، بەڵام ئەو کاتەی لە کۆمەڵێك پێکهاتەی ئاوێتەکراو و لە پاڵ یەك دانراوی دژوازی نوێدا بەکار دەبرێن، دۆخێکی تەواو جیاواز وەخۆ دەگرن. شایانی سەرنجە کە ئیلیۆت لەگەڵ «وێرانە خاك» کۆمەڵێك یاداشتی

12- palimpsest.
13- Roland Barthes, "Theory of the text', in Robert Young (ed), untying the text (London, Routledge) p.39.
14- discurdive recycling.

بڵاو کردەوە کە ئەم شێعرە دەخاتە نێو چوارچێوەیەك لە دەرەوەی دەقی شێعرەکە، هەروەتر بەشێکی فراوانی تۆژینەوەگەلی رەخنەگرانە لەمەڕ «ئولیس»،جێگە و پێگەی ئەم رۆمانە لە کۆمەڵێك گێڕانەوەی بەرفراوانتر و پێکهاتەیلی زانستدا دیاری دەکەن کە لە دەقەکەیدا تەنراون. رەخنەگری ئامریکایی، هارۆلد بلووم ( Harold Bloom)، لە کتێبی «دڵەڕاوکێی کاریگەرێتی: تیۆرییەك دەربارەی شێعر[15] » (١٩٧٣) خواستی حاشا کردن لە شوێنەواری پێشوو بە هانە و ئەنگیزەی سەرەکی لە داهێنانی ئەدەبیدا دێنێتە ئەژمار. ئاسەواری ئیلیۆت و جۆیس جۆرێکە وەك ئەوەی بڵێی ئەوان ئەم پرۆسەیەی ئەدەبیاتیان تا رادەیەك بە رەنگدانەوەی خودی ئەدەبیات دەزانی. بە خوێندنەوەی رۆمانی ئولیس، ئەگەر چیرۆکەکانی پێشتری و هەڵبەت دواتری جۆیسیش بخوێنینەوە، مانایەکی زیاتری لێ هەڵدەکرێنین: کومەڵێك ژێدەری بەرامبەر یەك و هەندێ ئاماژە و هێما ئەزموونی خوێندنەوە، بە زمانی دەستەواژە نەریتییەکەی، «بەپیتوپێزتر» دەکەن یان، بە زمانی دەستەواژەی تیۆریك، دالە بەردەستەکانی نێو دەق، کۆمەڵێك مەدلوولی بەپێچوپەناتر بە زەینی خوێنەر دەگەیەنن. ناسینی کەسایەتیی ستێفن دێدالووس ( Stephen Deadalus) لە رۆمانی «وێنەی هونەرمەند لە تافی لاویدا» و هەروەتر نوسخەی پێشتری، واتە «ستێفنی قارەمان[16] » (١٩٤٤) کە تەنیا دوای مەرگی جۆیس بڵاو بۆوە (کە هەندێ کێشەی سەرنجڕاکێشی سەبارەت بە پاش و پێش کەوتنی رێکەوتی نووسینی شوێنەواری ئەدەبی و لە ئارادا بوونی مەبەست و نییەتی نووسەر لەم مەسەلەیەدا هێنایە گۆڕێ)، چوارچێوەیەك بۆ نیزیك بوونەوە و تێگەیشتن لە ئولیس پێکدێنێ، هەڵبەت یەکێك لە شێوازە باو و رەگ داکوتاوەکانی تۆژینەوەی ئەدەبیات، ناسینی هەمە لایەنەی شوێنەواری نووسەرە.

15- The Anxiety of Influence: A Theory of poetry.
16- Stephen Hero.



ئەو کاتەی دەقێك دەخوێنینەوە، ئاگایانە یان نائاگایانە، ئەو دەقە دەخەینە نێو چوارچێوەیەك لە زمان و مەعریفە کە کامڵتر لە چوارچێوەکانی تەرخانکراو بۆ نووسەرێك، قۆناغێك یان پێوەرێکی ئەدەبیی تایبەتە. بە مانایەك دەتوانین بڵێین دەق دەخەینە ژێر سەیوانی کۆمەڵێك گوتاری جۆراوجۆر و هەمەچەشنی وەرگیراو لە کولتووری خۆمان و ئەزموونێك کە بە پێی شوێن و کات و خوێنەرەکەی جیاواز دەبێت. بارت لە وتارێکیدا بە ناوی «ڕەخنە وەکوو زمان[17] » (١٩٦٣) لە سریشتی رەخنە دەکۆڵێتەوە و دەڵێ، ئەرکی رەخنە دۆزینەوەی هەقیقەتەکان نییە (کە ئەمەیان کاری فەلسەفەیە)،بەڵکوو دیتنەوەی شکڵ و شێوەکانی «بەهامەندی[18] »یە:

***دەکرێ بڵێین کاری رەخنە... کارێکی فۆرمالی رووتە. رەخنە بریتی نییە لە «دۆزینەوە»ی شتێکی «شاراوە» یان «داپۆشراو» یا «نهێنی» لە نێو بەرهەم یان نووسەردا کە تا هەنووکە بە پەنهانی مابێتەوە (لە رێگای کام مۆجزەوە؟ ئایا ئێمە لە پێشینانمان وردبینترین؟) بەڵکوو ـ وەك کابینێتسازێکی لێهاتوو کە شارەزایانە دوو کابینێتی نابەرامبەر بە یەکترییەوە دەلکێنێت ـ کاری رەخنە لە بەر یەك رانان و لە پەنا یەك دانانی زمانی رۆژ (ئیگزیستانیسالیزم، مارکسیزم یان دەروونشیکاری) و زمانی نووسەرە، واتە سیستمی فۆرمالی ئەو رێسا مەنتقییانەی کە نووسەر لە بارودۆخی زەمان و سەردەمی خۆیدا هێناوییەتە ئاراوە... ئەگەر شتێك بە ناوی دەلیلی رەخنەگرانە بوونی هەبێت، ئەو دەلیلە لە رێگەی دۆزینەوەی بەرهەمی بەریاس روون نابێتەوە، بەڵکوو بە پێچەوانە لە رێگای دانانی ئەو***

17- criticism as language
18- validity

***بەرهەمە لە ژێر سەیوانی، تا رادەی گونجاو، سەرومڕ زمانی رەخنەگر خۆی، خۆیا دەبێت.*** [١٩]

بارت لێرەدا، رەخنە وەك جۆرە پێوەندییەکی نێوان زمانی دەق و ئەو زمانە دەزانێ کە بۆ خوێندنەوە و راڤەی دەق بەکار دێت. ئەم پێوەندییانە بە چەن هۆیەکی جۆراوجۆر دەگۆڕێن. وەك چۆن ئانتۆنی ئیستهۆپ (Antony Easthope) ئاماژەی پێدەکا، «دەق شوناسێکی بۆ خۆی هەیە، بەڵام ئەم شوناسە هەموو کات رێژەیی‌یە [٢٠].» ئیستهۆپ وەك روونکردنەوەی گوتەی خۆی دەڵێ، ئەو دەقەی کە ساڵی ١٩١٢ بۆ خوێنەرانی خۆی ناسیاویسڕینەوەی بەدی هێناوە، ساڵی ١٩٢٢ ئەم کارەی لە دەست نایات، یان لانیکەم ئاشنایی سڕینەوەکەی بە هەمان شێوەی پێشووی نابێ. لەگەڵ گۆڕانی فۆرمە ئەدەبییەکان بارودۆخی خوێندنەوەش دەگۆڕێن و بە پێچەوانە. تۆنی بێنێت (Tony Bennett) لەو مانایەی کە بۆ دەستەواژەی «شێوە بەندییەکانی خوێندنەوە» لەبەر چاوێتی، تێڕوانینێکی هاوچەشن بە دەستەوە دەدات: «کۆمەڵێك گوتاری لێکگرێدراو کە بە شێوەیەکی کاریگەر و شوێندار کۆمەڵێك دەق و پێوەندیی نێوان ئەو دەقانە بە چەشنێکی تایبەت وەکار دەخات [٢١].» بێنێت ئەم مۆدێلە راڤەییە بە سەرنجدان بە باسوخواسی میشل فۆکۆ لەسەر کتێب یان دەقێك لە بەرهەمێکی گەلێ گرینگدا بە ناوی «کۆنینەناسیی مەعریفە» (١٩٦٩) دێنێتە ئاراوە:

19- Roland Barthes, " criticism as language", in David Lodge (ed), Twentieth century literary criticism (London, Longman) p.650
20- Antony Easthopem "Literature, History, and the Materiality of the Text" in Literature and History, 9:1 spring 1983m p.28.
21- Tonny Bennett, "Text, Readers, Reading formations," in literature and history, vol.9:2 Atumn 1983, p.216.



***سنوورەکانی کتێبێك هیچ کات بە تەواوی دیاری ناکرێن: لەو دیوی سەردێڕ و یەکەم دێڕ و دوایین نوقتەی کۆتاییی رستە، لەو دیوی پێکهاتەی دەروونی و شێوەی سەربەخۆی، ئەو کتێبە لە نێو سیستمێکی سەرچاوەییدا پێوەندی بە کتێبەکانی ترەوە هەیە... کتێب هەر تەنیا شتێك نییە بە دەست کەسێکەوە... یەکێتیی کتێب بگۆڕ و رێژەیی‌یە.*** [٢٢]

بە بڕوای بێنێت، هەر دەقێك «بەردەوام لەنێو تانوپۆی جۆراوجۆری مادی و کۆمەڵایەتی و بنکەیی و ئایدۆلۆژیکیدا دەنووسرێتەوە.»

ئەم تێڕوانینە کە دەڵێ، دەقەیلی ئەدەبی لەسەر دەستی پرۆسەی خوێندنەوە و راڤە دەنووسرێنەوە (تێڕوانینێك کە تیۆری داڕێژانی تریش پێشتر باسیان کردبوو)، بۆ تۆژینەوەی نێوان دەقێتی یارمەتی بەخشە. دەرکەوتی گەلێ دیاری ئەم تێڕوانینە کورتە چیرۆکێکی «خۆرخێ لوییس بۆرخێس [٢٣]»ە بە ناوی «پییەر مێنار، نووسەری کیشۆت [٢٤]» (١٩٦٤). لەم گێڕانەوەیەدا، رۆماننووسێك بە ناوی پییەر مێنار، لە سەدەی بیستەمدا بڕیاری داوە وشە بە وشە رۆمانی «دۆن کیشۆت»ی سێروانتس بنووسێتەوە. بۆ ئەم مەبەستە مێنار ئەو بارودۆخە ناخولقێنێتەوە کە سێروانتس تێیدا لە سەرەتاکانی سەدەی حەڤدەهەم دۆن کیشۆتی نووسی، چونکی باوەڕی وایە کە نووسینەوەی رۆمانی سێروانتس بەم جۆرە لە رادە بەدەر هاسان دەبێتەوە. مێنار خۆی هەر بە رۆماننووسێکی سەدەی بیستەم دەزانێ و «کیشۆت» لەسەر دەستی ئەم ئەزموونانە دەنووسێ. مێنار تا ئەو رادەیە لە کارەکەی سەر دەکەوێ کە بەر لە مەرگی، دوو فەسڵ و تۆزێکی ئەم رۆمانە وشە بە وشە بنووسێتەوە و وەگێڕ (ڕاوی) لەم دەقە و لە نوسخە سەرەکییەکەی «کیشۆت»

22- Michel Foucault, The Archaeology of knowledge (London, Tavistock, 1972) p.23.
23- Jorge Luis Borges.
24- Pierre Menard, Author of the Quixote.

بەرهەمی سێروانتس قسان دەگێڕێتەوە. هەڵبەت قسە گێڕانەوەی وەگێڕ لە هەر تك ڕۆمانەکەدا ڕاست وەك یەك وایە، بەلاّم وەگێڕ پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە ماناکانیان بە گشتی جیاوازە. ڕستەی «هەقیقەت کە مێژوو دایکێتی» بۆی هەیە بە پێی زەمینە مێژووییەکەی ماناگەلێکی تەواو جیاوازی لێ هەڵێنجرێت. ئەم ڕستەیە بۆ سەدەی حەڤدەهەم «پێدا هەڵگوتنێکی ڕەوانبێژیانەی رووتی مێژوو»ە. بەلاّم بۆ سەدەی بیستەم دەتوانین وای لێکبدەینەوە کە مێژوو «لێکۆڵینەوە لە نێو هەقیقەتدا نییە، بەڵکوو سەرچاوەی هەقیقەتە.»: هەقیقەتی مێژوویی «ئەو شتەی رووی داوە نییە، ئەو شتەیە کە باوەڕمان وایە رووی داوە.» ئەم چیرۆکە، ئاماژە و هێمایەکە دەربارەی داهێنان و لە کار کردن و بەکار هێنانی ئەدەبیات و لە ڕێگای گوتاری داستانییەوە مانا و مەبەستی نێوان دەقێتی روون دەکاتەوە. بە مانایەك لە ماناکان، هەرچی دەقە لە کاتی خوێندنەوە و سەر لەنوێ داهێنانیانەوە، دەنووسرێنەوە. بە پێی خوازەی «دەسنووسی کۆن» کە پێشتر ئاماژەمان پێکردبوو، خوێندنەوە و ڕاڤەی دەقی ئەدەبی بە واتای نووسینەوەی سەر لەنوێی ئەو دەقەیە. تۆنی بێنێت پێی وایە دەستەواژەی «چالاك کردنی داهێنەرانە» لە «ڕاڤە» باشترە، لەو سۆنگەیەوە کە خوێندنەوە بە واتای کتومت مێژوویی وشەکەی، هەڵگری ئەو کۆمەڵە مانایانەیە کە بە شێوەیەکی ئاگادارانە لە نێوان دەق و خوێنەردا چالاك بوون و وەگەڕ کەوتوون. بەلاّم مەسەلەیەکی پڕپێچوپەنای تر کە پێویستە وەبیر خۆمانی بێنینەوە، ئەوەیە کە ئەو کاتەی هەوڵ دەدەین ئەوە بێنینە بەرچاوی خۆمان دەقێکی ئەدەبی لە چ بارودۆخ و کەشوهەوایەکدا بەرهەم هاتووە ـ واتە ئەو کاتەی هەوڵ دەدەین لە زەمینە و بەستێنی نووسینی دەق یان لە زەمینە و قۆناغەکانی دواتری ڕاڤەی دەق تێبگەین ـ، ئەوەی ڕاستی بێت ئەو هەولاّنە خۆیان فۆرمگەلێکی دەرخستنی پرۆسەی خوێندنەوەن کە ناچارەکی داگری مەزەندە و شك و گومانن. گەر بمانەوێ دەقی شانۆیی «هەملێت» لە گۆشە نیگای خوێنەرانی



سەرەتای سەدەی حەڤدە، واتە سەروبەندی نووسینی ئەو دەقە، یان لە کەشوهەوای دەیەی ١٩٣٠دا بخوێنینەوە، ئەو کات ئەو چەشنە ناسینەی کە لە هەر کام لەو دوو حاڵەتەدا بەو پێیە هەملێت لەبەر چاو دەگرین، بۆی هەیە بریتی بێ لە کۆمەڵێك سەرچاوەی جۆراوجۆری وەك شیکردنەوەی مێژوویی قۆناغەکان، بابەتەیلی ژیاننامەیی، باسوخواسی تماشاچیان، وێنە، یان گەلاڵە و هتد و ئەمانەش دەقەیلێکن کە دەوراندەوری ئەو دەقە دایاندەنێین کە خۆی بابەتی تۆژینەوەی ئێمەیە و ئەو واتا و مانایەکی کە لەم دەقانە لە پێناو ڕاڤە کردنی «هەملێت» بە شێوازێکی تایبەت وەدەستیان دێنین، خۆیان چاو لەدەستی ئەو بارودۆخەن کە دەبنە زەمینە و چوارچێوەی خوێندنەوەی ئەو دەقانە. ئەم شتە، خوێندنەوە تا ڕادەیەك ڕێژەیی دەکات، ڕێژەیی بوونێك کە بە شێوەیەکی هێزەکی کۆتایی هەڵنەگرە. سەبارەت بەوەی ئەم تێڕوانینە ڕێژەییییە تا چەندە ئەگەری بێ‌مانا بوونی هەیە، ئەوە مشتومڕ و جیاوازیی بیر و بڕوای فروان هەیە. ئەم باسوخواسە دەمانگەیەنێتە هەرێمی باسێکەوە بە ناوی «پێکهاتە هەڵوەشێنی» کە بە شێوەیەکی بەرچاو لە نووسراوەیلی تیۆریکی نوێدا هاتۆتە گۆڕێ و بە تایبەت لە زانکۆ ئامریکاییەکاندا لایەنگری زۆری هەیە.

## پێکهاتە هەڵوەشێنیی دەق

ژاك دریدا، تیۆریداڕێژی فەرەنسەیی کە زۆر جار وەك بناغەدانەری قوتابخانەی «پێکهاتە هەڵوەشێنی[٢٥]» دەیهێننە ئەژمار، لە وتارێکیدا بە ناوی «پێکهاتە و نیشانە و کایە لە گوتارەیلی زانستگەلی ئینسانی»دا (١٩٦٦) والی لێکدایەوە کە لە زانست و فەلسەفەی ڕۆژاوادا، فۆرمەکانی ناسین و مەعریفە بە دەوری «تەوەر»ێکدا بیچم دەگرن و گەلێ جار سەرنجێك بەم پرۆسە پێکهاتەسازە نادرێ،

25- Deconstruction

چونكی وەك بابەتێكی ئاسایی و عادەتی لێهاتووە. گوتار یان مەعریفە زۆر جار ئاماژە بە یەك «خاڵی ئامادە بوون و ژێدەری نەگۆڕ[٢٦]» دەكات. بە باوەڕی دریدا، ئەم تەوەرە ئەركێكی دوو لایەنەی هەیە. ئەم تەوەرە ناوەندێك بەدی دێنی و دەبێتە هۆی ئەوەی كە مەعریفە لەسەر دەستی یەك هەقیقەت یان كەشف و شهوودی تایبەت كە وێدەچێ رووت و رەها بێت، بەرهەم بێت و ئەمەش مۆدێلەكە كە تێڕوانینگەلی رەخنەگرانەی نەریتی بۆ دەقی ئەدەبی زۆر جار لە رێگای بە دەستەوەدانی كۆمەڵێك راڤەی بە رواڵەت قەتعی و قسەبڕ پەرەی پێدەدەن و گەشەی پێدەبەخشن، وەك چۆن لە گوتارەیلی تریشدا، گوتاری وەك دادوەری یان پزیشكی ئەم رایە وەڕاست دەگەڕێ. ئەم مۆدێلە هەروەتر هەر لە بنەڕەتەوە مانا بەردەستەكان سنووردار و بەرتەسك دەكاتەوە، چونكی پەرژین كردنی شێوازەكانی تێگەیشتن لە دەق یان بوارێكی زانستدا، دەبێتە بەردی سەر رێگای فراوان بوون یان كایەی سەربەخۆیانەی مانا. مانا لە نێو سیستمی مەعریفەدا هەڵدەگیرێ، بە چەشنێك كە هەر گوتارێك هەقیقەتی خۆی بەرهەم دێنێ یان متمانەی پێ دەبەخشێ و سەرنجی ئێمە لە چۆنێتیی دەستڕاگەیشتن بەم هەقیقەتە بە لاڕێدا دەبات. پەرە سەندنی ئەو شتەی وەك «دیسیپلین» و بەرنامەی زانكۆیی ناسراوە، تایبەتمەندیی تێگەیشتنی پرۆسەیەكی مێژوویی‌یە كە لە رێگایەوە هەندێ بواری زمانی تا رادەیەك خۆبژێو و سەربەخۆ بوون، بە چەشنێك كە «هەقیقەتە ئەدەبییەكان» تەنها بە پێی ئەو پێوەرە ئەدەبی ـ رەخنەییانە هەڵسەنگێندران كە بۆیان هەبوو «هەقیقەتمەندی» (truthfulness) بناسێنن و شی بكەنەوە. هەر بەم شێوەیە، «هەقیقەت»ی مێژوویی لەسەر دەستی ئەو سەنگی مەحەكانەی كە

26- Jacques Derrida, "Structure, sign and play in the Discourses of the Human Sciences in "writing and difference (London, Routledge, 1978) p.278.



فەیلەسووفانی مێژوو دیاری دەكەن بیچم دەگرێ، و هەتای دوایی. لەم رووەوە مەعریفە بۆ خۆی متمانە بە خۆی دەبەخشێ. لە راستیدا یەكێك لە تایبەتمەندییەكانی زمان و مەعریفە، سریشتی دووپاتەخوازانەیانە، یان بە وتەیەكی تر، دەربڕینی یەك باس و بابەت لە رێگای چەند شێوازێكی جۆراوجۆرەوە. هەڵبەت مەبەستمان ئەوە نییە بڵێین كە بوارە زمانییەكان تەواو لەیەك جودان و بە جیا كاری خۆیان بەڕێوە دەبەن، یان لەگەڵ یەك ناسازگارن. بۆ وێنە، لایەنەكانی مێژوو زۆرتر بۆ سەلماندن و گەشە بەخشین بە تۆژینەوەكانی ئەدەبیات بەكار دەچێت و بەپێی مۆدێلی دریدا، لقەكانی زانست خاوەن پێكهاتەمەندییەكی گشتەكی و هاوشێوەن، بە چەشنێك خۆ گەر نەڵێین ناوەرۆك، بەڵام جۆرەكانی مەعریفە و زانست تێیاندا هاوبەشن. بە زمانێكی تر، ئۆرگانیزە و رێكوپێك كردنی مەعریفە لە بابەتەیلی تایبەتدا دەبێتە هۆی خۆبژێویی مەعریفە.

دریدا بە رەگەزی سەرەكیی ئەم پرۆسەیە دەڵێ «لۆگۆسەنتریزم[٢٧]» (ئاخافتن ـ تەوەری)، كە دەستەواژەیەكە لە وشەی logosی یۆنانییەوە وەرگیراوە، بە واتای راستەوخۆی زمان و هەندێ واتای ناڕاستەوخۆی وەك مەنتق و عەقڵ و ئاوەز كە بەشێكی بنەڕەتی و گرینگی مانا و مەعریفەی كولتووری رۆژاوایە. زمان ئەو هەلەمان بۆ دەڕەخسێنێ تا كۆمەڵێك تەوەری مانایی تەواوەن بێكۆتایی بەدی بێنین، لە «من»ەوە كە هێمای شوناسی تاكەكەسییە تا تەوەرەیلی هاوبەشی نەتەوایەتی. بۆ نموونە، ئەدەبیاتی ئینگلیزی لە بەرهەم هێنانی ئوستوورەی «ئینگلیزی بوون»دا كە تا رادەیەكی زۆر بۆ شوناسی كولتووریی ئینگلتەرا خاوەنی گرینگایەتییە، رێشاندەر و شوێندانەر بووە. دین و مەزهەب لە رۆژاوادا لەسەر بنەمای چەمكی خودا و دوا بە دوای ئەو كۆمەڵێك وردە تەوەر دامەزراوە

27- logocentrism

که کار و ئەرکیان پاراستنی تەوەری غایەتمەندی «ئامادە بوون[٢٨]»ە. کاتێك گومان لە تەوەرێك دەکرێ یان گۆڕانی بەسەردا دێت، وەك پێناسەی سەر لەنوێی فرۆید بۆ دەروون کە بووە هۆی ئەوەی مانای ناخودئاگا جێگا بە مۆدێلی نەریتیی زەین و خودئاگا چۆڵ بکات، لەبری ئەو تەوەرە کۆنە تەوەرێکی نوێ بەدی دێت. وێدەچێ بێ لە ئارادا بوونی جۆرە تەوەرخوازییەکی بنەمایی لە گوتاردا، تێفکرین و ئاخافتن یان نقیسین کارێکی نامومکینە. زمان لە لایەنی مێژووییەوە لە ژێر رکێفی هێزەکانی «ئامادە بوون»دا بووە: دریدا وای لێکدەداتەوە کە سەرەتی دان بە ئاخافتن لە هەمبەر نقیسین لە بیر و باوەڕی ئەفلاتووندا، شێوازێکە بۆ متمانە و مەزنایەتی بەخشین بە زمان و گەڕاندنەوەی بۆ سەر تاقە یەك بێژەری تایبەت و هەر بۆیە قەتیس کردنی لە تاقە یەك چرکەساتی دیاریکراو و تاقە یەك مانای دەسنیشانکراودا[٢٩]. هەر ئەم کارە بۆ شیکردنەوە و روونکردنەوەی دەق پتر لە رێگای سەرنج دان بە نییەتی نووسەر و گونجاندنی نووسراوە لە نێو هەندێ تۆڕی سەقامگرتوو یان ئەو پێوەر و پێودانگانەدا کە بە نیازی پاراستنی ماناکانیانن، سەبارەت بە زمانی نقیسین کراوە. دریدا دەڵێ مانا لە راستیدا هەرگیز تاك و تەرا

28- presence

٢٩- ئەفلاتوون لە زمان سوقراتەوە، لە کتێبی فێدروس (Phaedrus) (ساڵی ٣٧٠ی پێش زایین) لە هەمبەر نقیسین، متمانە و سەرەتی بە ئاخافتن دەبەخشێ، چونکی بە هۆی ئامادە بوونی بێژەر قسەکانی کەمتر مانای خراپیان لێدەدرێتەوە، کەواتە دەقی نووسراو پتر هەرەشەی راڤەی لەسەرە. رێك لەم سۆنگەیەوە کە ژاك دریدا لە وتارێکی سەبارەت بە "فێدروس"دا، ئەم تێڕوانینەی ئەفلاتوون بەراوەژوو دەکات و باسی گرینگایەتیی قبووڵ کردنی ماناگەل یان «مەدلولگەلی» چەند لایەنە لە هەرچی دەقەدا دێنێتە ئاراوە، ئەو مانایانەی کە بە هۆی نەبوونی هەر چەشنە دەستەبەرییەکی دیاریکراو لە نقیسیندا ئیمکان هەڵگرترن.



یان مەند و نەگۆڕ نییە، بەڵکوو بەردەوام خەریکی پەرە سەندن و گۆڕان یان راکردنە، جا چ لە زمانی ئاخافتندا بێت، چ نقیسین. دریدا بەم فراوانی و گۆڕینی مانایانە کە بە شێوەیەکی هێزەکی لە هەموو دەقێکەوە سەرچاوە دەگرێ، دەبێژێ «پرژ و بلاوی[٣٠]».

دریدا بۆ چەمك سازی سەبارەت بە چلۆنێتیی کاری مانا و ئەو شتەی بەردی بناغەی پرۆژەی پێکهاتە هەڵوەشێنی پێکدێنێ، لە زاراوەی différance کەڵك وەردەگرێ. دریدا ئەم زاراوەیە بە واتا فەرەنسەییەکەی بە کار دێنێ کە خۆی یارمەتیدەری تێگەیشتنی ماناکەیەتی. تێرمی difference پێش هەمو شتێك مانای «جیاوازی» دەدات کە بە واتایەك لە تێڕوانینێکی سوسورەوە وەرگیراوە سەبارەت بە زمان کە دەڵێ زمان سیستمی جیاوازییەکانە، بە وتەیەکی تر، لە رێگای سیستمی جیاوازیگەلی دەنگی و تێگەیشتن لەو راستییەی کە دوو شت یەکسان نین، دەتوانین لە نێوان وشەکان و ماناگەلی پێوەندیدار بە وشەکان جیاوازی دابنێین. کەواتە ئیتر «مار»،«دار» یان «شار» یان تەنانەت «چەتر» یان «سەیوان» نییە. بە رای سوسور لە نێوان دال و مەدلوولدا پێوەندییەکی نەگۆڕ لەئارادایە و سیستمی جیاوازییە دەنگی یان مانایییەکان بە شێوەیەکی رێکوپێك و بێگیر و گرفت کاری خۆیان بەرێوە دەبەن. بەڵام بە باوەڕی دریدا، ئەم سیستمە گەلێ گرفتی لەسەر رێیە: مانا هەمیشە کێشەی لەسەرە و لە حاڵی گۆڕاندایە. کاتێك بیر لەوە دەکەینەوە «سەگ» چییە، بیر لەوەش دەکەینەوە کە «سەگ» چی نییە: واتە ئەوەی سەگ، پشیلە یان بەراز یان شتێکی تر نییە. بە وتەیەکی تر، ئەو کاتەی هەوڵ دەدەین مانایەك دیاری بکەین و شتێك وەك شتێکی تاك و ئیجابی و جێی باوەڕ و متمانە وێنا بکەین، لە رێگای بێدەنگ کردن و حاشان کردن لە تایبەتمەندی یان مانا جیاواز یان دژەکانی ئەو شتەوە بەم ئامانجە دەگەین. چەمکی «چاکە» بە

30- dissemination

بێچەمکی دژوازی ئەو، واتە «خراپە» بوونی نییە، بیرۆکەی «پیاو» و «پیاوەتی» بێ بیرۆکەی «ژن» و «ژنێتی» قابیلی وێنا کردن نین. هەر چەندی مانا یان بەهایەکی تایبەت بە هێز و وزەیەکی زیاترەوە دەربڕدرێ، ئەو لایەنی جیاوازییانەی کە ئەم مانا یان بەهایە دەگرنە خۆ گرینگتر و بەرچاوترن. لەم بارەیەوە، دریدا وای لێکدەداتەوە کە دەق لە راستیدا دەربارەی ئەو شتە دەدوێن کە بە روالەت فڕیان بە سەرییەوە نییە. هەر بۆیە دریدا بە دوای ئەو خاڵە لاواز یان درز و کەلەبەرانەیە کە «ئەوی تر بوونی شاراوەی دەق» تێیاندا ئاشکرا و خۆیا دەبێت. گەر دیسان بۆ نموونە باسی رۆمانی پارکی مەنسفیلد بکەین، دەبینین لەم رۆمانەدا هیچ کات بە ئاشکرایی باسی مەیلی جنسی و سێکسی نایەتە گۆڕێ، گەرچی گومانی تێدا نییە مەیلی جنسی هەڕەشەیەکی هەمیشەییە لەسەر ئەو چەشنە لە رێکوپێکی کۆمەلایەتی و پێوەندیگەلی مادی کە وەك رێکوپێکی و پێوەندیگەلێکی نۆرمال و ئەخلاقی چێ کراون. بەڵام ئەو دیمەنەی کە "فەنی" لە دەرەوەی دەروازەکانی رووەو بیابان بە تاقی تەنێ دانیشتووە و کەسایەتییەکانی تر بێئیجازە لێی دێنە ژووری، وێدەچێ دەربڕی مەیلی جنسییە. پێوەندیی جنسی لەم دەقەدا بە حەرام و تابوو لە قەڵەم دەدرێت و باسی لێ ناکرێ و بە لانی زۆرەوە بە ئاماژە شتێکی لەسەر دەگوترێ، بەڵام ئەم پێوەندییانە بە مەبەستی پاراستنی سیستمی ئەخلاقی رووکەشی و روالەتی پێویستن. بە دەربڕینێکی تر، بابەتی رۆمانی پارکی مەنسفیلد ئەوەندەی ئەخلاق و ئاکارە، ئەوەندەش بێئەخلاقی و گەندەڵییە. بەڵام لایەنی نائەخلاقی بە نەگوتراوی و کپکراوی دەمێنێتەوە و لەم رێگایەوە، زمانی بەکار هێنراوی نێو دەق و رەفتار و هەڵسوکەوتی ئەخلاقیی کەسایەتییەکان دەسنیشان دەکات. دریدا بەمجۆرە کەلێن و قەڵشتە کە «ئەوی تر بوونی» مانا خۆیا دەکات دەڵێ aporia کە لە زمانی یۆنانیدا بە واتای «گومان» یان «سەرلێشێواوی»یە. دریدا بابەتەکە بەم شێوەیە شیدەکاتەوە کە هەندێ دەق «ئەوی تر بوونی»



(otherness) خۆیان و شێوازەکانی بەرهەمهێنانی مانا و «بەناوەند بوونی» ئاگامەندانەی ئەو مانایانە ئاشکرا دەکەن و ئەم حاڵەتەش دەبێتە هۆی ئاشکرا بوونی ئەو دژوازییە زاتییانەی کە ئەو دەقانە لەسەریان رۆنراون. ئەم بابەتە بە تایبەتی سەبارەت بەو دەقە ئەدەبییانە وەڕاست دەگەرێ کە لەوانەیە بە پێچەوانەی گوتارەکانی تر نەك هەر مانا، بەڵکوو شێوەکانی بەرهەمهێنانیماناش زەق بکەنەوە. دیارە ئەم تێڕوانینە خاڵی هاوبەشی فراوانی لەگەڵ ئەو روانگە تیۆریکانە بۆ دەقی ئەدەبی هەیە کە تاکوو ئێستا لە سەر دەستی تیۆرییەکانی باختین و بارتەوە لە تەکیان ئاشنا بووین.

دووهەم واتایەك کە دریدا لە دەستەواژەی différance دەیخوازێ «وەخران» یان «دواخستن»ـە کە لە وشەی différer ـەوە وەرگیراوە و بە واتای «وە دوا خستن» و هەروەتر «جیاواز بوون»ـە. مەبەست لەم دەستەواژەیە ئەوەیە کە مانا هیچ کات کاملْ و پڕ بەپێست نییە و هەرگیز بە تەواوی وەدی نایات، بەڵکوو هەمیشە لە ژوور ئێمەوەیە، دوا دەکەوێ یان حەواڵەی کات و ساتێکی تر دەکرێ. وشە لەسەر دەستی وشەی تر پێناسە دەکرێن کە ئەوانیش خۆیان لە رێگای وشەی ترەوە دێنە ناسین، کەواتە هیچ کات بۆمان نییە دەستمان بە مانایەکی تەواو وەدیهاتوو یان دوانەکەوتوو رابگات. ئەم بابەتە تا رادەیەك لەو کایەیەی لویس کارۆل دەچێت کە لە کتێبی «ئالیس لە ولاتی شتە سەیر و سەمەرەدا» بە مانای مانا دەیکات: کاتێك مارچ هیر بە ئالیس دەڵێ: «کە وایە دەبێ بڵێی مەبەستت چییە؟»، ئەو لە وەلامدا دەڵێ: «مەبەستم هەر ئەو شتەیە کە دەیڵێم ـ دەزانی، من مەبەست و قسەکانم وەك یەك وان.» ئەو کات هاتێر لە وەلامی ئەودا دەڵێ: «ئەسڵەن وەك یەك نین!» لە راستیدا، ئالیس بە نییەتی دەستەمۆ کردنی مانا، کۆمەڵێك مانای پەرەسەندووی دەستەمۆ نەکردە وەگەڕ دەخات. مانا ناتوانرێ سنووری بۆ دابنرێ: مانا بە پێی سریشتی هەموو کات ئامادەی ئەوەیە کە بە

PDF 4 KURD

ئاراستەیەکی جیاواز لەوەی بە روالّەت تێیدایەتی یا تایبەتە بەو، بەرەو پێش بڕوات. دەقی ئەدەبی لەوانەیە هێندە ئاگادارانە لەم بابەتە کەڵك وەربگرێ کە تەمومژ و تەنانەت رووبەرە پڕپێچوپەناکانی مانا بە ئاشکرایی لە دەقدا خۆیا دەبن. دریدا سەرنجێکی تایبەت بە شوێنەواری جۆیس دەدات و لە هەندێ بەشی «ئولیس» و بە تایبەت "Finnegans wake"دا (١٩٣٩) وزەی خەوتوو لە زماندا وێدەچێ تا رادەی گونجاو، ئازاد دەبێ. راکردنی بێ‌کۆتاییی لە مانای ورد لە رۆمانی Finnegans wakeدا، رزگاری و ئازادیی دەوری کاملّی دەلالەتە کە زۆر جار لە گوتارە باوەکاندا دەستەمۆ و سەرکوت دەکرێ، وەك بلّێی وزەی خەوتوو لە هەناوی ئەتۆمگەلی زەرەکانی زماندا دۆزراونەتەوە. ئەو وێنا جۆراوجۆرانەی کە رستەیەك بەدییان دێنێ، تا رادەیەك پیشاندەری ئەم بابەتەیە، بە تایبەت لە یەکەم دێڕ و دواین دێڕەکانی رۆمانەکەدا کە لەگەڵ یەکتر یەکێتیی سینتاکتیك (نەحوی)ـیان هەیە و لەم رووەوە مۆدێلێکی بازنەیی پێکدێنن بەو مانایە کە بۆ گۆڕان و وەرسووڕانەکانی مانا کە لە نێو زمان و زاتی خودئاگادا بەدی دێن هیچ چەشنە کۆتاییەك لە ئارادا نییە، ئەوە لە حالێکدایە کە لەم دەقەدا، وێڕای دوای لێبوردن لە تی. ئێس. ئیلیۆت، بەردەوام سەرەتا لە کۆتاییدا و کۆتایی لە سەرەتادایە:

Riverrun, past Eve and Adam's, from swerre of shore to bend of bay, brings us by a commodious vicus of recirulation back to Hawth Castle and environs.

A way a lone a last a loved a long the

تێڕوانینێکی وا سەبارەت بە زمان، کۆمەڵێك پرسیاری گرینگ لەمەڕ سریشت و ماهییەتی رەخنە و راڤە دێنێتە گۆڕێ و باوەڕ بە وەدەسهێنانی یەك راڤەی دروست و دیاریکراو لە دوو لایەنەوە سست و بێ‌هێز دەکات. یەکەم بەو دەلیلەی کە زمانی دەق هیچ کات کامڵ و پڕ بە پێست یان پارێزراو نییە، بەڵکوو هەموو کات



به بەستێنی کۆمەڵێك مانای جۆراوجۆردا تێدەپەڕێ، واتە دەق «پرژ و بڵاو» دەبێتەوە، گەرچی گەلێ بنکە (institution) هەن لەوانەیە بە نیاز بن شێوازەکانی خوێندنەوەی دەق پەرژین بکەن یان بە نەگۆڕی بهێڵنەوە. دووهەم ئەوەیکە، زمانی رەخنە یان راڤە خۆی سووژە و بابەتی چەمکی جیاوازی و دواخستن (différance)ـە و هەرچی زیاتر «کۆتاییەکی» (closure) تایبەت لەبەر چاو بگرێ، بەو ئەندازەیە ئەو مانایانەی کە رەچاو نەکراون، زەق دەبنەوە. بە وتەیەکی تر، هیچ چەشنە خوێندنەوە یان راڤەیەکی نادروست لە ئارادا نییە: وەك چۆن پۆل دومان (Paul deMan) رەخنەگری ئەمریکایی و پەیڕەوی تیۆریی پێکهاتە هەڵوەشێنی باسی کردووە: «هیچ چەشنە خوێندنەوەیەك بە واتای دوا راڤەی دروست بوونی نییە.» ئەگەر روانگە و تێڕوانینی دریدا لەمەڕ زمان پەسند بکەین، هەموو ماناکان جێی متمانەن، چونکی ئاخافتن ـ تەوەری تەنیا هەلی ئەم ئەگەر و ئیمکانە دەرەخسێنێ: زمان بە پێی سریشتی خۆی خاوەن مانایە. ئەو شتەی کێشە و مشتومڕ و جیاوازیی بیروڕای لەسەرە، ئەو مانایانەن کە شەرعییەتیان پێدەبەخشرێ ـ ئەوانەی پەسند دەکرێن و ئەوانەی کە وەلا دەنرێن. کورتە چیرۆکی «نەخشی فەرش» (١٩٠٩)ـی هێنری جەیمز بۆی هەیە وەك روونکردنەوەیەك بۆ خواستی دۆزینەوەی تاکە مانای دەق یان شیکردنەوەی ئەو خواستە لێکبدرێتەوە و رەخنەگرانی پێکهاتە هەڵوەشێن ئەم چیرۆکە وەك نموونە دێننەوە.[31] لەم چیرۆکەدا، رۆماننووسێك بە ناوی وێرێکێر (Vereker) بە رەخنەگرێکی گەنج کە کارەکانی ئەو رۆماننووسە زۆر پەسند دەکات، بەڵام وەك خوێنەرەکانی تر پێی وایە تەواو لە

---

٣١- بڕوانە وتووێژی نێوان ج. هیلیس میلر و شلومیت ریمۆن کینان لەم ژێدەرەدا:
J. Hillis Milles, "The Figure in the carpet" (1980); Shlomith Rimmon Kenan, "Deconstructive Refliction on Deconstruction; in Reply to Hiliis Miller" (1980); and Hillis Millerm "A Guest in the House' Reply to Shlomith Rimmon – kenan's reply" (1980)

مانایان ناگات، دەڵێ نەخش یان گەڵاڵەیەکی تایبەت لە ڕۆمانەکانیدا حەشار دراوە. بەڵام وێرێکێر بەر لەوەی ئەم ڕاز و نهێنییەی پێ بڵێ کۆچی دوایی دەکات و هەر بۆیە دوا ڕوونکردنەوە گریمانەییەکە بە نەگوتراوی دەمێنێتەوە، یان دوا دەخرێ. ئەم چیرۆکە وەك زۆربەی کورتە چیرۆکەکانی تری جەیمز، بە شێوازەیلێکی جۆراوجۆر ڕاڤە کراون. هەندێ ڕەخنەگری ئەدەبی ئەم چیرۆکە وەك کلیلی دەروازەی تێگەیشتنی چیرۆکەکانی جەیمز و لە ڕاستیدا ڕاڤەی دەقەیلی ئەدەبی بە گشتی، زانیوە، چونکی زۆر جار وا بیر دەکرێتەوە کە ئەم دەقانە خاوەن دوا مانا یان هەوێنێك لە هەقیقەتن. لە لایەکی ترەوە هەندێ ڕەخنەگری تر ئەم دەقە وەك ڕەنگدانەوەی چەمکی بەرباسی دریدا لەمەڕ «دواخستن» دەزانن ـ ئەو چەمکە کە مانای کامڵ هەرگیز وەدەست نایات. مشتومڕ و ململانێی جۆراوجۆر سەبارەت بەم دەقە، وێدەچێ شیکردنەوەیەك بێت لەسەر سریشی ڕاڤە، و پێشاندەری ئەم بابەتەیە کە جۆرەکانی دەق، بە تایبەت دەقی ئەدەبی، بۆیان نییە لەنێو سیستمێکی نەگۆڕی مەعریفەدا ببەسترێنەوە و خاوەن دواین مانا و کامڵ و قەتعی نین.

## خوێندنەوەی وردبین و خوێندنەوەی ڕووبەربین

لە ڕۆمانانەی "دڵی تاریکی"ی جۆزێف کۆنراددا، وەگێڕی نەدیو و نامۆ کە کەسایەتیی مارلۆـمان پێ دەناسێنێ، پێشنیارێك پێشکەش دەکات کە لە ڕاستیدا ستراتیژییەکە بۆ خوێندنەوەی دەقی داستانی مارلۆ، ئەو داستانەی، وەك پێشتریش ئاماژەمان پێکردبوو، گێڕانەوەیەکی پڕپێچوپەنایە. ئەم چیرۆکەش وەکوو چیرۆکی «نەخشی فەرش» مانایەکی بە ڕواڵەت دیاریکراو و تاك و تایبەت بە دەستەوە نادات:

*بەسەرهاتەکانی مەلەوانان بە ئاشکرایی دیارە سادە و ساکارن، چی مانای هەیانە لە نێو توێکڵی گوێزێکی درز تێکەتوودا جێیان دەبێتەوە. بەڵام مارلۆ وەك*



*ئەوانی تر نەبوو (گەر مەیلی ئەو بۆ چێ کردنی چیرۆك وەلا بنێین)، لای ئەو مانای بەسەرهاتێك وەك کاکڵ لە نێویدا نەبوو، بەڵکوو لە دەرەوەی بوو و چیرۆکێکی لە هەناوی خۆیدا هەڵگرتبوو کە ئەو مانایەی، وەك تیشکێك کە دەپرژێتە سەر تەمومژێك و ڕووناکی دەکات، ئاشکرا دەکرد، وەك یەکێك لەم خەرمانە مژگرتوویانەی کە لە ژێر تیشکی مانگ ڕووناك دادێت.*[32]

لێرەدا تێڕوانینی وەگێڕ ـ و لەوانەشە تێڕوانینی کۆنراد خۆی ـ ئەمەیە کە مارلۆ لە ڕێگای ئەم گێڕانەوەوە هەوڵ دەدات پێش گریمانەی خوێنەر بگۆڕێ، پێش گریمانەیەك کە پێی وایە، دەق لە هەناوی خۆیاندا مانایەکیان هەڵگرتووە کە بۆیان هەیە تا ڕادەی ئەو مانایە بەرتەسك ببنەوە، یان ئەوەی لە قووڵاییی هەر دەقێکدا «هەقیقەت»ێك حەشار دراوە کە دەکرێ پەی پێ ببەین و بیدۆزینەوە. هەڵبەت گومانی تێدا نییە کە زۆرتر وا بیر دەکرێتەوە کە زۆربەی دەقە ئەدەبییەکان، دەربڕی مانایەکی سەرەکین و زۆرینەی شێوازەکانی ڕەخنەی ئەدەبیش پەرەیان بەم بیر و بۆچوونە داوە. بۆ نموونە، گەلێ ئەستەمە بکرێ ڕۆمانی پارکی مەنسفیلد بە شێوەی دەقێکی فرەلایەن و کراوە بخوێنینەوە. پێکهاتەی ئەم ڕۆمانە وێدەچێ ئەرك و کارکردێکی ناوەندخوازانەی هەیە، بە چەشنێك کە پەیڕەنگ و بەسەرهاتەکانی داستان و کەسایەتی و زمان لەم ڕۆمانەدا بە مەبەستی چێ کردنی کاکڵێکی بەناوەند کراوی پێکهاتوو لە کۆمەڵێك بەها دەکەونە کار کە رووی لە پێکهاتەیەکە بە ناوی پارکی مەنسفیلد. بەڵام "دڵی تاریکی" خوێنەر هان دەدا بە شێوەیەکی سەربەخۆیانەتر ڕووبەری مانا لەبەر چاو بگرێ، نەك ئەوەی ئەو ڕووبەرە لە چوارچێوەی «کاکڵ»ێکی مانایی ورد و دیاریکراودا ڕێکبخات. ئەم شێوازە جۆراوجۆرانەی خوێندنەوە بۆیان هەیە وەك هۆکارێکی بەهێز کردن و پەرە پێدانی «ئاخاوتن ـ تەوەری»ی گوتار، یان هەوڵێك بۆ جیا بوونەوە لێی، لە قەڵەم بدرێن.

32- Joseph Conrad, op.cit. p.30.

دواجار زمان بەردەوام هەر وا کۆمەڵێك مانای ناوەند تەوەر بەدی دێنیٚ کە پتر لە مەیدانی وزەی موگناتیس دەچن، بەڵام لەوانەیە کۆمەڵێك مانای جێگرەوە (ئەلترناتیڤ) لە جێگەی تێڕوانینێکی تاك و باو دابنیشن کە لە ڕێگای پێش پێگرتن بە ئەرك و کارکردی ئەدەبیات وەکوو ئەزموونێکی ئازادیبەخش، بۆ چۆنێتیی وەگەڕ کەوتنی ئەدەبیات سنوور دابنێن. ڕەنگە هەڵەیەك کە دەیکەین، و زمانیش بەرەو ئەو هەڵەیە پاڵمان پێوەدەنیٚ، ئەوەیە کە لە کاتی پەسند کردنی مۆدێلی «ناوەندخواز» یان «وردبین»ی خوێندنەوەدا، سەرنج بەوە نادەین کە ئەم مانایانە خۆیان نیشانەگەلی زمان یان دەقێکی ترن کە دەشیٚ ماناکەی بدۆزرێتەوە. بەو چەشنەی پرۆفیسۆر موریس زاپ (Morris Zapp)، یەکێك لە کەسایەتییەکانی ڕۆمانی «دنیای چکۆڵە[٣٣]» (١٩٨٤)ی «دەیوید لاج»، دەڵێ: «تێگەیشتن لە پەیامێك، بە مانای ڕەمز کردنەوەی[٣٤] ئەو پەیامەیە. زمان خۆی ڕەمزە... "بەڵام هەر ڕەمز کردنەوەیەك، خۆی ڕەمزدانانێکی[٣٥] ترە".» ئیدیعای دۆزینەوەی مانا لەو دیوی زمان یان لەوپەڕی زمان واتە ئیدیعای هەبوون و خاوەندارێتیی چەشنە مەعریفەتێکی میتافیزیکی، یان بەخشینی ئەو وزە و توانابیانە بە زمان کە ئیدیعای دەسەڵاتدارێتییەکی پتر لە ماهییەت و سریشتی خودی نیشان دەکەن.

## ئەدەبیات و مێژوو

زمانێکی تر کە ئیدیعای «ئامادە بوون»ێکی سەرووی دەقێتیی خۆی دەکات و گەلیٚ جار ماهییەت و سریشتی زمان و دەق بوونی خۆی دەشارێتەوە، نووسراوەی

33- small world
34- decoding
35- encoding



مێژوویی‌یە. گەلیٚ چەشنی جۆراوجۆری نووسراوەی مێژوویی، یان ئەو نووسراوانەی کە لە هەندێك لایەنەوە بە مێژوویی لە قەڵەم دەدرێن، لە ئارادان و من لێرەدا نامەویٚ پۆلێنیان بکەم. بەڵام بەشێکی گەورەی گوتاری مێژوویی ئیدیعای جۆرە «ڕابوردوو بوون»ێك دەکات، ڕابوردوویەك کە بوونی بووە و جیا لەو زمانەیە کە بۆ شەرح و وەسفی بەکار براوە. زۆر جار وا بیر دەکرێتەوە کە زمان، نوێنەرەوەی مێژووە، نەك پێکهێنەری مێژوو. لەم ڕوانگەیەوە، نووسراوەی مێژوویی تا ڕادەیەکی زۆر سەرقاڵی ڕوونکردنەوەی ڕاستی و ئەنگیزە و ڕاڤە و دەسنیشانکردنی فۆرم و شێوەکانی «هەقیقەت»ی مێژوویی دەبێت. نڤیسانێکی لەم چەشنە ڕووی لە ڕابوردوو و ڕەهەندەکانێتی و بۆمان هەیە خوازەی «کاکڵ» (Kernel) بۆ چۆنێتیی کار و ڕاڤەی ئەو شێوە نڤیسانە بەکار بێنین. دەخوازم بە تۆژینەوە لەسەر جۆرەکانی پێوەندیگەلی نێوان ئەدەبیات و مێژوو و ئەو شێوازەی کە ئەم پێوەندییانە گومانیان لیٚ دەکریٚ و سەر لەنویٚ بیریان لیٚ دەکرێتەوە، کۆتایی بەم بەشە بێنم. ئەم تۆژینەوەیە لە سۆنگەی چەند هۆیەکەوە پێوەندی بە باسوخواسەیلی ئێمەوە هەیە. لەم کتێبەدا چەند جارێك بۆ سەر مانا جۆراوجۆرەکانی «مێژوو» گەڕاومەتەوە، بەڵام لە چەمکی مێژوومان، وەکوو ئەو کارەی بۆ ئەدەبیات و ڕەخنەی ئەدەبی کردمان، بە مانای جۆرە مەعریفە یان گوتارێك نەکۆڵیوەتەوە. ئەدەبیات و مێژوو زۆر جار وەك بابەت یان بواری تەواوکەری یەکدی هاتوونەتە ئەژمار و سەرباری ئەوەی کەموزۆر و بە هەندیٚ هۆ، مێژوو بە شتێکی جیاواز لە ئەدەبیات حسێب دەکەن ـ بۆ نموونە، لەو لایەنەوە کە مێژوو باسی «واقیع» دەکات و ئەدەبیات باسی «خەیاڵ» ـ تێگەیشتن و فامی مێژوو گەلیٚ جار بۆ بەدیهێنانی پێش زەمینەیەك بۆ لێکۆڵینەوە لە شوێنەواری ئەدەبی بە کەڵك لە قەڵەم دراوە. هەندیٚ مێژوونووسیش ئەدەبیات بە خاوەن ئەرکێکی مێژوویی دەزانن. لە دیدی ئەوانەوە، لە نێو شوێنەواری ئەدەبیدا دەکریٚ دەقەیلێکی دەستی یەکەم سەبارەت بە ڕووداوە

مێژووییەکان بدۆزینەوە، یان ئەوەی ئەم شوێنەوارانە فەزای مێژوویی ڕووداوەیلی رابوردوو دەخولقێننەوە و لایەنێکی خەیاڵی دەدەن بە مێژوو، کە بە پێی بۆچوونی باو تەنیا سەروکاری لەگەڵ واقیع و بابەتە بەرهەستەکانە. بەڵام لە هەندێ لایەنی دیکەوە، ئەدەبیات و مێژوو وێدەچێ وێکچوونێکی زۆر کەمیان هەبێت. بۆ نموونە، شێوە و چۆنێتیی خوێندنەوە لەم دوو کۆرسەدا گەلێ جیاوازە. لە هەر حاڵێکدا، لە تۆژینەوەی ئەدەبی و ڕەخنەدا کەموزۆر لایەن و ڕەهەندە زمانییەکانی دەق شیدەکرێنەوە، بەڵام خوێندکارانی مێژوو دەق بەم شێوەیە ناخوێننەوە. قەرارداد و داب و دەستووری ئەم دوو کۆرسە تەواو لێك جیاوازن: ئەدەبیات بە دوای خەیاڵ و داستان و تێگەیشتن و هەستەوەری دایە، لە کاتێکدا مێژوو بریتییە لە شەنوکەو کردنی بەرهەستەکی و زانستییانەی ڕووداوەیلی رابوردوو. ڕووداوە مێژووییەکان بەرهەست و شایانی دیتنن، لە کاتێکدا ڕووداوە ئەدەبییەکان دەسکردی هەست و هزر و خەیاڵن.

لە ئاستی تیۆریکدا، تا ئەم دواییانەش، دانوستانێکی کەم لە نێوان ئەدەبیات و مێژوو لە گۆڕێدا بووە. فەلسەفەی مێژوو پتر سەرقاڵی شێوازەکانی ناسینی رابوردوو بووە و تیۆریی ئەدەبی سەرنجی بە جۆرێکی دیاریکراوی نڤیسان یان گوتار داوە. بەو حاڵەشەوە، هایدن وایت، مێژوونووسی ئەمریکایی، قەرارداد و داب و دەستوورەکانی ئەم کۆرسەی پێشێل کردووە و بنەماکانی تیۆریی ئەدەبیی لەسەر «دەقەیلی مێژوونیگارانە[36]» دابەزاندووە و بە کاری هێناون. هایدن وایت وای لێکدەداتەوە کە داستان و مێژوو خاڵی هاوبەشی فراوانیان هەیە و هەر تك فرتوفێڵی گێڕانەوە و سیستمگەلی ریتۆریکی (ڕەوانبێژی) بۆ پێکهێنانی وێنەیەکی کەلامیی «واقیع» بەکار دەبەن: «ئەگەر ڕۆمانەکان و کتێبگەلی مێژوو وەك پێکهاتوویەکی کەلامی لە قەڵەم بدەین، ئەو کات ناکرێ لە یەکیان دابڕین و بە

36- Historiographical text



دوو شتی جیاوازیان بزانین[37].» وایت پێی وایە جیاوازیی نێوان بابەتی ئەدەبی و بابەتی مێژوویی، جیاوازیی نێوان داستان و واقیع نییە، بەڵکوو جیاوازییەکەیان دەگەڕێتەوە سەر تایبەتمەندیگەلی دەقیی جیاواز. کە واتە دەبێ دەقی ئەدەبی و دەقی مێژوونیگارانە وەك دوو فۆرمی نڤیسان لەبەر چاو بگرین، نەك لەبەر ئەوەی یەکیان پێوەندی بە خەیاڵەوە هەیە و ئەویتریان بە واقیع، وەك دوو فۆرمی دژواز چاویان لێ بکەین.

ئەم پێداچوونەوەیە بەسەر چەمکی مێژوودا، بۆ پرسی نێوان دەقێتی یارمەتیبەخشە. «پاشزەمینە»ی مێژوویی، خۆی دەبێتە دەقێك کە دەکرێ بە هاوسەنگی دەقی ئەدەبیی لە قەڵەم بدەین. بەڵام پێویست دەکات بزانین کە چۆنچۆنی ئەو مانایانەی کە لە ڕێگای مێژووەوە بەدی دێن، خۆیان کۆمەڵێك مانای دەسکردن کە خودی ئەمانەش بۆ تێگەیشتن لە ماناکانی تر بە کار دێنین. لە ڕێگای دابەزاندنی تیۆریی ئەدەبی لەسەر نووسراوەی مێژوویی، مێژوو ناشێوێندرێ، بەڵکوو لەم ڕێگایەوە دەتوانین لە چۆنێتیی ئەرك و کاری مێژوو وەك جۆرە مەعریفەیەك تێبگەین. نەبەزاندنی سنوورە نەریتییەکانی یاسا و ڕێساکان کارێکی پاساو هەڵگر نییە: جاران تۆژینەوەی نێوان کۆرسی (interdisciplinary) بە مانای تۆژینەوەی کۆرسێك لە پەنا کۆرسێکی تردا بووە، بەڵام هەنووکە وێدەچێ کە دەکرێ سنووری ئەم جیاکارییە خۆویستانە ببەزێندرێن. لەسەر دەستی تۆژینەوەی "نڤیسان" لەبری بابەتەیلێکی جوداوازی وەك ئەدەبیات و مێژوو و فەلسەفە و کولتووری هەمووانی و هتد، چەمکێکی گشتیتری دەق بەرهەم دێت کە دەرەتانی هەڵسوکەوتی زۆرتر سنووردار و پەرژینکراوی هەر لق و کۆرسێکی تایبەت بەرفراوانتر دەکات. وەك

37- Hyden white, "The fictions of Factual Representation", in Fraser(ed), The literature of fact (New York, Columbia university press, 1976) p.22.)

PDF 4 KURD

پێشتریش ئاماژەم پێکرد، دەکرێ تیۆریی ئەدەبی لەسەر گوتاری دەروونشیکاری دابەزێنین، سەرەڕای ئەوەی بە شێوەی باو دەروونشیکاری لەسەر ئەدەبیات دابەزێندراوە. ئەم کارە دەبێتە هۆی باسکردن لە کۆمەڵێك بابەت کە سنووری تیۆریی ئەدەبی و تۆژینەوەی ئەدەبی دەبەزێنن، بەڵام وا باشە ئەمە بە خاڵێکی بەهێز لە قەڵەم بدەین. ئەگەر تیۆریی ئەدەبی و تیۆرییەکانیتر، بگەن بەو شوێنەی کە پێویستییان بە پێناسەیەکی دووبارە بێت یان وایان لێ بێت ببنە هۆی هەڵوەشانەوەی بوارە سەقامگیرتووەکانی مەعریفە یان شێوازەکانی تێفکرینی پابەندی ئەو مەعریفەیە، ئەو کات دەروازەی ئەگەری گۆڕانکاری و پێشکەوت بە رووماندا دەکرێتەوە. بەکەڵك بوونی ئەم بابەتە پابەندی ئەمەیە کە ئایا تێگەیشتن لە چۆنێتیی بەدیهاتنی کولتووری ئەدەبی و هەڵسەنگاندن لەمەڕ بەها و چاك و خراپی و هەقیقەت بە باش بزانین یان نا. هەروەتر، ئەم پرسە دێتە گۆڕێ کە ئایا دەخوازین مەعریفە لە بازنەی هەندێك کۆرسی تایبەتدا بەند بێت و پەرژین بکرێت، یان مەعریفە سەرقاڵی باسوخواس و تۆژینەوەی کۆمەڵێك بابەتی بەربڵاوتریش سەبارەت بە پێوەندییەکانی بوارەکانی بە رواڵەت جیا لە یەکتریش ببێت.

لە کۆتاییدا ـ و رەنگە ئەمەش خۆی دەسپێکێك بێ ـ دەمەوێ باسی شوبهاندنێك بێنمە گۆڕێ: ئەگەر بوارە جۆراوجۆرەکانی مەعریفە وەك کاکەشانێکی پێکهاتوو لە هەسارە بێنینە بەرچاو، ئەو کات دەتوانین کۆمەڵێك پێوەندی لە نێوانیاندا بەدی بێنین. بە پێی یاسا زانستییەکان، مەیدانەکانی وزە ئەوانی لە جێی خۆیاندا راگرتووە و هەر بۆیە گەڕان و سووڕانیان بە چەشنێکی لێکدانەبڕاو وابەستەی یەکن و پێوەندییان بە یەکەوە هەیە. ناتواندرێ سەرلەبەری ئەم وزە و گەڕانانە دەسنیشان بکرێ، ئەم کارە دژوارتر و ئەستەمتر لەوەیە کە کەسێك یان کۆمەڵگایەك لە دەستی بێت ئەنجامی بدات. بەڵام بۆمان هەیە بنەما سەرەکییەکانی ئەم دیاردانە بناسینەوە، هەر بە هەمان شێوە، دەکرێ کار و ئەرکی



دەقەیل، بابەت یان کۆرسەکان، و جۆرەکانی مەعریفە بە پابەند و وابەستەی یەکتری لە قەڵەم بدەین. ئەدەبیات پاژێکە لە نێو سیستمێکی بەربڵاوتردا کە ئەگەر و ئیمکانی مانەوەی هەندێ شێوە و فۆرمی مەعریفە دەستەبەر دەکات و جۆرەکانی تری مەعریفەش دەستەبەرکەری مانەوەی ئەدەبیاتن. کار و چالاکی لەم چوارچێوەیەدا، لەوانەیە ببێتە هۆی بیچم گرتنی کۆمەڵێك نڤیسان یان گوتاری نوێ.

هەندێ نووسەری هاوچەرخ هەن ناکرێ ناو و نازناوی لە چەشنی رەخنەگر، تیۆریدارێژ، خۆژیاننامەنووس یان داهێنەری دەقیان بەسەردا ببەشینەوە. هێلن سیکسۆ، نووسەری فەرەنسی، یان بێرنارد شارات[٣٨]، نووسەری ئینلگیسی داب و نەریتی هەندێ شێوازی نڤیسانیان پێشێل کردووە تا هەندێ دەقی مشتومڕ هەڵگر بخولقێنن کە تا رادەیەکی زۆر قەرزارباری تێڕوانینە تیۆریکەکانن، بەڵام لەخۆگری چەشنەکانی تری زمانی بوارە جۆراوجۆرەکانی تریشن. ئەگەر یەکێك لە ئەنجامەکانی پەسند کردن و بە کار هێنانی تێڕوانینێکی تیۆریك ئەمەیە کە رێگای ئەوەمان پێدەدات بە شێوەیەکی جیاواز لە ئەدەبیات بڕوانین و ئەم بیرۆکە دڵنیایی بەخشە کە دەڵێ ئەدەبیات خۆی گوتارێکی تاقانە و جیا لە هەموو شتێکە بەو بیرۆکەیە بگۆڕینەوە کە پێی وایە ئەدەبیات پێوەندییەکی، هەر چەند تا رادەیەك نامۆ، بەڵام بێگومان داهێنەرانەی لەگەڵ هەموو چەشنە نڤیسانێکدا هەیە، ئەو کات شکی تێدا نییە خوێنەرانێکی خەسیو و ناچالاك نابین. ■

---

٣٨- وەك نموونەی شوێنەوارێکی داهێنەرانەی لەم چەشنەی ئەم نووسەرانە بڕوانە:

Helen Cixious, "The lough of Medusa" in Elain Marks and Isabelle de courtivron(eds), New French Feminisms (Brighton, Harvester, 1980) p.245-264.

Bernard Sharratt, Reading Relations: structure, of literary production: A Dialectical Text/ Book (Brighton, Harvester, 1082).